رۆمانی

# دواین شاسوار

نووسینی: فرید الأنصاري

وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

چاپی یەکەم: ئەیلول - ٢٠١٥

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٨٩)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە

تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ

Neşe

Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 713 80 00

## پێشکەش بێت...

بەو کەسەی هەمیشە ڕۆحی لەنێوان "ڕیشە شکاوەکە" و "گۆزە شکاوەکە"دا خوێنی لێ دەچۆڕێ و لەگەڵ "دڵە کرۆزاوەکان"دا بە ئازار و مەینەتەوە دەچریکێنێ.

بەو کەسەی هەموو ژیانی بە ئاوارەیی و لە چۆڵەوانیدا بردە سەر و، مرواریی نهێنییەکانی لەسەر "تەپۆڵکە زمرۆتیەکان" دەچنێتەوە..

ئەم چەند پەڕەیە پێشکەشی میراتگری نهێنییەکە: مامۆستا "فەتحوڵڵا گولەن" دەکەم..!

# سوپاس و پێزانین و ئاماژەپێکردن

پێویستە ئاماژە بەوە بدەم، بناغەی ئەم ڕۆمانە -لە ڕووی زانیارییەکانەوە- بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پوختە نایاب و جوانەی کە وەرگێڕی پەیامەکانی نوور مامۆستا ئیحسان قاسم سالحی -خوا بیپارێزێ- لەبارەی ژیانی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسییەوە دایناوە، بە ناونیشانی "پیاوەکە و گەردەلوولەکان". هەروەها لە هەندێك درێژەپێدانندا دەگەڕێتەوە بۆ کتێبە سەرەکییەکە "سەرجەم پەیامەکانی نوور"، بەتایبەت بەرگی نۆهەم کە "مێژووی ژیان"ی نوورسی لەخۆ گرتووە. هەروەها لە کتێبی "پیاوی قەدەر"دا کە دانراوی مامۆستای پایەبەرز ئۆرخان محەممەد عەلییە، هەندێ لەو بەروارانەم چەسپاندووە کە پەیوەندییان بە دەوڵەتی عوسمانییەوە هەیە لەقۆناغی داڕماندا.

لە بنیاتنانی بەشەکانی ئەم ڕۆمانەدا، ئەندازەیەکم هەڵبژاردووە کە لە ڕیزبەندیکردنی ڕووداوەکاندا بە نەخشەسازییەکی واقیعیەوە گرێ بدات. لەگەڵ بیناسازییەکی سریالیدا کە لە کاتی خستنەڕووی بابەتەکاندا پەل بۆ خەیاڵ دەهاوێژێ، چونکە -لە دیدی مندا- ئەوە دەربڕینێکی ئەدەبی شیاوە لە پێشکەش کردنی وێنەی ژیانی پیاوێکی وەکو نوورسی دا، ئەو پیاوەی کە بە ژیانێکی درامی وەها ژیاوە کە زیاتر لە خەیاڵ دەچێت..!

زیاتر لەوە، دەمەوێ سوپاس و پێزانینی خۆم دەربڕم، بەرامبەر بە هەردوو برای بەڕێز "نەوزاد سەواش" و "ئەشرەف ئونن" چونکە یارمەتییان دام و، دەربارەی مێژووی تورکیا و جوگرافیای ئەستەمبوڵ و، شار و لادێکانی تر

که مامۆستا بەدیعوززەمـان تیایاندا ژیـاوە، سـەرەتا گونـدە خنجیلانەکـەی خـۆی -نـوورس- لـە خۆرهەڵاتـی ئەنـادۆڵ -کـە خەڵکـی ئەوێـە- دواجـار هەمـوو ئـەو ناوچانەی تـر کـە بۆی دوورخراوەتـەوە یاخـود تیایانـدا بەندکراوە. چەندیـن نەخشـە و وێنـەی دیکۆمێنتـی و زانیارییـان خسـتە بەردەسـتم.

هەروەهـا سوپاسـی گشـت قوتابییـە بەوەفاکانـی نـوور دەکەم، ئەوانـەی -بەدرێژایی هاوینـی چەنـد سـاڵێك- لـە جوانتریـن و خۆشـترین شـوێنەکانی "ئەسـتەمبووڵ"دا، لـە چادرگـەی "کوربینـر"ەوە بـۆ ئەکادیمیـەی "چاملجـا" میوانداریيـان کـردم، لـەوێ چاومکـەوت بـە جوانتریـن دیمەنەکانـی شـارەکە، لـە -منـارە و گومـەزی، دارستان، دەریا، کەنداوەکان... هتد- ئەمانە هەمـوو دەستێکی باڵایـان هەبوو لە وەبیرهێنانـەوەی یادەوەریـە خەماوییـەکان، داخ و پـەژارەی ئـەو یادەوەرییانـەش بـووە هۆی دارِشتن و چنینـی ئـەم ڕۆمانـە! هەرگیـز باڵـی سـۆز و میهرەبانی باوکانـەی هـەردوو قوتابـی بەدیعوززەمـان نوورسـی، مامۆسـتای گـەورە "مسـتەفا سـونگور" و مامۆسـتای دڵسـۆزو میهرەبـان "فرنجـی ئابـی" لەبیرناکـەم کـە دایانبەسـەرما. هەروەهـا هەرگیـز ئـەو چاودێرییـە تایبـەت و میوانداری و بەخشـندەییە بەلێشـاوەم لەبیرناچێت کـە مامۆسـتا "مسـتەفا ئۆزجـان" وەکـو مەدالیـا کردییـە ملـم.

لـە منـەوە جوانتریـن سـوپاس و پێزانیـن بـۆ هەمـوو ئەمانـە و ئەوانـە پێکـەوە، لـە خـوای بـەرزو بـاڵا و بەتواناشـەوە تەواوتریـن و باشـترین پاداشـت.

فريد الأنصاري/ ئەستەمبووڵ

١٨ی ڕەجەب ١٤٢٧ی کۆچی - ١٢/ ٨/ ٢٠٠٦ زایینی.

# سەرەتای نوور

’’ئەی سەعید "صەعید"بە! واتە: خاك بە، لە خۆنەویستییەکی ڕەها و فەنایەکی تەواودا بە.. بە یەکجارەکی دەست لە خۆیستی خۆت هەڵگرە، بۆ ئەوەی ڕوونیی پەیامەکانی نوور لێڵ نەبێت و کاریگەرییان لە دەروونەکاندا کەم نەکەیتەوە!‘‘

(سەعیدی نوورسی، پاشبەندەکان)

ئەمشەو ئەستەمبووڵ لەپڕ ڕووناکییەك لەدەست دەدا، ئەسپی تاریکییەکان بە سمەکانیان، هەموو گۆڕەپانەکان ڕادەماڵن، شەقام و کوچە و کۆڵانەکان پڕدەکەن.. بەڕێوەبەرایەتی و قوتابخانە و نەخۆشخانەکان داگیر دەکەن، پەیمانگا و مزگەوتەکان دەڕوخێنن! هەموو شتێك لەژێر کاریگەریی وەشاندنی یەك لەدوای یەکەکانی گەردەلولە ترسناکەکاندا هەرەس دێنێ! تاریکاییش پەردەیەکی ڕەش بەسەر شارەکەدا دەدات، تروسکاییەك لە نوور بۆ کەس نابێت..! تارماییە ترسناکەکانیش وەکو پەپو لەتاریکایی شەودا دەخوێنن، هەڕەشەی شەڕ و خراپەیەکی ناهەموار لە هەموو لایەك ڕادەگەیەنن! دڵەکانیش لەپشت دەرگا داخراوەکاندا لەترساندا پەلەپەل ترپ ترپ لێدەدەن! کەس ناوێرێ گەردیلەیەك لە نوور و ڕووناکی دابگیرسێنێ، جگە لە فیکەی شەمشەمەکوێرە و خێوەکان دەنگێکی تر بەرگوێ ناکەوێت..!

هەموو منارەکان بێدەنگ کران، گشت گڵۆپەکان کوژانەوە، کەسێك لەوانەی پێش خۆرئاوابوون سەرزەوییان پڕکردبوو، ئێستا ناتوانێت بەسەر زەویدا بڕوات!

بەدیعوززەمان، ئەو شەوە بە تەنیا لە نێوان شارەکاندا دەگەڕا و مۆمی بەسەر چەوساوەکاندا دابەش دەکرد... ڕۆحی دەکردەوە بەبەر دڵە لاواز و بێ ورەکاندا و، هەلی بۆ دەڕەخساندن تا سەرلەنوێ پشکۆیەك ژیان بەدەستبهێنن...

بەڵكو بتوانن لەم تاریكییە ترسناكەدا ڕێگا دەركەن! هاتوچۆكردن و گەڕانی لەنێوان شارو لادێكاندا زۆر سەیر بوو... وەك بڵێی سواری پشتی تیشك یان بوراق ببوو! بە هەر ڕێگایەكدا دەڕۆیشت یان تەقەی لە هەر دەرگایەك دەدا شوێنەواری نوورێكی تێدا جێ دەهێشت..!

* * *

كەسێكی وابوو، باروودۆخ و حاڵەتێكی نامۆ و، هەڵسوكەوت و ڕەفتارێكی سەیری هەبوو! بە شكڵ و شێوە و وێنە مرۆڤ بوو، بەڵێ، بەڵام... ڕەنگە شەبەنگێك بوو بێت، یان ڕەنگە ڕۆحێك بووبێت..؟ من نازانم..! بە بەژن و باڵای بەرزی بە ناو درەختەكاندا دەڕۆیشت هەتا لەبەرچاو ون دەبوو..! پاشان تارماییەكەی لە شوێنێكی تر دەبینرا!

پێیان وتم: لێرەو لەوێ، لەنێو پێشەڵانی دارستانەكاندا بە تەنیا دادەنیشت... لەنێو دارودرەختە چڕوپڕەكاندا لەگۆشەگیری و تەنیاییەكی ترسناك دا خۆی لەبەرچاو ون دەكرد، تەنیایی و گۆشەگیرییەكی وەها، جگە لەشێتەكان! یان ئەهلی حاڵەتە تایبەتەكان لە توانای كەسی تردا نەبوو! شەو و ڕۆژی بە تەنیا لەگەڵ گیانەوەرە دڕندەكاندا دەژمارد، ڕۆژگارێك جگە لە باڵندە و درەختەكان هاوڕێیەتی كەسی نەدەكرد! بە زمانی باڵندەكان قسەی دەكرد، سروودی ڕەشەبای دەوت! ڕەنگە لە هەندێك لە خەڵوەتەكانیدا گوێی لە خەم و ئازارەكانیان گرتبێت و لە چەند پەڕە كاغەزێكی سەیردا، بە خەتێك، كەم كەس بتوانێت بیخوێنێتەوە، تۆماری كردبن!

وتیان: لە خۆرهەڵاتی توركیاوە، لەگوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەتلیس"ەوە هاتووە. وتیان: لە باوەشی مەرگەوە دەرهاتووە! كاتێك لە چیای

"ئەرارات" شەوێکیان گڕکانێك تەقیەوە، ئەوی فڕێدا و لەناوگڕکانەکەدا هاتە دەرەوە و هەواڵێکی تایبەتی هێنا، بۆئەوەی جارێکی تر لەناو ژیاندا، ئەو هەواڵە بڕوتێنێت، پاشان لە کوێوە هاتووە بە شوێنی خۆیدا بگەڕێتەوە! باشە، ئەوە ئەو نەبوو چەند جارێك کوژرا بەڵام نەمرد؟

ئەوە چ نهێنییەکی ترسناکە گرژیی ڕوخسارە گەنم ڕەنگەکەی حەشاری دەدات؟ یان چ هەواڵێکی سەیر و نامۆیە پرشنگی چاوە هەنگوینییەکانی دایدەپۆشێت؟!

سەیرە!.. ئەگەر نیگای چاوەکانی ببینی کاتێك دەیوەشێنێ و، بە تیشکەکەیان وەکو تیر تاریکییەکان کون دەکات..! دەڵێی هەڵۆیەکە و لەبەرزاییەوە بەسەر فەزاکاندا دەڕوانێت! یان دەڵێی ئەستێرەیەکە و بەتیشکەکەی پەردەی تاریکییەکان کوناودەر دەکات، بۆئەوەی شەیتانەکانی تاریکی ڕەجم بکات!

ژیانی بردەسەر ماڵ و خانوی نەبوو! پیر بوو ژنی نەبوو! پاشان کۆچی دوایی کرد گۆڕی نەبوو!.. کەواتە ئەمە چ کەسێکە؟

پەنجا ساڵی ڕەبەقە ئاژەڵە دڕندەکانی ڕەشەبا، لەنێو دارستانەکاندا دەنەڕێنن! سمی ئەسپەکان لەنێو کۆڵانەکاندا، پریشکی ئاگر فڕێ دەدەن، بەردەوام هەورەکانیش بەسەر چیا بەرزەکاندا دەگرمێنن! خەڵکیش لەنێوان کوژرا و و بریندارەدا، یان ڕزگاریان دەبێت و وەڵامی ڕەشەبای خێرا و ترسناك دەدەنەوە، یان بەسەرگەردانی ملی ڕێ دەگرنەبەر و نازانن پەنا بۆ کێ بەرن؟

کۆڵەکەکانی نوور، لە شەقامەکانی ئەستەمبوولدا بەبێ نوورن... نیو سەدەی ڕەبەقە -بەڕێزەکانم- لە سەرشۆڕییەکی ترسناکدا دەچەمێنەوە. لەژێر باری قورسی جەستەی زانایانی لە سێدارەدراو، یان بەگوللەی کونکراو دەناڵێنن!

کەسێك نییە کفنیان بکاتە بەر، یان تەنانەت گۆڕێك نییە تیایدا بحەوێنەوە! کێ هەیە بتوانێت لەم شەوە ترسناکەدا ڕێ بکات و گوللەی تفەنگی ڕاوچییەکانی تاریکی سەری هەڵنەگرێت؟

ئەو خۆی بە تەنیا سواری ئەسپی مەرگ دەبوو، جڵەوی ڕەشەبای دەگرتە دەست... چرا بچکۆلەکان و پاشماوەی کۆتا ئومێدی لەنێو ئەو چەوساوانەدا دابەش دەکرد، کە لەپشت دەرگا داخراوەکاندا بەسەر خەمەکاندا دانیشتبوون و، لەو ساتەوە ئەم ڕۆژگارە ئیفلیجە هاتووەتە ناو! تاڵاوی چاوەڕوانی دەنۆشن.

دادگای سەربازیی عورفی، هێشتا لەسەر پێیە. بە ناوی ئەحکامی کتوپڕی و نائاساییەوە سمە ئاسنینەکانی دەخاتە ناو خوێنی چەوساوەکانەوە!. کێیە ئەو کەسەی دەتوانێ بێتە گۆ؟ ئا ئەوەتا قەنارەکان، هەرکەسێ بێت بەخەیاڵیدا بڵێ: ربي اللّٰـه..! قەنارەکان لاڵی دەکەن.

بەڵام ئەو خۆی بە تەنیا لەناو گرۆی ترسنۆك و لەرزۆکەکاندا دێتە دەرەوە، ڕێك وەك نووکی شمشێری تیژ، بەهێز وەك سنگی ئەسپی ڕەسەن! پاشان بە توندی مەشخەڵی نوور بە ڕووی هەمووانیدا هەڵدەکات، چاوەکان بە شپرزەیی و ماندوویی دەگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان. پێڵووەکانیش لە گەرما و پرشنگی گڕگرتنەکە تێکدەشکێن! ئایا ئەو گوێ بە مردن نادات؟ یان لە توانای هیچکام لەوانە نییە بگەنە لای. نهێنییە سەیر و سەمەرەکەش هەر ئەمەیە!

ئەگەر کەمێك لە دوای ئەو شەوە چاوت پێی دەکەوت، لەوێ یاخیبوونێکی سەربازی ڕوویدا، بە بەرچاوی دێوەزمەکانی تاریکییەوە دروستکرا، فیتنەیەك بوو بەناوی شەریعەتەوە دژی شەریعەت! یارییەك بوو بۆئەوەی دەیان کەس پەلکێش بکرێن بۆ ژێرپەتی سێدارە، وەکو ڕێ خۆشکردنێك بۆ ڕووداوێکی

ترسناك. ئەگەر چاوت لەو دەبوو كاتێك مەرگی دەگلۆفتاند چ گلۆفتاندنێك و لەگەڵ دێوەزمەكانی "كۆمەڵەی ئیتتیحاد و تەرەقی"دا زۆرانی دەگرت. ئەو ئیتتیحادیانەی كە هەر خۆیان لە كۆتایی سەردەمی عوسمانیدا كاربەدەستی ڕاستەقینەی دەوڵەتی توركی بوون، سوڵتانیش لە بەردەستیاندا هیچ شان و شەوكەتێكی نەبوو! ناو بوو بۆ شتێكی بێ ناو..! بەڵكو تەنیا گەمەیەك یان ڕووكارێك بوو بۆ جوانكاری، هەر بۆ كاتێكی دیاریكراو..! لەو تاریكییەدا... بەدیعوززەمان چووە ژێر جبەی مەرگەوە هەتا بە تەواوەتی دیارنەما! پاشان نوێ بە زیندوویی هاتە دەرەوە! سەیرە..!

لەناو قەفەزی تۆمەتدا ڕاوەستابوو، بەناو پەنجەرەكەدا، بەچاوێك سەیری پانزە لاشەی دەكرد كە لەگۆڕەپانی تەنیشت دادگاكەدا بە داردا هەڵواسرابوون، بە چاوەكەی تری سەیری دەستەی دادگا سەیروسەمەرەكەی دەكرد كە لەناو هۆڵەكەدا لەسەر كورسییەكانیان دانیشتبوون! من بە تەواوەتی نازانم كێ بوو بەسەر زمانی ئەوەوە قسەی دەكرد؟ یان كێ بوو فووی دەكرد بەدەنگەژێكانیدا؟ كاتێك بە گڕ و هێزەوە كەوتە قسەكردن لەگەڵیاندا، بەڕاشكاوییەكی مەترسیدارەوە دەیوت:

"بەڵێ، بەدڵنیاییەوە من داوای شەریعەت دەكەم..!".

بە ترس و سەرسوڕمانەوە هەموو ملیان درێژكردبوو! "داوای شەریعەت دەكەی؟" كەواتە تۆ بەرەنگاری دادگا دەبیتەوە و لە ڕوویدا ڕادەوەستی؟ تۆ دەبێ بمری! ئایا لە زەمانی ئێمەدا جێیەك ماوە بۆ شەریعەت، ئەی مەلا؟ "داوای شەریعەت دەكەی؟" ئەمە دەڵێی، لەكاتێكدا شمشێر زاڵە؟ ئەمە جگە لە شێتی چ واتایەكی تری هەیە؟! بۆ گشت دەستەی دادگا ڕاشكاوییەكی سەیر و

شتێکی کتوپڕ و لە ناکاو بوو..! ئایا ئێستا ئەو شانازی ناکات بەو شتەوە کە پێی تۆمەتبارکراوە؟! چۆن، ئەی دانپیانان گەورەترین بەڵگە نییە؟ داخۆ دوای ئەوە پارێزەر بەچ مەنتیقێك یان بەچ گوتارێك دەدوێ؟ ئەوە کێشەیەکی ترە..! بەڵام ئەو لەوە زیاتر مۆڵەتی نەیارەکانی نەدا و سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە وتارەکەی، یەك لە دواییەك، وەکو چەکوش بدرێ لەسەریان زللەی لێ دەدان، یان وەکو هەورە تریشقە دەیگرماند بەسەر لوتکەی چیاکاندا!

بەڵێ، "من داوای شەریعەت دەکەم! چونکە من هەموو شتێك بە تەرازووی شەریعەت کێشانە دەکەم. تەنها ئیسلام میللەتی منە! من لە ڕوانگەی ئیسلامەوە سەیری هەموو شتێك دەکەم و هەموو شتێك هەڵدەسەنگێنم!

بێگومان من لەسەر لێواری جیهانی بەرزەخدا ڕاوەستاوم... ئەوەی ئێوە پێی دەڵێن بەندینخانە. من لە وێستگەی لەسێدارەدا چاوەڕێی ئەو شەمەندەفەرە دەکەم کە دەمگەیێنێت بە دواڕۆژ، من زۆر بە توندی نارەزایی و بێزاریی خۆم دەردەبڕم و ڕەخنە لەو هەموو ناهەقی و ناپاکی و ستەم و زۆرداریيە دەگرم کە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا ڕوودەدات! بۆیە ڕووی گوفتارم تەنیا ناکەمە ئێوە، بەڵکو ئاراستەی هەموو ئادەمیزادی ئەم سەردەمەی دەکەم... کەواتە بەپێی نهێنی ئایەتی پیرۆزی:

﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴾..! (الطارق: ٩)

**واتە: لە ڕۆژێکدا کە هەرچی نهێنی هەیە ئاشکرا دەکرێ**

ڕاستییەکان لەگۆڕی دڵدا بە ڕووت و قووتی زیندوو بوونەوە! دەسا با ئەو کەسەی بێگانە و نامەحرەمە سەیری نەکات!

لەڕاستیدا من بە هەموو شەوق و تاسە و حەزێکەوە ئامادەم بڕۆم بۆ ئەودنیا..! لەبەر ئەوە دوورخستنەوە و نەفی کردنم بۆ ئەویَ بۆ من بە تۆڵە دانانرێت. بەڵام ئەگەر ئێوە لە تواناتاندا هەیە، ئازارم بدەن و تۆڵەم لیَ بسێنن، فەرموون ئازاری ویژدانم بدەن گەر دەتوانن! بەڵام لەوە کەمتر بەلای منەوە نە سزایە و نە تۆڵەیە! بەڵکو بۆ من شەرەف و شانازی و سەربەرزییە!".

............

سەرلەنویَ تواناکانی کۆدەکاتەوە و، دەستی نزم دەکاتەوە.. پاشان بۆ سەرەوە بەرزی دەکاتەوە، وەك بلێیی لەسەر شێوازی گەمەی باروت، تفەنگەکەی پڕ دەکات لە تفاقی جەنگ، پاشان کۆتا گوللەی دەتەقێنێت، گورزێکی کوشندە لە لوتبەرزی و لەخۆباییبوونی پیاوانی داد ئەسرەوێنیَ! فەزای دادگاکە دەنگ دەداتەوە:

"بێگومان ئەم دەسەڵات و دەوڵەتە لە ڕۆژەکانی ستەم و زۆرداریدا شەڕ و دژایەتی لەگەڵ عەقڵدا دەکرد. بەڵام ئێستا بە گشتی دژایەتی ژیان دەکات! خۆ ئەگەر حکومەت و دەسەڵات لەسەر ئەم مەنتیق و شکڵ و شێوازە بێت، دەسا بژی شێتی! بژی مەرگ! بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران..!".

وشەکان لە گەرووی دەهاتنە دەرەوە، دەتگوت بلێسەی ئاگرە و گڕکانێك دەی هاوێژیَ!... هەرگیز قسەی هەڵبەستراو نەبوون، دەستی ئەندێشە و خەیاڵیش نەیچنیبوون!...

ئەگەر دادوەرەکانت دەبینی چۆن بەهۆی لەخۆبایی بوون و خۆ بەزلزانینییانەوە ڕەگی بناگوێیان ئاوسابوو و، سەرشانی بەرزیان بە نیشانە و هێما و پلە ڕازاندبووەوە. ئەگەر چاوت لێیانەوە دەبوو چۆن وشەکان دەکەوتنە سەر دوانگە

بەرزەکانیان، گەردنی ئەستووریان کەم کەم بۆیان کەچ دەبوو. هەتا وایان لێ هات واتدەزانی باڵندە لەسەر سەریان نیشتووەتەوە!.. زللەکان لەوە بەهێزتربوون کە داواکاری گشتی و تەنانەت دەستەی دادوەری و دەستەی بەرگری پێشبینییان دەکرد!

کەواتە کێ دادگایی کێ دەکات و ئێستا کێ بڕیار دەردەکات و لەسەر کێ بڕیار دەدات؟

دەسا با دادگا بچێت بۆ دۆزەخ..! ئەگەر بڕیاری بێتاوانی بەدیعوززەمان دەرنەکات. ئایا جگە لەوە هیچ شتێکی تری لەدەست دێت؟ کام زمان دەتوانێ تاوانباری بکات؟ ئا ئەوەتا وشەکانی نهێنییان لێ هەڵدەقوڵێ! ئا ئەوەتا نیگای چاو و ڕوانینەکانی تیشك دەدەنەوە!؟.

دەربڕین و دەستەواژەکان پچڕ پچڕ لە دەمی دادوەرەوە دەردەچوون لەوکاتەی کە دانیشتنەکەی هەڵدەگرت... دانیشتنەکە هەڵگیرا بێ ئەوەی حوکم بدرێ بەسەر پیاوێکدا کە خۆی دانی بە تۆمەتەکەیدا ناوە و لەبەرچاوی دەستەی دادگاش شانازی پێوە کردووە، پیاوێك بەڵام نەك وەك پیاوانی تر! ئەگەر وانیە ئەی بۆچی ئەوانە بەپەتی سێدارە هەڵواسراون لەسەر تۆمەتێك کە لە تۆمەت دەچێت، نەك تۆمەتی ڕاستەقینە؟ ئا ئەوەتا لێرە بەدیعوززەمان لەبەردەمیاندا دەنگ هەڵدەبڕێت.. ئەوەی ئەوان بەدوایدا عەوداڵن ڕاشکاوانە دەری دەبڕێت!

پیاوەکە جارێکی تر بە بێ تاوان لە بەندیخانە هاتە دەرەوە، هیچ کەس نەیدەزانی چۆن؟ تەنانەت دادوەریش..! دوای ئەوە بە تەنیایی چوو بۆ پێشەڵانەکان و لەنێو خوێندنی باڵندەکان و فیکەی ڕەشەبا و نەڕەی دڕندەکاندا جارێکی تر نهێنییەکانی کۆدەکردەوە! لێرە و لەوێ لەنێو چیاکاندا دەردەکەوت تا بە تەواوەتی لەبەرچاو ون دەبوو! دەی ئەوە چ پیاوێکە لەم زەمانەدا خراوەتە سەر

ڕووی زەوی و دەستنیشانکراوە بۆئـەوەی ڕێنمایـی خەڵکی بـکات بـۆ لای خـوا؟ ئەمەیـە چیرۆکەکـە... دەسـا بـا لـە سـەرەتاوە دەست بـە گێڕانـەوەی خەمەکانـی بکەیـن!

## چیرۆکێک:

## ڕۆشتن بۆ مەملەکەتی دەرکەوتنی ڕووناکییەکان

دڵم پێی دەوتم ئەو هێشتا لەوێیە... هەرچەندە پێیان وتم ئەو لەساڵی ۱۹٦۰ی زایینییەوە کۆچی دوایی کردووە.. چۆن؟ چۆن دەبێ کۆچی دوایی کردبێ -ئەی بەڕێزان- من خەریکە بۆنی ئەو دەکەم ئەگەر بەدرۆم نەخەنەوە..! بەڵێ، هەموو کتێبەکان یەکڕان لەسەر مێژووی کۆچکردنەکەی. بڕوام پێ بکەن، ڕاستتان پێ دەڵێم: لەگەڵ هیچ کەسێکدا ئەوەندە ڕاستم نەوتووە..! لەبەر ئەوە بڕیارمدا چاوم پێی بکەوێت؟ بۆیە نییەتی ڕۆیشتنم هێنا، جانتا بچکۆلەکەم هەڵگرت و، بەرەو شای شاران و کۆتا پایتەختی ئیسلام (ئەستەمبووڵ)! کەوتمە ڕێ. بەڵام پێیان وتم: دەبێ ڕابەر و چاوساغێکت لەگەڵدا بێت، ڕابەری ئەستەمبووڵ وەك هیچ ڕابەرێکی تر نییە! دەبێ هیممەت بەرز و بیرتیژ و بەرچاو ڕوون بێت، ئەگینا نە وەردەگیرێیت و نە دەگەیتە جێ! بەڕێزان: بەردەوام ڕۆژگارێك بە دوای ئەو چاوساغەدا گەڕام... ڕۆژگارێك ناتوانم بە پێوەرێك ئەندازەکەی دیاری بکەم، هەتا لە بەهارێکدا لە شاری "دارلبەیزا" لە هۆڵی یەکێك لە ئۆتێلەکان ڕێم تێیکەوت، سەیری تەزبیحە بچووکەکانی دەکرد و بە پەنجەکانی دەیژماردن و تەسبیحاتی پێ دەکردن و نوورەکانی هەڵدەگۆزی..! وتم: سوێند بەخوا ئەمە نیشانەیەکە! نەك وەك هیچ نیشانەیەکی تر! ئەمەیە چاوساغ و ڕابەر!

لە پیرییەوە نزیکتر بووە، بە سۆز و خۆشەویستییەوە لێی نزیك کەوتمەوە، پاشان کێشە و چیرۆکی خۆمم تێگەیاند، پرسیاری هامڕایی و برادەریم لێکرد بۆ وڵاتی نوور، بە مەرجێك ئەو چاوساغ و ڕابەری من بێت و منیش شوێنکەوتەی ئەو. هەرکە لە مەبەستەکەم تێگەیشت خۆی لێ گێل کردم، وەك بڵێی نامناسێ! لە هەموو هێز و توانا و هەوڵێك خۆی دارنی! لە بێ هیواکردنێکی کوشندەدا پێی وتم: لای من هیچ شتێکت دەست ناکەوێت!

ئەوە کۆستێك بوو بۆ من... بەڵام لە دەروونی خۆمدا پێداگریم کرد، هەرچەندە ڕۆژگارێکی زۆری بەسەردا بچێت هەر دەبێ ئەستەمبووڵ ببینم!

ئاخۆ کێ لە ئێوە -بەڕێزانم- ئەستەمبووڵی بینیوە؟ ببوورن..! بەڵکو کێ لە ئێوە چووەتە ئەستەمبووڵ و چاوی پێ کەوتووە؟ کێ لە ئێوە شەیدای شەو و ڕۆژی ئەستەمبووڵ بووە؟ کێ لە ئێوە تامی واتای ئەستەمبووڵی چەشتووە؟ کێ لە ئێوە بە شەوە درەوشاوەکاندا جوانیی ئەستەمبووڵی بینیوە و پەیکی خەمەکانی نۆش کردووە، کاتێك لە قەراغ بۆسفۆردا دەگێڕدرێن، کێ لە ئێوە بە مشت لە جوانیی دارستانەکانی هەڵگۆزیوە، لەو کاتەدا کە بەدەوری گومەز و منارەکاندا سەما دەکەن، کاتێك شێ کۆتی خۆر نەرم دەکات، بە هەڵهاتنی بەسەر گردی "یوشەع" یان تەپۆڵکەی "چامڵجا"دا و، پاشان ئاوابوونی لە دەریاچەی مەزن یان دەریای مەڕمەڕەدا؟ پاشان کێ لە ئێوە بە چێژ و خۆشی بانگ خرۆشاوە و جەزبە گرتوویەتی، کاتێك بە ئاهـ و ناڵەوە لە منارەی مزگەوتی "بایەزید"ەوە یان "سولەیمانیە"وە، یان "ئەبو ئەیوبی ئەنساری"یەوە دەردەچێت؟ یان کام لە ئێوە بە خشوع و ملکەچییەوە سوجدەی بردووە و ئەو شەپۆلەی هەڵدەکا بەسەر مزگەوتی "سوڵتان ئەحمەد"دا ڕایماڵیوە؟ یان گومەزە

دێرینەکەی مزگەوتی "ئەیاسۆفیا" ڕفاندوویەتی؟! لەبەر ئەوە سەرگەردان لە چۆڵەوانیدا ملی ڕێی گرتبێتە بەر و ویرد و سروودی شێتی وتبێت! کەواتە، ئەوکەسە دەرك بە واتای ئەم چیرۆکەی من دەکات، ئەگینا من ناتوانم شتێك ڕابگەیێنم نەتوانرێ دەرکی پێ بکرێت، مەگەر لە ڕێی خۆشەویستی و شەوق و تاسەیەکی دێرینەوە بێت!

پاشان -ئەی بەڕێزانم- دوای یەك ساڵ گەڕامەوە بۆ لای! لە خۆرئاوای دوور لە پلەو پایەیەکی تردا بینیم... لە هۆڵی "بانگی ئاشتی" لە شاری "وەجدە"، پەیامەکانی نووری دابەش دەکرد. وتم: هاوڕێیەتیم بکە گەورەم! وتی: ئایا لە ڕاستی دا شەوق و تاسەی ڕۆیشتنت هەیە؟ وتم: بەڵێ! وتی: زۆر؟ وتم: نەك وەك شەوق و تاسەی قەیسی کوڕی ملەووەح یان عەروەی کوڕی حەزام! وتی: ئەگەر لە ڕاستدا وەهایت فەرموو وەرە، ئەگینا ئەوا:

دعِ المكارمَ لا ترحلْ لبُغيَتِها واقعدْ فإنَّك أنتَ الطَّاعمُ الكاسي

**واتە: واز لەگەورەیی و ڕێز و پلە و پایە بێنە، مەچۆ بە دوایدا، لە ماڵی خۆتدا دابنیشە، چونکە تۆ نانەخۆر و کۆنەپۆشی خەڵکیت.**

کوڕی خۆم، مەرجی من بۆ تۆ ئەوەیە من تەنیا خاوەنی یەك ڕێگام، هەتا کاتێکیش دەگەیتە شاری نوور و ڕووناکییەکان، بۆ خۆت ئازادیت لەگەڵ ئەو هاوڕێیەی دەتەوێ... بەپێی ڕادەی ڕاستگۆیت نوور و ڕووناکییەکانت لێ دەردەکەوێت! کوڕی خۆم تاقیکردنەوە سەختەکەی تۆ ئەوەیە... دەسا خۆت بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکە!

* * *

لە کەنار دەریای مەڕمەڕەدا خۆر هەڵدێت و بەسەر لێوارەکانیدا ئاوا دەبێت! ئایا لەدوای ئەوە هیچ خۆرێك ماوە بۆ جیهان؟ "کور بیز" یان (کانیاوی بەخوڕ) ناوێکە بۆ ناولێنراوێك... دەریای مەڕمەڕە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا درێژدەبێتەوە، ماسییەکانی دەریاکە خۆیان بە تەنیا پێستە ئاڵتونییەکەیان بێ کەموکورتی بە هۆنراوەی خۆر دەنەخشێنن، باسی گەشتەکەیان قۆناغ بە قۆناغ لە خۆرهەڵاتی دەریاکەوە بۆ خۆرئاوای دەگێڕنەوە، لەسەر پێستە جوانەکەیان ڕەنگی هەریەکە لە قۆناغەکان دەمێنێتەوە، لەپڕ دەبنە چەندین ڕەنگ، بەڵام نەك وەك ڕەنگەکانی شەبەنگ! دەسا وێنەگرەکەت بشکێنە ئەی هاوڕێ! لەگەڵ مندا زەماوەندی ڕەنگەکان ببینە، کە ژیانی لێ هەڵدەقوڵێ..! پەلکە و ئەگریجەی شەپۆلە خەواڵووەکان ببینە، ڕەوی ماسییە گەشتیارەکان ببینە، ڕەنگە درەوشاوە و حاڵەتەکان هەموو ساتێك دەگۆڕێن و بۆ هەموو مەقامێك دەڕازێنەوە! لە جیهانی شێوەکاری و جوانکاریدا بەردەوام جوانی و داهێنانکارییە هەتا هەتاییەکەیان دوایین هاوارەکانیان کوناودەر دەکەن! مەڕمەڕە دەریایەکە بەبێ شەپۆل، تەنها هاژەهاژێکە کە لە خوێندن و باڵەفڕەکەی باڵندەکان و جریوە جریوی چۆلەکەکان دەچێت... دەریایەکە ئارامییەکەی هەل دەڕەخسێنێ بۆ ئەوینداران، هەتا بە چپەیەکی بێگەرد موناجاتی خۆشەویستی بخوێننەوە!

لەوێ قوتابخانەی نوور، بە ئەسپایی درەختە سەوز و گەشاوەکانی چەکەرە دەکەن و دەڕوێن و گەورە دەبن، بۆئەوەی لە پەنهانیدا پاسەوانی دەرگاکانی بکەن و، لەگەڵ پەنجەرە فراوانەکانیدا بەبێ دەنگ دەست لەملان بکەن. پاشان جۆگەلەی خاوێن و بێگەرد و بریسکاوەی وانەکان لە خەڵوەتێکی تەواو تایبەتدا دوور لە چاوەکانی ئەم ڕۆژگارە ترسناك و مەترسیدارە هەڵدەقوڵێن... قوتابخانەیەك سەری خستووەتە سەر سەرینی دەریاکە، بۆئەوەی لە دوورەوە

چاودێریی ژیانیی ئەستەمبووڵ بکات... لەوێ چەند مامۆستا و فێرکارێك بە خشوع و ملکەچییەکی سەیر و سەمەرەوە ڕاوەستاون، چەند مامۆستایەك کارەکانیان جێی سەرسوڕمانە! لەبارەی قەڵاچۆکردن و نەهێشتنی نەخوێندەوارییەوە وانە دەڵێنەوە، بەڵام بە فێرکردنی مەنتیقی تەیر! یەکەمین زمانی ئادەم!.

لە یەکێکیان نزیك کەوتمەوە، پیرەپیاوێك بوو لەحەفتاکانی تەمەنیدا، زەردەخەنە سەرلێوەکانی جێی نەدەهێشت، لە بەرائەت و پاکی و چالاکی و جموجوڵیدا لە منداڵێکی ساوا دەچوو، پێیان وتم: ئەوە قوتابی بەدیعوززەمانە، پیاوێکی تورکە، باوکی خاوەنی فڕنێك بوو، هەر لە منداڵییەوە کوڕەکەی لەو فڕنەدا ئیشی لەگەڵ کردووە، مامۆستا نوورسی ڕۆژگارێك لە ماڵی ئەوان و لەگەڵیاندا ژیانی بردووەتە سەر، دەوڵەتیش لەو کاتەدا دەکەوتە شوێنی و چاودێری هەنگاوەکانی دەکرد! جگە لە کەسێکی هەڵەشەی شێتکار کێ دەیوێرا لە ماڵی خۆیدا حەشاری بدات و بیشارێتەوە؟! هەموو ئەندامانی خانەوادەکە چوونە دەرەوە تا لە بینای فڕنەکەدا نیشتەجێ ببن، ماڵەکەی خۆیان بەجێهێشت بۆئەوەی مامۆستا بە تەنیا و بە سەربەستی تیایدا بمێنێتەوە! هەتا جارێکیان قوتابییەکە گەڕایەوە ماڵەکە، هیچ شوێنەوارێکی مامۆستای نەبینی! سەرلەنوێ مەتەڵەکە دەستی پێکردەوە!

لێی نزیك کەوتمەوە بە ئومێدی ئەوەی لە لای ئەو بەڵگەیەکم دەست بکەوێ بەهۆیەوە بزانم بەرەو کوێ چووە، یان هەر هۆکارێکی ترم دەست بکەوێت و بەشوێنیدا بڕۆم...

- ببوورە گەورەم: ئایا دەتوانم بزانم شوێنی بەدیعوززەمان لەکوێیە؟

کەمێك سەرسام بوو، پاشان پێکەنی، هەتا ددانەکانی دەرکەوتن و وتی:

بەدیعوززەمـان کۆچـی دوایـی کـردووە! هۆشـم هاتـەوە بەخۆمـدا و لەبەرخۆمـەوە وتم:
تۆیـش هـەروا دەڵێـیت، کۆچـی دوایـی کـردووە؟!

هاوڕێکـەم ئاماژەی کـرد بـۆ پیاوێکـی تـر، زۆر دوور نەبـوو لەسـەر قەنەفەیـەك دانیشـتبوو... ڕەنگـە بەتەمـەن لـە یەکـەم گەورەتـر بێـت، قوتابیـان لـە گشـت تەمەنەکان دەوریـان لێدابوو، لـە بیسـت سـاڵ کەمتر، تا حەفتا سـاڵ بـەرەو ژوورتر! سەیرە! هەروەها ئەویش قوتابی مامۆستا بوو، ڕەنگە ئێستا لـە تەمەنی هەشتا ساڵیدا بێـت یـان زیاتـر... چەند وتەیەکی پچڕ پچڕی لـە دەم دەردەچـوو لێیـان تـێ نەدەگەیشـتم... ڕەنگـە لـە وتـاری پەپوسـولەیمانە، یـان کۆتـری تەقلەبـازەوە وەرگێڕرابـن؟.. نەمدەزانـی..! لەنـاو ئەڵقـەی وانەکەیـدا لـە نزیـك خۆیـدا شـوێنێکم دۆزییـەوە و زۆر بـە نەرمونیانییـەوە لێـم پرسـی:

من لەکوێ بەدیعوززەمان بدۆزمەوە؟

بەجۆرێـك پیاوەکـە ڕاچڵـەکا و تۆقاندمـی..! پاشـان ماوەیەکـی زۆر سـەری داخسـت و بێدەنـگ بـوو..! هەمـووان بەجارێـك سـەیریان کـردم، تـا ئـەو ڕادەیـەی لـە گیانـی خـۆم ترسـام!

پاشـان سـەری بەرزکردەوە و بەسـۆز و میهرەبانییەوە سـەیری دەکردم و، لەسـەرخۆ پرسیاری لێکردم:

- لـە کام وڵاتـەوە هاتـووی ئـەی ڕوخسـاری غـەریـب؟ و چیـت لـە بەدیعوززەمـان دەوێ؟

- لە وڵاتی مەغریبەوە هاتووم... بەدوای حیکمەتی نووردا عەودالْم!

ڕوومەتـی گەشـایەوە.. پاشـان وتـی: بەڵـێ، هیـچ مەغریبێـك نەبـووە بەبـێ

مەشریق... کوڕی خۆم وەرە پێشەوە! قۆناغێکی تر لێی نزیك بوومەوە.. پاشان وتی: ئەگەر لەوێ لای خۆتان بەدوایدا بگەڕایتایە دەتدۆزیەوە! بەڵام قەیناکا.. دەبێ لە مەقامێکی باڵاتردا سەفەر بکرێت..

دڵم خۆش بوو! ئایا هەر بەڕاستی دەتوانم بیدۆزمەوە؟ ئەم وشانە دەرگای ئومێدیان لێکردمەوە... پێی وتم: کوڕی خۆم، لەو کاتەوە گۆڕەکەی خۆی بەجێ هێشتووە ناتوانین بەدڵنیاییەوە شوێنەکەی دەستنیشان بکەین! بەڵام ئەمە پەیامی منە و هەڵمگرتووە بۆ تۆ: لەکوێ خۆر هەمیشە هەڵدێت، بەشوێن کانیاوەکاندا بڕۆ! لە کوێ هەتا هەتایە شەو ئارام دەگرێت، لە شەوانی مانگی چواردە وەرە دەرەوە!

وتم: زیاترم پێ بڵێ!

وتی: من هەر ئەوەند دەزانم! ئەگەر زیاتر بڵێم، ئەچمە ڕیزی ئەوانەی کە ڕاست ناکەن!

ئەوە پەیامی ئەو بوو.. زیاتر لە بروسکەی بەجفرەکراو دەچوو! بەدەم ئەو قسانەوە هەستام، خەریك بوو لە هیچیان تێنەگەم..! بەڵام دوای ئەوە بڕیارمدا وشە بە وشە پەیامەکەی شی بکەمەوە! بەڵکو بەو هۆیەوە ڕێم لە شتێك بکەوێت..

ئایا دەبێ جارێکیتر سەفەر بکەم؟ بۆ ناوخۆی تورکیا یان بۆ دەرەوەی؟ و بۆ کوێ؟ کێشەکە ئەوەبوو!

ئەو شەوە هەوڵمدا بخەوم بەڵام بێسوود بوو..! لە پەنجەرەکەوە سەرنجی لق و پۆپی درەختەکانی ناو باخچەکەم دەدا، کە لە شێوەی ڕکوع و سوجدەدا بە

خشوعەوە بەرەو زەوی شۆڕ ببوونەوە.. خێرا نوێژم هاتەوە یاد و هەڵسامەوە.. بە ئاوێکی سارد دەستنوێژم هەڵگرت و بە تەنیا ڕێی سەفەرم گرتەبەر..!

# مەقامەکانی شێتی

بەشی یەکەمی شەو مەقامەکەی بەرز بوو.. لە دوورەوە خوڕەی ئاوم دەبیست، شتێکیش کە لە دەنگی بۆقەکان دەچوو.. بە شێنەیی لەنێو درەختەکاندا هەنگاوم دەنا، هەتا لە پێشەلانێکی گەورە نزیك بوومەوە، وەکو خەیمە لە بەرزاییەوە شۆڕ بووبووەوە.. لەبەرئەوەی ڕووناکی مانگی بەسەردا دەدرەوشایەوە، لێرەولەوێ شەپۆلی ڕەنگە سەوزەکان دەکرانەوە وەك ئەوەی بە ئاڵتوونی زەرد ڕووپۆش کرابن، دواتر هەرکاتێکیش دوور لە تیشکی نوور دەچوونەوە بە ناو خۆیاندا، وەك ڕەشایی قەلە ڕەشەکان دادەخران.. وام دەزانی دەنگی زیکر و تەسبیحات دەبیستم..! کەژێکی پڕ لە دارستانم هاتە پێش چاو، لە بەردەممدا قیت ڕاوەستابوو، بە درەختی ئورز و چنار و قەتران داپۆشرابوو.. هەوراز و بەرەوژوورکەیەکی سەخت بوو، بە زەحمەت سەرکەوتم، وام دەزانی بەدرەختدا هەڵدەگەڕێم، کاتێکیش چوومە سەر کێوەکە، لە خۆشیدا "اللّٰه أکبر"م کرد.. ئای لەو هەستە! ئەوە دیمەنی گوندی "بارلا"یە، ئەو گوندەی بەدیعوززەمانی بۆ نەفی کرا! یان لە بارلا دەچوو! دەریاچەکە لە دامێنی دارستانەکەدا بە ئەوپەڕی بەخشندەییەوە ڕووناکی و نووری مانگی دەدایەوە، نوورەکان بە لێشاو دەڕژان بەسەر هەموو شتێکدا.. بەسەر درەختە چڕوپڕەکاندا، بەسەر دەوەن و گژوگیای کێوەکاندا.. ئا ئەوەتا درەختە بەناوبانگەکە بە پەلوپۆ و لقە

ڕوتەڵەکانیەوە ڕاوەستاوە.. بە تەواوەتی لە سەردەمی بەدیعوززەماندا چۆن بووە هەروا ماوە، بەڵام ئایا ئەی نەیان بڕیەوە؟ بەڵێ، بەڵام هەر خودی خۆیەتی لە شوێنی خۆیدا ماوە و دیارە.. کەمێك بەرەو لای چوومە پێشەوە کەسم نەبینی بەسەریەوە! لە خۆمم پرسی و لەبەر خۆمەوە وتم: باشە ئەم پیاوە چۆن توانیویەتی خۆی بە تەنیا لەم شوێنەدا بمێنێتەوە؟

بەڕێزان، وەڵامەکە زۆر خێرا و ترسناك بوو!.. سەیرە! بێگومان درەختەکە ڕاپەڕی بە ڕاپەڕینێکی مەزن..! وەك بڵێی زریان و گەردەلوولێکی بەهێزی لێ بدات، لقە بەرزەکانی بە لای ڕاست و بە لای چەپدا بە خێراییەکی ترسناك ڕادەماڵران. پاشان هێزی گەردەلوولەکە زیاتر و زیاتر دەبوو، هەتا شتێکی وای پێوە نەما من بە چاو بیبینم! وەك بڵێی بوو بە هەڵم و چوو بە هەوادا..! ئەوەندە ترس و لەرز زۆری بۆ هێنام، هەتا قاچەکانم توانایان نەما هەڵمبگرن، هێز و وزەم لێ بڕا! بەڵام بۆ کوێ ڕابکەم؟.. تەنها چەند ساتێکی کەمی پێچوو هەتا درەختەکە کەم کەم هێور بووەوە و لە کۆتاییدا ئارامی گرت... ڕووداوێکی لەناکاو و کتوپڕی مەزن بوو! لەڕاستیدا بینیم لەنێو لقەکاندا چوار مەشقی دانیشتووە و، بێ ئەوەی ڕوویکاتە من لەسەرخۆ پەیامەکانی نووری دەخوێندەوە..! لە ڕادەبەدەر ترسم لێ نیشت، بەڵام هەر کە "وتەکان" بە هێواشی بەسەر گوێمدا دەڕژان ، لە ڕێی دەنگە خۆش و بەسۆزەکەیەوە دەپەڕینەوە بۆ ناو دڵە نائارامەکەم، هەتا ترسم بەسەردەوە نەما و ئارامی باڵی کێشا بەسەرمدا، ڕەحمەت و بەزەیی داپۆشیم و ڕۆحم ئاسوودەبوو، ئەندامەکانی جەستەم هێور بوونەوە.. وەك بارانی ڕەحمەت و میهرەبانی حیکمەت لە دەمی دەباری.

پێی وتم:

- ئەوەیە قەدەری من کوڕی خۆم..! ئەوەی ڕاستی بێت بە تەنیا پێگەیشتم و بەتەنیاش ژیام و بە تەنیاش مردم.. بەڵکو لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە تەنیا زیندوو بکرێمەوە! هەموو ئەمانەش لەپێناوی ئەوەدابوو نەفسم لە دونیادا بەشی نەبێت... و لەم گۆشەگیریەمدا بۆ هەموو ئادەمیزاد بم نەك بۆ خۆم! چونکە ئەم زەمەنە زەمەنی لێك ترازان و جیابوونەوە و لە هەمان کاتدا زەمەنی گەیاندن و بەیەکگەیشتنە، حیکمەتێکی یەکجار ڕوون و ئاشکرایە، هەر کەس نەیپێکێ و لێی تێك بچێت، دەکەوێتە ناو زۆنگاوی هەوا و ئارەزووەکانەوە، ئیتر دوای ئەوە لە کوێ ببێت بە یەکێ لە ڕێبینان؟

دەسا کوڕی خۆم فێربە..!

.............

خانەوادەکەم، لەسوننەی ئال و بەیتە، هەروەك حاڵی ئالوبەیت بەدرێژایی مێژوو هەروا بووە.. یەك لە دوای یەك هەموویانم لەدەستدا! تەنیا کەمێکی کەمیان نەبێت...! لە تەمەنی نۆ ساڵیدا دایکم لەدەست چوو، سێ براشم لە تەمەنی پانزە ساڵیدا لەدەستدا، پەنجا ساڵی ڕەبەقە دوو برام لەدەست داو، لە خانەوادەکەمدا جگە لە تەنیا برایەك کەسم نەماوە..! هەر هەموویان ڕۆژگارێکی دوور و درێژە بۆ جیهانی بەرزەخ پێشم کەوتوون!

ئەگەر ئەو هەتیوی و بێنازییە پێش وەختە نەبوایە، کە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوم، پەیامەکانی نوور لە ژیانمدا هیچ شوێنەوار و کاریگەرییەکیان نەدەبوو..! با واز لەمە بهێنین و بچین بۆ ئەو شتەی کە لەوە گرنگترە!

لەو کاتەوە، دەستی کردبوو بە قسەکردن، ئەمە یەکەم جار بوو ڕووم تێ بکات. دیمەنێکی بە سام بوو.. زیاتر لە سەرکردەیەکی سەربازی

دەچوو خۆی ئامادەبکات بۆئەوەی فەرمانی ڕۆژانە بەسەر سەربازەکانیدا بخوێنێتەوە، بە لێبڕانێکی بەرز و ئامادەباشییەکی تەواو بۆ کەوتنەڕێ پێی وتم:

مەگەر تۆ ئامادەیت بۆ ڕۆیشتن لەگەڵم؟!

کەمێك دوودڵی ڕووی تێکردم.. لەپڕ وێنەکە بەسەر دارچنارەکەوە بەرزبووەوە و لە هەوادا بوو بە هەڵم.. ئیتر لەدوای ئەوە شوێنەواری هیچ شتێکم لەبەرچاودا نەما.. تەنانەت تروسکەیەك نووریش!

بە تەنها لە چاڵی دوودڵیدا مامەوە و بۆ بێ بەختی خۆم دەستم کرد بە گریان..!

* * *

بۆسفۆر سروودی بڕگەی دووەمی شەوی دەچڕی.. ئەوەش لە دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە ساڵێك بەسەر درەوشانەوەکانی یەکەم چاوپێکەوتن و بینین.. منیش لەناو ئامێزی بەرزی کەناراوەکانیدا چاودێریی ڕووناکیی ماڵە خەواڵووەکانیم دەکرد.. لە قوتابخانەی "بەیلەربەگی"یەوە دەمڕوانی، هیچ شتێك لەوە جوانتر نییە لە دەوروبەری ڕۆخەکەیەوە سەیری دیمەنی شەوی ئەستەمبووڵ بکەیت..! لەوێ ماسییەکان لە تەنیشت خێزانە خەوتوو و بەئاگاکاندا دەکەونە سەر ئاو.. لە دوا قۆناغەکانی شەودا لەگەڵ درەوشانەوەی ئاوی کش و مات و بێدەنگدا، کرنووشبەرانیش ملکەچ دەبن!

بۆسفۆر گەورەی کەنداوەکانە بێ ڕکابەر... لە ڕۆژدا فەرمانڕەوایە و، لە شەویشدا فریشتە! من لە نووری ئاوەکەیم دەخواردەوە کاتێك جوانیی مانگی

دەدايەوە.. وێنەی کەناراوە پڕ لە چراکانی لە قولاّییەکەیدا ئامادەبوون، بە بێ دەنگی خەمەکانی مێژوویان دەگێڕایەوە..!

بەلەمێك بەرەو ڕووم هات و هێدی هێدی لێم نزیك بووەوە.. ڕووناکییەکی کزی لێوە دەرکەوت و بەرەو سەرەوە کشا، لەسەر شێوەی سەوڵلێدانی هێواش شەپۆلی دەدا.. زۆر گوێم پێ نەدا، بۆ ساتگەلێك لە تامی جوانیی شەودا ڕۆچووم... هەتا کتوپڕ نوورێکی پرشنگدارم بەرکەوت، خەریك بوو بیناییم لێ بسێنێ..! وامدەزانی بەلەمە بچکۆلەکە بوو، تەقیەوە..! نەمدەتوانی چاوەکانم بکەمەوە، بە توندی چاوەکانم داخست، لەپڕ وێنەکە بە ڕوونترین شێوە دەرکەوت.. لەڕاستیدا ئەو لەوێ بوو..! ئا ئەوەتا جارێکی تر بەجۆرێك لەسەرزەنشتی توند سەیرم دەکات.. پێی وتم:

بۆچی قوتابخانەکەت بەجێهێشت؟ ئەی نەتزانیوە قوتابیی نوور گەر دابڕا لە هەموو شتێك دادەبڕێ؟

شەرمەزار بووم، نەمدەزانی چی بڵێم و بە چی وەڵامی بدەمەوە..! لە دڵی خۆمدا وتم: من بەجێم نەهێشتووە! بەڵام وشەکان لەسەر زمانم دواییان بڕا و نەهاتمە گۆ! نەمدەزانی شێخ چی دەوێ؟ ژیری خوازیاری پاساو هێنانەوە بوو، بە زمانێکی لاڵە پەتێ پرسیارم کرد:

- گەورەم، ئەی سەرەتا چۆن بوو؟

سەیری ئاسۆی کرد، کە بە ڕووناکیی مانگ نەخشابوو، ئەوجا وتی:

کارەکە بە دەستی من نەبوو.. بەڵکو شتێك بوو پێش ئەوەی من ببم بۆم ئامادە کرابوو.. کاروباری ژیانم هەموو بێ ویست و ئیختیاری خۆم بەڕێوە

دەچوو.. کوڕی خۆم، قوتابیی نوور -لەڕاستیدا- بۆی نییە ئیختیاری هەبێت.. لە ماڵەکەماندا میعراجێکم بینی و خێرا پیایدا سەرکەوتم، ئیدی ئەمە هەموو ئەو شتانە بوون کە دواتر بوون. ئەمە چیرۆکەکەیە بە کورتی: ئەوە لە دەوروبەری تەمەنی نۆ سالیمدا بوو.. ئەو ساڵەی تیایدا دایکم ژیانی منی بەجێهێشت و بە ئەمانەت لەبەر دەرگای خوادا دانام و وازی لێهێنام.. هەموو کەسوکار و خزمەکانی مەنسوبی تەریقەتی نەقشبەندی بوون، باوکم، براکانم هەر هەموویان.. بەڵام من لە دەروونمدا حەزێکی ڕامالەر هەبوو، زۆر بە توندی بەرەو زیکر و ئەورادەکانی "شێخ عەبدولقادری گەیلانی" ڕایدەکێشام... ئەوەش ڕازێك بوو لە دڵمەوە هەڵدەقولا.. ئەوەدەم ناوەڕۆك و ڕاستییەکەیم نەدەزانی.. ئایا گەیلانی دروستکەری ئەوە -جیل-ی سەلاحەددینی ئەیوبی نەبوو؟ یان نوێکەرەوەی عەزیمەت و هیممەتی ئوممەت نەبوو لە زەمەنی سەرشۆڕی و بێچارەییدا؟ تەریقەتەکەی لەسەر بناغەی زانست و قورئان دامەزرابوو.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من نەمدەتوانی خۆم تەرخان بکەم بۆ خزمەتی تەریقەت، چونکە حەز و تاسەی سەرقاڵی و گەڕان بەدوای زانستدا لە دڵمدا بەهێزتر بوو...

کوڕی خۆم، سوێندت بۆ دەخۆم: جێگیرترین و کاریگەرترین وانە لە ژیانمدا وەرمگرتبێت، ئەو وانانە بوو کە لە دایکمەوە فێری بووم، ئەگەرچی ماوەیەکی کەمیش لەگەڵمدا بوو..! هەموو وتەکانم لە نووری وتەکانی ئەوەوە سەرچاوەیان گرتبوو. مەشرەبی سەرەتا و کۆتایی من، وانە مەعنەوییەکانی ئەو بوون، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هێز و پێز ڕۆدەکەنە ناو دڵمەوە.. وەك بڵێی هەموو جارێك ئەو مەشرەبە نوێ دەبێتەوە، هەتا ڕاستییەکانی لە قوڵایی فیترەتمدا جێگیر بوون، ئەو ڕاستییانە لە گیان و بوونمدا بوونە تۆوێك.. هەموو کاتێك

خێر و بەرەکەتیان لێ سەوز دەبێت، ئا ئەوەتا ئێستا من لە پاییزی تەمەنمدا، وەك دەبینی، خۆی لە هەشتا ساڵ دەدات، لە بەردەمیدا دانیشتووم و وانەی حیکمەت فێر دەبم.. هێشتا لەبیرمە دەیوت لەو کاتەوە لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی ١٢٩٤ی کۆچی/ ١٨٧٧ی زایینیدا دایناوم، هەرگیز بەبێ دەستنوێژ شیری پێ نەداوم! و بەبێ زیکری خوا و خوێندنی قورئان لە ئامێزی نەگرتووم.. بەبێ دوعا و پاڕانەوە نەیخەواندووم، ئەگەر لە شەودا بەجێی هێشتبم، ئەوە بۆ شەونوێژ و دوعا و پاڕانەوە بووە..! زۆر لە دایکی موسا (عَلَيْهِ السَّلَام) دەچوو.. کێ دەزانێ؟ بەڵکو شتێکی بینی بێت... چونکە دنیا لەوکاتەدا خەریك بوو دوچاری هێرشی تارمایی و دێوەزمە ڕەشەکان دەبوویەوە..! پاشان -بە ڕەحمەتی خوا بێت- زۆر نەمایەوە، سپاردەکەی بەجێ هێشت و کۆچی کرد بۆ جیهانی بەرزەخ! ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی نووریە، تۆ چ ئافرەتێك بوویت؟!

هەروەها "میرزا"ی باوکم -بە ڕەحمەت بێت- لەبەر سڵ کردنەوەی لە حەرام و لەخواترسانی! بە "سۆفی میرزا" بەناوبانگ بوو، تەنانەت بەیانیان، کاتێك ئاژەڵەکانی دەبرد بۆ لەوەڕگا و، ئێوارانیش لە لەوەڕگا دەیهێنانەوە، بە کەمامە دەمی دەبەستن بۆئەوەی تەنیا قەپێك لە کێڵگە و دەغڵ و دانی خەڵکی نەخۆن، بۆ ئەوەی شیر و گۆشت و نرخەکەیان لە چڵك و چەپەڵی حەرام پارێزراو بێت..!

## شێتیی فێربوون

پاشان لە دوای تەمەنی نۆ ساڵیم، مەشرەبی دووەم لە ژیانمدا دەرکەوت و دەروشایەوە: لە شێوازی زانستخوازیدا حاڵەتێکی نامۆ بوو، یەکێك لە مامۆستا و شێخەکانم ئەو حاڵەتەی بە شێتی وەسف دەکرد! ئەوە سیفەتێکە کە چەندین جار خوای بەخشندە لە بارودۆخی جیاجیا و، لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر بەو سیفەتە ڕێزی لێناوم. -کوڕی خۆم- ڕەنگە ئەگەر بینابیت بێگەرد و خاوێن ببێتەوە هەندێك لەدەروشانەوەکانی ئەو سیفەتە ببینیت.. حاڵەتی ڕۆحیم لەو کاتەدا داگیرسابوو، تاوی سەندبوو، من هێشتا ڕۆژەکانی سەردەمی منداڵیم لەبەر خۆم دانەماڵی بوو.. ئەو حاڵەتە ڕۆحییە پاڵی پێوەنام چاودێرییەکی توندی ئەو زانست و داناییە بکەم کە لە"مەلا عەبدوڵلا"ی برا گەورەمەوە دەڕژا.. ڕۆژگارێك لەسەر ئەو حاڵەتە مامەوە.. هەتا ڕۆژێکیان وام هەست دەکرد دڵم لەناو سنگمدا جێی نابێتەوە و خەریکە دەردەچێت! نەمدەتوانی لە گوندە بچکۆلانەکەی خۆم "نوورس"دا بمێنمەوە! بۆیە بڕیاری ڕۆیشتنمدا..!

ئەوەش لەساڵی ١٨٨٥ ی زایینیدا بوو، دەستم کرد بە فێربوونی قورئانی پیرۆز.. پاشان -نازانم چۆن- خۆم لە گوندی "تاغ" لە قوتابخانەی "مەلا محەمەد ئەمین ئەفەندی" بینیەوە.. بەڵام بەرگەم نەگرت لەو قوتابخانەیەدا بمێنمەوە. دووبارە گەڕامەوە بۆ "نوورس".. ئەویش گوندێکی بێبەش بوو لە

مامۆستا و قوتابخانە، ئەو کاتە هەفتەی یەکجار لای کاکە عەبدوڵڵام زانستم وەردەگرت و بەوەندە وازم دەهێنا.

پاش ماوەیەکی کەم چووم بۆ گوندی "برمس"، دوای ئەوە بۆ "مەراعی شێخان"، دواتر بۆ گوندی "نوورشین"، پاشان بۆ گوندی"خیزان"، پاشان ئەوێم بەجێهێشت و دووبارە لەگەڵ کاکە "مەلا عەبدوڵڵا"مدا ڕۆیشتینەوە بۆ گوندی "نوورشین"، ماوەیەك لەوێ مامەوە و دواتر گەڕامەوە بۆ "خیزان"، پاشان وازم لە ژیانی قوتابخانە هێنا و جارێکیتر گەڕامەوە بۆ "نوورس".. ڕۆیشتنم لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر و مانەوەم تیایاندا، چەند مانگێك زیاتری پێنەدەچوو! بێگومان ئەو ژیانی خوێندن و زانستیانەی منی زیاتر لە گەڕەلاوژە یان شێتی نزیك دەخستەوە!

سروشتم هەرگیز سواڵکردن و وەرگرتنی یارمەتی لە کەس قبووڵ نەدەکرد، لەو ڕۆژگاردا نەفسییەتی مامۆستا و قوتابییەکان لەسەر ئەو دۆخە ڕاهاتبوو! بەدەستهێنانی زانست لەو کاتەدا لەسەر ئەوە وەستابوو: ماڵی وەقف، زەکات و خێر و سەدەقەی موسڵمانان! سەرەڕای ئەو دەست کورتی و هەژارییەی تیایدا لەدایك بووم و گەورەبووم، نەفسم بەرگەی ئەو ژیانەی نەدەگرت کە لەسەر ئەو بارودۆخە زەلیل و نزمە -بەلای منەوە- ڕاوەستابوو.. لەڕاستیدا -کوڕی خۆم- ئەوە بە ویست و ئیختیاری خۆم نەبوو.. بەڵکو ئەوە هەستێك بوو بەسەر دەروونمدا زاڵ بوو، بەرەو ئەو ڕەفتارە سەختە دەیدامە بەر! بێگومان لە ژیانمدا نهێنییەکی سەیری هەبوو، پاشتر پێم زانی..! بەڵکو پاش ئەوەی گەیشتمە تەمەنی چل ساڵی بەروبوومە چاك و پاکەکەیم چنیەوە! واتە پاش مردنی "سەعیدی کۆن" و لەدایکبوونی "سەعیدی نوێ" لە ژیانمدا، درەوشانەوە پرشنگدارەکانی ڕژانە ناو بوون و کیانی ڕۆحیمەوە!

بەڵێ، هەرگیز دیاریم لە کەس وەرنەگرتووە، مەگەر لە بەرامبەریدا نرخەکەیم دابێت! سەرەڕای ئەوەی کە زۆر دەست کورت و موحتاج بووم، لەبیرم نایەت ڕۆژێك لە ڕۆژان چووبم بۆ کۆکردنەوە و وەرگرتنی ڕزق و ڕۆزی لە خەڵك، وەك چۆن ئەوە لە کوردستاندا باوبوو، ڕزق و ڕۆزیی قوتابیانی زانست لە ماڵی خەڵکی دەدرا، پێویستییەکانیشیان لە پارەی زەکات پڕدەکرانەوە، ئەوە یەکێك بوو لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی پاڵیان پێوەدەنام بۆئەوەی لە هیچ یەکێك لە قوتابخانەکانی گوندەکاندا زۆر نەمێنمەوە.. هەروەها ڕەوشت و ڕەفتاری گاڵتەکاری و بێ مانای قوتابییەکان بێزاری دەکردم.. زۆربەی ماموستاکان زاڵ نەبوون بەسەر ئەو زانستانەی دەیانوتنەوە.. بێگومان هەستم بەسەرڕاستی و لێبڕانی پیاوەتی و مەردایەتی دەکرد کە منداڵیمی پڕکردبوو، ئەوە لە هەڵسوکەوت و گەڕان و دانیشتنمدا نمایان بوو! دەمبینی عەزیمەتی سوارچاکی بەرەو بەرزاییەکان دەمداتە بەر..! ڕۆژێك لە ڕۆژان ئارەزووی گەمە و گاڵتەوگەپم نەبووە و حەزم لێ نەکردووە! بڕوام پێ بکەن: ئەوە هیچی بەدەستی خۆم نەبووە و لە منەوە نەبوو.. بەڵکو شتێك بوو بەدەر لە توانا و ویستی خۆم.. هەر هەست و بیرێك دابەزیبێتە ناو ڕۆحم، لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیشمدا ڕەنگی دەدایەوە.

کاتێك پەیامەکانی نوور لە ژیانمدا هاتنە بوون، -بۆ ئەوەی ژیانیان مسۆگەر بێت- زانیم چەندە پێویستییان بەوە هەیە سەربەخۆبن و نەبنە کۆیلەی من! ئەوەیش بۆ ئەوان نەدەهاتە دی تا ئەو کاتە نەبێت منیش بە هەمان شێوە سەربەخۆبم و کۆیلەی کەس نەبم!

لە سەردەمی منداڵیمدا بەرەو ئەو ڕەوشتە ئاڕاستەکرام، حیکمەتیش لەو

ئاڕاستەکردنە ئەوەبوو پەیامەکانی نوور -کە خزمەتێکی بێگەردی ڕاستییەکانی ئیمان و دوارۆژن- نەبنە هۆکاری دەستکەوتی دنیایی و بۆ بەرژەوەندیی تاکە کەسی دنیایی بەکارنەهێنرێن.. لەسەر ملنەدان و سەربەرزیی سوارچاکان پەروەردەکرام، هەروەك موسا (عَلَيْهِ السَّلَام) لە ماڵی فیرعەوندا پەروەردەکرا، لەکاتێکدا ئەو کوڕی خێزانێکی هەژار و چەوساوە بوو، بەوە لە نەفسییەتی سەرشۆڕی و زەلیلی ڕزگاری بوو و، دوور لە مەرایی و لەخۆبایی بوون بە سەربەرزی و ملنەدان خۆی ڕازاندەوە! لەوانەیە ڕەگێك لە ڕەگەکانی ئال و بەیت لە خوێنبەرەکانی ڕۆحمدا ڕاپەڕیبێت و بە توندی لە ئاڕاستەکردنی ڕەفتارمی دابێت..!

بەڵێ، دوای ئەوە زانیم -بەڕاستی نەك مەجاز- لەپێناو ئەو حیکمەتەدا ئەم حاڵەتە سەیرەم پێ بەخشراوە، حاڵەتی هەڵهاتن لەو نەریتەی کە لای هەمووان پەسەندبوو، لێی هەڵدەهاتم هەرچەندە لە بنەڕەتدا خوویەکی چاك بوو، بەڵام من هەستم دەکرد بۆ شتێکی تر بەدیهێنراوم، غەیری ئەوشتەی کە ئەو قوتابی و مامۆستایانەی بۆ بەدیهێنراون! ژیانم لەسەر نەخشە و تەگبیری خۆم بەڕێوەنەدەچوو.. بۆیە ڕازی بووم بە بژێوییەکی کەم و هەژاری و دەستکورتی، ژیانی خۆم بەڕێ بکەم..!

لەڕاستیدا کوڕی خۆم، ئەوە پلەیەك بوو لە پلەکانی میعراجی ڕۆحیم کە لە هێشووی پەلە بەرزەکانیەوە شەرابی خۆم دروستکرد، ئەگەر ویستت پەرداخەکەت هەڵبڕە بۆم، هەتا ئەگەر هەستتکرد لەبەر دەستتدا پڕبووە خێرا لێی بخۆرەوە..! ئەوە سەرەتای ڕۆیشتنە، فەرموو سەرنج بدە!

- وتم: ئایا مۆڵەتم دەدەی گەورەم؟

کەمێك چاوەڕێمکرد، لەپڕ وێنەکە نەما.. خۆم بینیەوە بە تەنیا لە کەنار "بەیلەر بەگی" وەکو شێت وڕێنەم دەکرد.. ئەو بیر و ئیلهامانەی بۆم دەهاتن پچڕان..!

بەڕێزان، ماوەیەکی زۆرم بەسەردا تێپەڕی، هیچ شتێکم تێدا نەبینی، هیچ شەبەنگ و تارماییەکم چاو پێ نەکەوت! بێزاربووم لە چاوەڕێکردن، نائومێد بووم، لەوەی جارێکیتر حاڵم تۆز و گەردی خەم و پەژارەی پێوە نەمێنێ.. بانگەواز و یادی خێزان و ماڵ و منداڵ و کار و پیشە و فرمان وەدوم کەوتن! بە دڵتەنگی و خەفەتەوە گەڕامەوە بۆ مەغریب..!

لەنێوان شاری "مەکناسە" و "ریبات"دا سروودی "مەهتەر"ی تورکی ناو سەیارەکەم ئازارەکانمی سارێژ کرد.. کۆت و زنجیری دنیا قاچە لاوازەکانمیان بەستبووەوە! ڕۆژگارێك لەسەر ئەو حاڵەتە مامەوە، هەتا ساڵی ترس و تۆقاندن هاتە پێش، لەوێ جادووگەرەکان پەت و گوریسی گەمە مەزنەکەیان دانا، کۆشکەکانی ئەمەریکا هاتن بەدەما و سوجدەیان بۆ پەروەردگاریان برد! پاشان ئۆتێل و ساختمانەکان لەشاری "دار البیظاء"وە بۆ شاری "ریاظ" لەبەر ئەوان درزیان برد و، هەوڵیاندا لەمزگەوتی "ضرار"دا لاسایی نوێژ بکەنەوە، لە هەموو کەناڵە ئاسمانییەکاندا بە فەرمی دەنگ هەڵبڕا و بە ئاوازی نیفاق "ولا الظالین" دەخوێنرایەوە، پاشان شمشێرەکان لە کێلان دەرهێنران و سەری هەرکەسێکیان دەقرتاند "ئامین"ی نەکردایە! بەڕێزان گەرمای هاوین تاوی سەند، ئەو کۆت و زنجیرە قورسەی کرابووە قاچەکانم ئازاری دەدام، هەتا کۆتا شەو لە شەوە سپییەکان هاتە پێش.. منیش بە فرمێسکەکانم دەستنوێژم دەگرت و بە بێدەنگییەکی گەرم هەنسکم دەدا: ئای دڵم بە ئاگری دووری و دابڕان سوتا! ئای دڵم بە ئاگری دووری و دابڕان سوتا..! دوای ئەوە لەپڕ هەستم کرد کۆت

و زنجیرەکان لەنێو قاچەکانمدا دەشکێن، پاشان خۆمم بینی وەکو ئەسپ بەرەو ئاسۆ تاو دەدەم! هێشتا بولبولەکان هەواڵی لەدایکبوونی بەرەبەیانیان ڕانەگەیاندبوو، خۆم لە فرۆکەخانەی ئەستەمبووڵ بینیەوە، لەگەڵ بانگی بەیانیدا دەمچریکاند!

لەو ساتەدا نەخۆش بووم، لەنەخۆشخانەی "سماء" لەسەر لێواری دەریای مەڕمەڕە ڕاکشابووم، لە جێگەکەمدا سەیری دوورگەی شاژنەکانم دەکرد.. لە مێژووی ڕزگارکەران بەدوای ئیلهاممدا دەگەڕام و، لەو واتایانەی کە لە دەریا خەمبارەکەوە دەهاتنە ناو دڵم، توێشووم هەڵدەگرت. هەرکات هەستم بە هێز و وزەی جەستەم دەکرد کەمێك پاڵم دەدایەوە، بەڵکو بتوانم چەند دێڕێك لە ڕۆمانەکەم بنووسم.. کاتێك خولیای قسەکردن بەهێز بوو، کاتەکە بەرەبەیان بوو.. کتوپڕ لە دەرەوەی پەنجەرەی نەخۆشخانەکەدا وەك فەرمانەدەی دەریاکان دەرکەوت، بەڵام تارماییەکە دوور بوو. بە دەنگێکی لاواز بانگم لێکرد:

- گەورەم! گەورەم! تۆزێك نزیك نابیتەوە، هەتا بتبینم؟

بەجۆرێك وەڵامی دامەوە، نەمدەتوانی بگەمە لای دەنگەکەی، بەڵام لە لێوەکانیەوە خوێندمەوە:

- کوڕی خۆم، ئەمە مەقامی قسە و باس و لێدوانە بەرزەکانە، ئەگەر ڕاستە حەزی موریدانت هەیە، فەرموو سەربکەوە بەرەو بەرزاییەکان..!

وتم: بەسەرچاو گەورەم! بەڵام کام بەرزایی؟ خۆ ئەستەمبووڵ شاری گومەز و تەپۆڵکەکانە، دەبێ لە کوێ تۆ ببینم؟

شەبەنگەکە لە پانتایی دەریاکەدا لەنێو دەربەندی دوورگەکاندا لەبەرچاو ونبوو..!

حەز و تاسە و شەوق لە دڵمدا تاوی سەند و سنووری بەزاند، بڕیارم دا بگەمە ئەو تەپۆڵکەیەی کە بەڵێنم پێدرابوو.. لە نەخۆشخانەکە هاتمە دەرەوە و دارشەقەکەم فڕێدا، پاشان بۆی دەرچووم و لەنێو تەپۆڵکەکاندا بە ڕاکردن هەڵبەز و دابەزم دەکرد، لە لوتکەی "چاملجا"وە بۆ لوتکەی "تەپۆڵکەی یوشەع" لە بەشە ئاسیاییەکەدا، پاشان بۆ بانی سوڵتان ئەحمەد و "ئەیا سۆفیا" لە بەشە ئەورووپییەکەیدا! هەتا گۆڕەپانی ئەبو ئەیوبی ئەنساری ڕام دەکرد، پاشان لەوێ لەسەر لوتکەی تەپۆڵکەکەوە دەمڕوانی بەسەر کەنداوەکەدا.. پاشان ڕامدەکرد.. هەر ڕامدەکرد، سەر دەکەوتمە سەر ئەم تەپۆڵکە یان ئەو تەپۆڵکە، بەڵام هیچ شوێنەوار و شوێن پێیەکی ئەوم نەدەبینی..! جگە لە گریانیش هیچی ترم شك نەدەبرد: ئاهو حەسرەت بۆ من -گەورەم- تۆ چەندە توند و ڕاشکاوی! نەدەبوو پێم بڵێیت کام بەرزاییت مەبەستە و دڵی منیش ئاسوودە بکەیت..!

بەڕێزان، هەستم بە ماندووبوونێکی سەخت دەکرد.. و وەنەوز زۆری بۆ هێنام، خۆم دا بەسەر شوورا دێرینەکانی قوستەنتینیەدا و خەوم لێکەوت.

بینینەکە لە خەودا بوو..

پێی وتم: ئایا دەستنوێژت گرتووە؟

وتم: نەخێر، گەورەم.

وتی: چۆن بەبێ دەستنوێژ بەتەمای بەرزاییەکانی؟ کەسێك چڵك و چەپەڵییەکان دڵیان قورس کردبێت بۆی نییە ئێمە ببینێت.. دەسا کوڕی خۆم بزانە!

هەوڵمدا لە خەوەکەم بێمە دەرەوە، یەکسەر بە توندی ئاماژەی بۆ کردم:

- لە شوێنی خۆت مەجووڵێ! ئەمە مەقامی تۆیە، لە بێداربوونەوە

بەشت نییە! بەڵکو ئێستا بۆت هەیە خەو ببینی، من لە داهاتوودا یەکەمین بەروبوومەکانی داهاتەکانی پاکیت دەرخوارد دەدەم، دەسا بۆ خۆت بێدەنگ بە!

## مەقامی بینینی پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا

پێی وتم:

کاتێك وازم لە ژیانی قوتابخانە هێنا و گەڕامەوە بۆ سایەی باوك -بە ڕەحمەتی خوا بێت- لە "نوورس"، تەمەنم تەنها چواردە ساڵ بوو.. پاشان چوومە قوتابخانەیەکی ڕۆحیەوە، کە خۆم لە ناخی خۆمدا بۆ خۆم دروست کردبوو.. لەو قوتابخانەیەدا حاڵەتەکانی ئیمان و دیمەنەکانی ئیحسانم بەدەستدەهێنا، هەتا لەو ساڵەدا تارای سەوزی بەهار هەموو لایەکی داپۆشی، وادەی سەردەرهێنانی گوڵەکانی لە خونچەکانیان ڕاگەیاند، لەپڕ ئەوە ڕوویدا کە ڕوویدا.

ئەمە قیامەتە، ئێستا بەرپابووە! لەڕاستیدا من بوونەوەران دەبینم سەرلەنوێ زیندوو دەکرێنەوە.. لەسەر زەویدا ڕووەکی سەیروسەمەرە لە بەدیهێنراوانی جۆراوجۆر لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە.. ڕەوشەکە ئەوەندە ناهەموارە، وشە دەستەوسانە لەوەی بتوانێت وەسفی بکات..! منیش ئەوەندەم بۆهات بیری گەورەمان پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بکەمەوە.. لە دڵی خۆمدا دەمپرسی: چۆن بتوانم سەردانی بکەم؟ پاشان ئەوەم هاتەوە یاد، پێویستە لەسەرم لە سەرەتای "پردی سیرات"دا چاوەڕێ بکەم.. هەموو بەدیهێنراوان لەوێوە تێپەڕدەبن. کەواتە هەر کە چاوم پێکەوت، بە پەلە بۆ لای دەچم..!

ئـەم جۆرە بیرکردنەوەیـە کەوتـە دڵـم.. هـەرواش بـوو، ژمارەیـەك لـە ئەنبیـا و پێغەمبەرانـی کیرامـم چاوپێکـەوت.. خـوای گـەورە ڕێـزی لێنـاوم و چاکـی بـۆ کـردم، یـەك لـەدوای یـەك زیارەتـم کـردن و، ئەوەنـدەی خـوا بـۆی ئاسـان کـردم بینیمـن.. دەسـتی هەموویانـم مـاچ کرد، (عَلَيْهِـمْ أَفْضَـلُ الصَّـلَاةِ وَالسَّـلَامِ).. پاشـان..

هـەر ئەوەنـدەی هەسـتمکرد نـووری مۆڵەتـی زیارەتـی گەورەمان-محەممـەد- کەوتووەتـە دڵمـەوە، یەکسـەر خـۆی (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لـە بەردەممـدا دەرکـەوت..! دایـك و باوکم بـە قوربانـت بـن ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئایـا ئەمـەی کـە دەیبینـم حەقیقەتـە..؟ بـە سـڵاو لێکـردن و ماچکـردن خۆمـدا بەسـەر دەسـتە پیرۆزەکانیـدا.. لەو سـاتەدا سـەرم لە خۆم سـووڕما: چونکە لەو کاتـەدا خەڵکی داوای شـەفاعەتیان دەکـرد، ئەوەشـی لـەو سـاتەوەختەدا کەوتـە نـاو دڵـم تەنهـا یـەك شـت بـوو: ئەویش داواکردنـی زانسـت بـوو! سـەیرە! بێگومـان مـن بـە وەسـفی مامۆسـتا ڕووم تێکـرد، بەڵکو لەبەردەمیدا بـە قوتابـی قبووڵـم بـکات! بـەم جۆرە و لـە دوای بەرپابوونـی قیامـەت؟ سـەیرە! خۆشەویسـتم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خێرا لای کـردەوە بـە لای منـدا و مـژدەی پێـدام و فەرمـووی "زانسـتی قورئانـت پـێ دەبەخشـرێت، بـە مەرجێـك پرسـیار لـە کـەس نەکەیـت!".. کـوڕی خـۆم، ئـەوە یەکـەم بێداربوونـەوەم بـوو لـە ژیانمـدا! دوای ئـەوە لـە ژیانمـدا سـەیروسـەمەرەی زۆرم بینـی!

ئـەم خـەوە کانیـاوی شـەوقێکی مەزنـی لـە دڵمـدا بـۆ گـەڕان بـە دوای زانسـتدا تەقانـدەوە. بۆیـە لـە باوکـم -بەڕەحمـەت بێـت- مۆڵەتـم وەرگـرت بۆئـەوەی بچـم بـۆ ناحیـەی "ئـەڕواس" بـۆ بەدەسـتهێنانی زانسـت لـە لای "مـەلا محەممـەد ئەمیـن ئەفەنـدی" پاشـان بـەرەو "دوغـو بایەزیـد" کەوتمـە ڕێ.. ئـەوە سـەرەتای حاڵەتـە سـەیروسـەمەرەکان بـوو!

# شێتیی خوێندنەوە

وازم لـە مامۆسـتایان و قوتابیـان هێنـا، پەلامـاری کتێبخانەکانمدا، هەرچییـەك چێـژی پـێ دەدام لـە خـەم و ئـازار و شـێتیی کتێبخانـەکان، هەڵـم دەلوشـی. هەتـا خۆمـم بینیـەوە بـە عـەقڵێکی نامـۆ و ڕۆحێکی سـەیر و سـەمەرەوە دەژیـام! هەسـتم دەکرد کەسێکیتر دابەزیوەتـە نـاو ڕۆحـم و لـە قـەوارە و بوونمـدا نیشـتەجێ بـووە.. بـەڵام بەبێ درزبردن و دابەش بوون، بەڵکو بـە کەسـایەتییەکی جامیـع و مانیـع..! بەڵکو ئـەوە بریتـی بـوو لـە هاتنـی بەهـرەکان بەجارێك:

﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾..! (الضحى: ١١)

**واتـە: وە دەربـارەی نـازو نیعمەتەکانـی پـەروەردگارت هەمیشـە بـدوێ و باسـیان بکـە لـە جێـی خۆیانـدا بەکاریـان بهێنـە.**

ئەوەندە زانسـتم دەسـتکەوت هەرگیز لەسـەر دەسـتی هیـچ مامۆسـتایەك دەسـتم نەکەوتبێت..! هـەر ئەوەنـدە بـەس بـوو چەنـد سـەرنجێکی کتێبێـك بدەم، هەتـا واتـای ناوەڕۆکەکـەی لـە دڵمـدا دەچەسپی. سنگم دەبـووە دەفرێـك بۆی، لێـی تێدەگەیشـتم و فێـری دەبـووم و دەمزانـی و لەبەرمدەکـرد و دەموتـەوە..! ئـەوە شـتێك بـوو لەسـەرو توانـای زیرەکـی فیتـری و زەینـی منـەوە بـوو، بەڵکـو دەراسـا و لـە دەرەوەی لێهاتـن و توانسـتی مرۆڤانـەی مـن بـوو بـۆ وەرگرتـن! ئـەوە حاڵەتێکـی ڕۆحیـی نامـۆ بـوو

لەناکاو هاتە ناو من.. بە بەرەکەتی ئەوەی لە خەوەکەی پێغەمبەری ئەکرەمدا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەرمگرت. منیش پابەندی مەرجەکە بووم: "ما لم تسأل أحدا" لەبەر ئەوە داوای هیچ شتێکم لە کەس نەکردووە، ئیتر ئەوەی کەبوو، بوو..!

پاش ئەوەی لە ماوەی ساڵێك یان دوو ساڵدا چەند مانگێك پچڕ پچڕ لێرەو لەوێ شارەزای بنەماکانی زانستی "نحو" و "صرف" بووم، حاڵەتێکی سەیر و سەرنج ڕاکێشم لێ دەرکەوت، ئەوەبوو لە ماوەی سێ مانگدا نزیکەی پەنجا کتێبم خوێندەوە و، هەر هەمووشیان فێربووم و لەخۆمگرتن و مۆڵەتم لەسەر وەرگرتن. پاش تەواوکردنیشیان بڕوانامەم تێدا بەدەستهێنان. ئەم خوێندنە نامۆ و چڕوپڕە، لە ماوەی سێ مانگدا لە "دوغو بایەزید" لەژێر چاودێری شێخ محەممەدی جەلالیدا درێژەی کێشا.. بەجۆرێك هەموو ئەو کتێبانەی بڕیاربوو قوتابی لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ بیانخوێنێت، تەواومکردن! سەرەتا لە کتێبەکەی "مەلا جامی": "الفوائد الضيائية في شرح الكافية لابن الحاجب" هەتا کۆتا کتێبی بڕیاردراو.. بەڵام لەو کاتەدا سروشتم -بەبێ ویستی خۆم- ئاڕاستەی دەکردم لە هەر کتێبێکدا تەنیا وانەیەك یان دوو وانە ئەوپەڕی تا دە وانە بخوێنم، بێ ئەوەی کتێبێك تەواو بکەم، دەستم دەکرد بە کتێبێکی تر.. کاتێك مامۆستاکەم "شێخ محەممەدی جەلالی" لەبارەی هەڵسانم بەو کارە -کە پێچەوانەی باو و نەریتی ئەوکاتە بوو- پرسیاری لێکردم، نەمدەزانی چۆن ئەو حاڵەتە تایبەتەی خۆمی بۆ ڕوون بکەمەوە، ئەوە نەبێ بەڕێز و ئەدەبی قوتابی لەبەردەست شێخەکەیدا وتم:

- خوێندنەوەی هەموو ئەم کتێبانە و تێگەیشتن لێیان لە توانای مندا نییە..! ئەم کتێبانە لە سندوقی ماددە گرانبەهاکان دەچن، کلیلەکانیشیان لە

لای ئێوەیە! هەموو ئومێدێکم ئەوەیە بەڕێزتان ڕێنماییم بکەن بۆ ئەو شتەی کە لەناو ئەم سندوقانەدا هەیە، مەبەستم ئەوەیە ناوەڕۆك و هونەری کتێبەکەم پێ بڵێن، بۆ ئەوەی تیایدا ئەو شتە هەڵبژێرم کە لەگەڵ سروشتی مندا دەگونجێ..!

لەو سێ مانگەدا ڕۆژانە نزیکەی دوو سەد لاپەڕە یان زیاترم دەخوێندەوە..! واتە ڕۆژانە "مەتن"ێکی تەواو لە "مەتن"ەکانی کتێبە سەرەکییەکانم دەخوێندەوە وەکو "جمع الجوامع لابن سبكي"، و "شرح المواقف لعضدالدين الايجي" و "تحفة المحتاج في شرح المنهاج لابن حجر الهيثمي"... زۆرێکی تر لەو بابەتانە...

سەیر لەوەدابوو -بەفەزڵی خوا- پێویستیم بە یارمەتی هیچ مامۆستایەك یان هیچ کەسێك نەبوو ئەو کتێبانەم بۆ شەرح بکات! تۆ دەزانی ئەم "مەتن"انە و هاوشێوەکانیان چەندین مەتەڵ و بابەتی پێچوپەنایان تێدایە، نەك تەنیا قوتابیان بەڵکو شێخ و مامۆستاکانی ئەو سەردەمەش لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی گرفت و گرێ کوێرەکانیاندا دەستەوسان و سەرسام بوون! بەڵکو هەر تەنیا بە دانانی کتێبەکە لەبەردەستمدا و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی و چاوپیاخشاندنی دێڕ بە دێڕی لاپەڕەکانی، واتاکانی دەگوازرانەوە بۆ ناو دڵم.. بەر لە شێوە و وێنەی دێڕەکانیش، لە واتا و ناوەڕۆکەکەی تێدەگەیشتم. من وەك خۆم نەمدەتوانی لەو حاڵەتە تێبگەم کە بەسەرمدا دەهات! ئیتر لەکوێ و چۆن بتوانم باسیان بکەم بۆ کەسانیتر، یان بۆیان لێك بدەمەوە؟!

لەسەر ئەو حاڵە ڕۆیشتم، تا ئەو ڕادەیەی لە هەر زانستێك لە زانستەکان پرسیارم لێ بکرایە، وەڵامێکی تەواو و دڵنیابەخشم دەدایەوە! ئەوە بوو بەم وهاتنە ڕۆحانیە لە خوێندن و خوێندنەوەدا ڕۆچووم هەتا ڕۆژگارێك -لەبیرم

نایە چەندبوو- پەیوەندیم بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە پچڕا! خەڵوەت و گۆشەگیریم لا خۆشەویست کرا، لەو گۆشەگیرییەدا ئەوەندەی خوا توانای پێبەخشی بووم، هەموو کاتەکانم لە کۆکۆدنەوە و وەرگرتن و لەخۆگرتنی زانستدا دەبردە سەر! هەتا هەستێکی نوێ هاتە دڵم و ڕایوەشاندم و بیرێکی چاك بەئاگای هێنامەوە و داوای لێکردم بڕۆم بۆ شاری " شیروانە" بۆ لای مەلا عەبدوڵڵای کاکەم.. هەر کە لەبەردەمیدا وەستام ، پێی وتم:

- من "شرح الشمسیة"م لە ڕاڤەی بنەماکانی زانستی "مەنتیق"ی قەزوینیم تەواوکردووە! ئەی تۆ چیت خوێندووە؟ واتە لەو کاتەوە پێش چەند مانگێك لە یەکتر دابڕاوین!

وتم:

- هەشتا کتێبم خوێندووە!

- عەبدوڵڵا، لە جێی خۆی ڕاچڵەکی و وەکو بیەوێ بڕوا نەکات و وتی:

- چی دەڵێی؟!

وتم:

- لەڕاستیدا هەموو ئەو کتێبانەی بڕیارە بخوێنرێن تەواوم کردوون. زیاد لەوەش چەند کتێبێکی تریشم خوێندووە..! کاتێك دڵنیابوو لە ڕاستی قسەکانم، بە جددییەتی برا گەورەییەوە، وتی:

- کەواتە تاقیت دەکەمەوە ئەی سەعید!

وتم:

- من ئامادەم.. چیت پێ خۆشە پرسیار بکە!

وشە بە وشە لەگەڵ هەموو وەڵامێکدا -بەڕەحمەت بێت- سەری ڕادەوەشاند و بە ئەوپەڕی سەرسووڕمانەوە گوێی لە وەڵامەکان دەگرت، وەك ئەوەی بیەوێ نەك تەنیا وەڵامەکان بزانێت، بەڵکو لەوە تێبگات کە من چیم بەسەر هاتووە!؟ بێگومان ئەوەش پرسیارێك بوو وەڵامەکەی لای من نەبوو!

فکان ما کان مما لست أذکره          فظنّ خیراً ولا تسأل عن الخبر

سەرسووڕمانەکەی لەگەڵ خۆشەویستییە برایانەکەیدا تێکەڵ ببوو، دیاربوو بەدڵ ئەو بەهرە و بەخشینەی پێ خۆش بوو کە خوا بە کەرەمی خۆی ڕژاندبووی بە سەرمدا، من نەمدەتوانی وەسفی بکەم..! هەر ئەمەندە و بەس، ئیتر -بەڕەحمەت بێت- بە مامۆستای خۆی هەڵیبژاردم، ئەوەی ڕاستی بێت چەند مانگێك لەوەوبەر من قوتابی نایاب و وەجاخ زادەی ئەو بووم!

هێزی حەز و تاسەم بۆ گەڕان بە دوای زانستدا زیاتر و زیاتر بوو، هەر بۆیە چووم بۆ قوتابخانەی مەلا فەتحوڵڵا ئەفەندی لە شاری "سەعرەد"، بەڵکو لە لای ئەو شتێکی ترم دەستبکەوێت و حەز و ئارەزووی زانستی خۆمی پێ تێر بکەم..! شێخ پرسیاری لێکردم:

-ساڵی پار کتێبی "البهجة المرضیة فی شرح الألفیة"ی "سیوطی"ت خوێند، ئایا دەتەوێ ئەمساڵ کتێبی "الفوائد الضیائیة"ی "مەلا جامی" بخوێنی؟

وتم:

- گەورەم، خوێندنی "جامی"م تەواو کردووە!.. کەمێك سەرسووڕمان بەسەر ڕوخسارییەوە دەرکەوت! پاشان لەبارەی کتێبێکی ترەوە پرسیاری لێکردم، بە هەمان جۆر وەڵامم دایەوە. پاشان کتێبێکی تر و دیسان کتێبێکی تر.. هەتا

خەریك بوو بڕوا بە هیچ یەكێك لە قسەكانم نەكات..! چونكە لەبارەی هەر كتێبێكەوە پرسیاری لێ دەكردم، لە وەڵامدا دەمووت تەواوم كردووە..! سەری لە كاری من سووڕما، چونكە كەسێك چۆن دەتوانێت لەو ماوە كورتەدا ئەو هەموو كتێبە بخوێنێت؟ هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ بڵێ:

- ساڵی ڕابردوو شێت بوویت، ئایا هێشتا لەسەر هەمان حاڵ ماوی؟

ئەم قسەیە ناچاری كردم وەڵام بدەمەوە، بۆیە وتم:

- ڕەنگە مرۆڤ حەقیقەت لە كەسانیتر بشارێتەوە بۆئەوەی تووشی لەخۆبایی بوون نەبێت و لوتبەرزی دەروونی بەدخوازی خۆی بشكێنێ، بەڵام قوتابی لەبەردەم مامۆستاكەیدا -كە لە باوكی گەورەتر و بەڕێزترە بەلایەوە- جگە لە وتنی حەقیقەتی ڕەها ناتوانێ شتێكی تر بڵێ..! مامۆستای بەڕێزم ئەگەر دەفەرموون فەرمان بدەن، من ئامادەم بۆ تاقیكردنەوە لە هەموو ئەو كتێبانەی كە ناوتان هێنان..!

جددییەت و لێبڕان لەسەر ڕوخساری مەلا فەتحوڵڵادا دەركەوت.. لە استیدا خۆی ئامادەكرد بۆئەوەی تاقیمبكاتەوە، پاشان دەستی كرد بە پرسیارلێكردنم، لە هەموو ئەو كتێبانەدا، كتێب لە دوای كتێب.. لە هەر كتێبێكدا پرسیاری لێ دەكردم، ئەو كتێبەم دێڕ بە دێڕ لەبەرچاو دەكرایەوە، وەڵامەكەش لەسەر زمانم بە تەواوی هەڵدەقوڵا.. پاشان بەجۆرێك لە دانپیانانی تێكەڵ بە سنگ دەرپەڕاندن پێی وتم:

- زۆر باشە.. زیرەكیت دەراسا و لەڕادەبەدەرە! بەڵام ڕێگە بدە هێزی لەبەركردنت ببینین! ئایا دەتوانی چەند دێڕێك لە كتێبی "مەقاماتی حەریری" دوای دوو جار خوێندنەوە لەبەر بكەیت؟

کتێبەکەم گرت بەدەستەوە، یەك جار لاپەڕەیەکیم لێ خوێندەوە، گەرماوگەرم وێنەی تەواوی لاپەڕەکە، بێ کەموکورتی کەوتە ناو دڵم! پاشان ڕاستەوخۆ لە جۆگەلەی زمانمەوە هەڵقولا..! مامۆستا لەوە زیاتر خۆی نەگرت، ئەوە نەبێ بە حەپەسانەوە وتی:

- کۆبوونەوەی زیرەکی دەراسا و لەڕادەبەدەر، لەگەڵ توانای لەبەرکردنی دەراسا و لەڕادەبەدەر لە تەنیا کەسێکدا، یەکێکە لە شتە زۆر دەگمەنەکان! بەڕاستی تۆ: "بەدیعوززەمان"یت..!

ئەو -بەڕەحمەت بێت- یەکەم کەس بوو ئەو نازناوەم لێ بنێت، کە خەریکە بەسەر ناوە بنەڕەتییەکەم: "سەعیدی نوورسی"دا زاڵ ببێت! ئەوەش گۆڕا بۆ خۆشەویستییەکی بێگەرد لە نێوانماندا..! فەتحوڵڵای مامۆستام لە کۆڕ و دانیشتنەکانیدا و لەگەڵ زانایاندا دەستی کرد بە باسکردنی من، بەردەوام ستایشی دەکردم و سەرسامی خۆی بەرامبەرم دەردەبڕی.. هەتا دەنگوباسی من بڵاوەی کرد! - خوا شایەتە- من ئەوەم بۆ نەفسی خۆم نەویستووە. بەڵکو بۆ کارێك بوو کە خوای پەروەردگار خۆی دەیزانێ..!

هەموو شاری "سەعرەد" باسی لە داستانی لاوێکی ئەفسانەیی دەکرد، ئەوەش خۆهەڵقورتاندنی زاناکانی ئەو شارەی ورووژاند، بۆیە ڕوویان تێکردم و ڕژان بەسەرمدا و بەمەبەستی بێزارکردنم بەجۆرەها پرسیار تاقیاندەکردمەوە، جارێکیان لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا و، بە ئامادەبوونی مەلا فەتحوڵڵا ئەفەندی، ئەوە ڕوویدا..

سەیر لەوەدا بوو، ئەمجارەیان هەر کە پرسیاریان لێدەکردم چاوم دەبڕیە ڕوخساری مەلا فەتحوڵڵای مامۆستام.. پاشان وەڵامم دەدایەوە و، وامدەزانی

لە دەموچاوی ئەودا سەیری کتێبێك دەکەم و دەیخوێنمەوە.. زاناکانیش تا دەهات، زیاتر تووشی حەپەسان و سەرسوڕمان و واق وڕمان دەبوون! هەموویان یەکدەنگ ڕایان هاتە سەر ئەوەی کاری من لەڕاستیدا شتێکی دەراسا و نائاساییە.. وەك ئەوەی پەیوەندی بە وزەیەکی ڕۆحییەوە هەبێت لە دەرەوەی توانای مرۆڤانەی خۆمەوە..!

دوای ئەوە هەستمکرد شاری "سەعرەد" بەرگەی گەرمای حەزەکانی من ناگرێت، بۆیە جارچی سەفەر بانگی لێکردم و، ئیتر بۆی دەرچووم..!

.....................

پاشان ئەو بیرەوەریانەی دەهاتن بۆ دڵم پچڕان، بەڕێزان لەپڕ خۆم لە مەغریبی دوور بینیەوە لە نێوان مەکناسە زەیتوون و شاری زەرهوندا ڕادەکەم و، بە دوای شوێن پێیەکی سوڵتان مەلا ئیدریسی ئەکبەردا، یان پاشماوەی جێگە سمەکانی سوپای تاریقی کوڕی زیاددا دەگەڕام.. بەتەمابووم بزانم پرشنگی ئەو چەخماخەیەی کە دای لە نێوان قورتوبەی ئەندەلوس و شاری کۆسۆڤۆ لەکوێ خۆی شاردووەتەوە؟

پرسیارم لە پارێزگاری گەنجینەی کتێبخانەکەی مزگەوتی دێرینی شاری مەکناسە کرد:

- ئایا لە لای تۆ دەستنووسێك یان شوێنەوارێکم دەستناکەوێت، وێنەی ڕێگای گەڕانەوەی کێشابێت..؟

لە خۆشیدا چاوەکانی بریسکانەوە، کەمێك دیارنەما، پاشان گەڕایەوە و پارچەیەکی پتروکاوی دەستنووسێکی کۆنی هەڵگرتبوو لەنێو دەستەکانیدا ورد ورد دەبوو.. پێی وتم:

- ئەمە بەختی خۆتە کوڕی خۆم..! ئێمە تەنیا بەشێکین، بەشە تەواوکەرەکەی ترمان، لە کتێبخانەی ئەستەمبووڵە!

ئێرە ئەستەمبووڵە..! لە ژوورە بچکۆلانەکەمدا جانتاکەمم دانا و، بە پەلە دەرچووم بەرەو کتێبخانە مەزنەکەی سولەیمانیە، لە مزگەوتە دێرینەکەیدا دوو ڕکات نوێژم بەجێهێنا، پاشان چوومە ناو ڕەفەی دەستنووسەکانەوە.. لەنێو مەلزەمە و پەڕە کاغەزەکاندا دەستمکرد بە ڕاوڕاوێن، هیچ شوێنەوارێکی ئەو"بەش"ەم دەست نەکەوت، کە من بەدوایدا وێڵ بووم..! قاچەکانم ماندوو بوون، هێزم تیا نەما، لەبەر ئەوە دووبارە گەڕامەوە بۆ ناو مزگەوتەکە، بەڵکو کەمێك ماندوویەتیم دەربچێت و بحەسێمەوە.. کاتەکە کاتی نوێژ نەبوو، کەمێك لە میحرابە جوانەکە نزیك بوومەوە، لەسەر پشت بۆی ڕاکشام و دەستمکرد بە سەرنجدانی زەخرەفەی گومەزە پرشنگدار و ڕازاوەکەی، هەتا فەزا ئارامەکەی بە وەنەوزێکی خۆش دایپۆشیم.. خەو نەبوو، بەڵکو پێشەکییەك بوو بۆ هاتنی واتایەکی نوێ بۆ ناو دڵم!

بینیم میحرابەکە بەسەر چیایەکی زۆر بەرزدا کرایەوە، چاوم هەڵبڕی بەڵکو بگەمە ئەوپەڕی، بەڵام نەمتوانی! زۆری پێنەچوو، بینیم بەدیعوززەمان لەسەر لوتکەی چیاکەوە بەرەو لای من دێتە خوارەوە، کاتێك تا ئەو شوێنەی ئازارەکەی منی پێدەگەیشت، نزیك کەوتەوە، بە دەنگێکی بەرز پرسیارم لێکرد!

- گەورەم..! گەورەم..! ئایا دەتوانم نیوەکەی ترم بدۆزمەوە، یان ئەوەتا جیابوونەوە پێش بەیەکگەیشتنەوە کەوتووە؟

وەکو کەسێکی تووڕە سەیری کردم و وتی:

کوڕی خۆم، زانست بە کردەوەیە.. چۆن بەتەمایت خەونەکانت بێنە دی نەوەش نیوەکەتە و زۆر لە خۆت بەرزترە؟ ئەگەر لەڕاستیدا بەتەمای وەسڵیت، فەرموو بخوێنە و سەربکەوە! بەرزبوونەوە و سەرکەوتنیشت دەستناکەوێت، مەگەر تەنیا بە فەرمانداان بە چاکە و قەدەغەکردن لە خراپە نەبێت.. کوڕی خۆم -ئەگەر بڕیارتدا- لەم پەند و حیکمەتەدا بەسەرهاتێکت دەست دەکەوێت!

## بەسەرهاتێک: حاڵێکی موسەوی لەڕۆحمدا دەژێتەوە!

پێی وتم:

پێش ئەوەی بڕۆم و"سەعرەد" بەجێبهێڵم، ڕووداوێکی سەیرم بەسەر هات!..
لە نزیک گوندەکەدا "عەشیرەتی میران" هەبوو، لەژێر ستەمێکی سەخت و دژواردا چۆکی دادابوو، خانووە بچووکەکانیان لە جەزیرەی "ئیبن عومەر"دا پاڵیان بەیەکەوە دابوو، یاخی و ملهوڕێکی ترسناک جڵەوی کاروباری گرتبووە دەست و، خراپترین سزای دەرخوارد دەدان.. ئەویش مستەفا پاشا بوو..!

ئەوەبوو سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم -بەڕەحمەت بێت- لە خۆرهەڵاتی وڵاتدا پلەی پاشایەتی بەخشی بە هەندێک لە سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان، ئەوانیش چەند میلیشیایەکی چەکداریان لە پیاوانی هۆزەکان پێکهێنا، بۆئەوەی هەڵسن بە پاسەوانی کردنی سنوورەکان لە دژی هێرشەکانی ڕووس و ئەرمەن. هەروەها سەرۆک هۆزەکان ببەسترێن بە دەوڵەتەوە و ڕێی ئەوەیان لێ بگیرێت کە جموجوڵ بکەن و بزووتنەوەی یاخی بوون و هەڵگەڕانەوە دژی دەوڵەت ئەنجامبدەن، لەبەر ئەوە سوڵتان دیاری و خەڵاتی بۆ دەناردن و بەنەرمونیانی و ڕەفتار و گوفتاری شیرین لەگەڵیان دەجووڵایەوە.

بەڵام لەڕاستیدا "مستەفا پاشا"ی سەرۆک عەشیرەتی "میران" کەسێکیتر

بـوو!.. چونكـه بـه سـتەم و زۆرداری و لوتبـەرزی و لەخۆبایـی بـوون و خوێـن ڕشـتنی بـه ناهـەق ناوبانگـی دەركردبـوو! لـه هـەر كەسـێك تـووڕە ببوایـە، یـان لـه لای ئـەو سـكاڵای لـێ بكرایـە -ئـای ئەوكەسـه چەنـدە دامـاو و بەدبەخـت دەبوو!- بێ هیـچ گومانێك چارەنووسـی كوشـتن یـان سـزایەكی ڕیسـواكەر دەبوو! تەنیـا ناوبردنـی لەنـاو خەڵكدا دەبـووە هـۆی تـرس و دڵەڕاوكـێ! خەڵكی جەزیـرە و دەوروبـەری چـی تـر بەرگـەی سـتەم و زۆرداری ئەویـان نەدەگـرت، بـەڵام هیچیـان پـێ نەدەكـرا و ڕێگاچارەیەكیـان دەسـتنەدەكەوت!.. كـێ دەتوانـێ ڕووبـەڕووی ئـەو دڕنـدە تێكشـكێنەرە مەترسـیدارە بێتـەوە؟ چـۆن، ئەوەتـا سـیخوڕەكانی هەمـوو لایەكیـان تەنیـوە!؟

هەتا ئەوەبوو شەوێكیان لە ڕۆژگارەكانی تر لە ژیانی بەدیعوززەماندا..!

-كـوڕی خـۆم-، "سـەعیدی كـۆن" خاوەنـی زانسـتێكی فـراوان و جەسـتەیەكی تۆكمـە و بەهێزبـوو!.. گەنجێـك بـوو، بـەڵام نـەك وەك هیـچ گەنجێكـی تـر! لاوێتییەك وەكو بەهێزترین لاوێتـی! لـەو ساتەوەختەدا ئەو كەسایەتییەكی موسـەوی بوو! ئەگـەر تـووڕە ببوایـە لـە خولـی یەكەمـدا دەجەنـگا! زۆری پـێ نەدەدەچـوو زەبری كوشـندە و گـورزی كەمەرشـكێنی دەوەشـاند!.. بـەڵام لـە هەمـووی بەهێزتـر ئەوەبـوو ئـەو خاوەنـی عەزیمەتێـك بـوو، كێوەكانـی دەڕووخانـد و لـە بـن دەری دەهێنـان! ئەمـە بـوو نهێنیـی ڕاسـتەقینەی هێـزی ئـەو!

پێی وتم:

هەرگیـز ئـەو شـەوە سەیروسـەمەرەم لەبیرناچێتـەوە!.. بینیـم شێخ "عەبدولقـادری گەیلانـی" لـە جوانتریـن شـێوەدا دەركـەوت! زۆرم خۆشـدەویست، ئێسـتاش هـەر زۆرم خۆش دەوێ!.. ڕوخسـاری نـووری لـێ دەبـاری، نیـگای چاوەكانـی ئیمانـی لـێ

دەڕژا.. لە ئاسمانی خەونمدا بە جل و بەرگە سپی و جوانەکەی مەلەی دەکرد، هەتا لێم نزیك بووەوە! پاشان بانگی لێکردم، وەك بیەوێ لە سڕبوون و بێ ئاگایی هەڵمبستێنێ:

مەلا سەعید!.. مەلا سەعید!.. کوڕی خۆم، هاوارەکەی لە گیانمدا دەنگی دایەوە و ژیانی ڕۆحمی نوێ کردەوە.. هێزێکی تری خستە سەر هێزەکەم، عەزم و لێبڕانێکی تری نوێی خستە سەر گەنجێتییەکەم! هێشتا دەنگدانەوەی بانگەوازەکەی لە ڕۆحمدا نەپچڕابوو، هەتا پێی وتم:

بڕۆ بۆ لای مستەفا پاشا سەرۆکی عەشیرەتی "میران"، بەئاگای بهێنەوە کوڕی خۆم! بڕۆ بەئاگای بهێنەوە!.. داوای لێ بکە تەوبە بکات و واز لە ستەم و زۆرداری بهێنێت و نوێژەکانی بکات! کوڕی خۆم ئامۆژگاری بکە، فەرمان بە چاکە بکات و ڕێ لە خراپە بگرێت..!

پێش ئەوەی درەوشانەوەکە لەبەرچاوم ون بێت، بە دوودڵییەوە سەیرم کرد پرسیاری لێ بکەم، بەڵام بەرلەوەی تەنیا پیتێك بەدەممدا بێت، بە هێز و غیرەتەوە، دەستی کردەوە بە قسەکانی، دەستەواژەکانی لە سکە دەدا:

- خۆ ئەگەر وەڵامی نەدایتەوە یەکسەر بیکوژە!

کتوپڕ دەرکەوتن و درەوشانەوە کە لەبەرچاوم نەما! اللّٰه أکبر..!

ئەوکاتە تەمەنم پانزە ساڵان بوو، بەڵام جەستەم هێز و وزە و تینی بیست ساڵان و بەرەو ژووری لێ دەڕژا، ڕۆحم لەناو سنگمدا وەکو گڕکانێکی پەنگ خواردوو ڕاپەڕی! وشەکانم لەسەر زمانم وەکو سەربازەکانی سوپایەکی بەهێز، کە بە خێراییەکی لەڕادەبەدەر خۆی بۆ جەنگ ئامادەبکات دەستیان بە ڕیزبوون

کرد! پاشان ماسولکەکانم خۆیان ئامادەکرد بۆئەوەی بە هێزەوە کار بکەن! بێگومان ئەو فوەی کرا بە بەرما، لەوە بەهێزتر بوو بەرگەی چاوەڕێکردنی من بگرێت، لافاوی تورەبوونێکی موسائاسا لە دڵمدا سەری هەڵدا، پێشتر شتی وام بەخۆمەوە نەبینی بوو! ئەو شەوە هەتا ڕووناکیی بەرەبەیان دەرکەوت پێڵوی چاوەکانم لەیەك نەنا! پاشان وەك ئەسپی سەرکەش لە ماڵ دەرچووم، بۆ ئەنجامدانی ئەرکە سەیروسەمەرەکەم، بە لای هیچ شتێکدا ئاوڕم نەدەدایەوە!

لەگەڵ یەکەم جریوەی باڵندەکاندا بەیانی زوو، شمشێرێکی کۆنم کردە شان و بەرەو شاری "جەزیرە" کەوتمە ڕێ.. وام هەستدەکرد قاچەکانم بەسەر چیاکاندا هەنگاودەنێن! لە ئاسۆی بەردەممدا و لە ناوەڕاستی دەست و پێوەندەکەیدا فیرعەونێکم دەبینی، لە گۆڕەپانێکی پڕ لە شاعیر و کاهیندا، کۆمەڵی چەوساوەکانیش لەبەردەمیدا بە سەرشۆڕی کڕنوشیان بردبوو، ئەویش سزایەکی ڕیسواکەری دەرخوارد دەدان! منیش زۆر حەزمدەکرد ڕزگاریان بکەم! سەیر لەوەدابوو، لە خۆ دا هێز و وزە و عەزیمەتێکی وام دەبینی پێشتر شتی وەهام بەخۆمەوە نەبینی بوو! و لە دوای بیستنی وتەکانی شێخی گەیلانی ترس و دڵەڕاوکێ ڕێگەی دڵی منیان نەدەزانی! و من دڵنیابووم لە سەرکەوتن و جەستەی کوژراوی فیرعەونم لەبەردەستمدا دەبینی.

گەیشتمە شاری جەزیرە.. چوومە ناو چایخانەی گوندەکە و لەبارەی مستەفا پاشاوە پرسیارم کرد، چونکە هەموو جارێ لەوێ دادەنیشت، بەڵام دەستمنەکەوت، لەبارەی مستەفا پاشاوە پرسیارم لە هەر کەسێك دەکرد، بە ترس و دڵەڕاوکێ و بەزەیییەوە سەیری دەکردم، دەیویست لە مەبەستی پرسیارەکەم تێبگا! چونکە نەیدەزانی ئەمەی لەبارەی ئەو دێو و دەعبایەوە پرسیار دەکات

کێیە؟ ئاخۆ چارەنووسی لە لای ئەو چی بێت؟.. ئاخۆ لە نێچیرەکانی بێت تا بەزەیی پێدا بێتەوە، یان لە یارمەتیدەر و پیاوکوژەکانی بێت تا لێی بترسێ؟!

لەو بگرە و بەردەیەدا، زانیم وا لە کێڵگەکەیدا لەسەر بان و بەرزایی گوندەکە.. ڕۆیشتم بەرەو ئەوێ و سەرکەوتم بۆ سەربانەکە، بێئەوەی ئاوڕ بە لای هیچ شتێکدا بدەمەوە هەتا چادرەکەی پاشام بینی. چادرێك هەبوو بۆ پێشوازیکردنی خەڵك، چوومە ژوورەوە!.. ئەوی تیادا نەبوو... بەڵکو خزمەتکارەکانی لەوێ بوون پێشوازییان لە میوانەکان دەکرد و جێگەی دانیشتنیان بۆ ڕێکدەخستن، ئەوە هەلێك بوو بۆ حەسانەوەم، تا ماندوویەتی سەفەرەکەم دەربچێت.. شمشێرەکەم بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی چادرەکەدا هەڵواسی، دیمەنی کۆنەی ئەوەی نەدەگەیاند مەترسی لێ بکرێت، زیاتر لە چەکێکی دێرینی دەکرد کە وەکو ئاسەوارێکی نەختینە هەڵبگیرێت، بەتایبەتی لە ڕۆژگارێکدا، قسە تەنها قسەی باروت و گوللە بێت!.. بۆ خۆم بە ئیسراحەت و ئاسوودەیی لەسەر زەوی دانیشتبووم و چاوەڕێی پاشام دەکرد و لە ڕووی بیر و جەستەوە هێز و توانای خۆمم جەم دەکرد!

لەناو چادرەکەدا خەڵکێکی کەم دانیشتبوون، چاوەڕێی پاشایان دەکرد، هەر کەسە بۆ ئەنجامدانی مەبەستێك.. سەرسامی و چاوەڕوانی پەردەی بەسەر ڕوخساری هەمووانـدا کێشابوو.. بۆئەوەی پەردەی بێدەنگی بدڕێنم، دەستمکرد بە قسەکردن لەگەڵ یەکێکیاندا، بەم جۆرە گفتوگۆیەك لە نێوان هەمووماندا گوزەرا، زۆری پێنەچوو هەموویان ناسیمیانەوە، چونکە مونازەرەکانم لەگەڵ زاناباندا کەسایەتیمیان وەکو شێوە داستانێك لێکردبوو!.. لە چاوەڕێکردنی دێوەکەدا! هەمووان بە بوونی من لە ناویاندا وەکو جۆرێك لە کات بەسەربردن ئاسوودە و دڵخۆش بوون!..

دواجار پاشا هات، هەمووان ڕاپەڕین و لەبەری هەڵسانەوە! بەڵام من بە تەنیا مامەوە و بە بێدەنگی لەسەر زەوی دانیشتبووم و لە جێگەی خۆم نەجووڵام! وەکو بڵێی هیچ شتێك ڕووی نەداوە! ئەو هەڵوێستەش لەبەرچاوی پادشای لوتبەرز و لەخۆبایی شاراوە نەبوو! بەڵکو بینیم ڕوخسارە زلەکەی گۆڕا و بە نیشانەی سەرسامی و تووڕەیی داپۆشرا..!

پاشان بە ئەوپەڕی لوتبەرزی و لەخۆبایی بوونەوە لەسەر کورسی پاشایەتییەکەی دانیشت، بە دەنگێکی بەرز، کە نیشانەی خۆ ئامادەکردنی بۆ جەنگ تیادا دەخوێنرایەوە، پرسیاری کرد لە یەکێك، ئەوەی دەدا بەگوێمدا و وتی:

- ئەمە کێیە؟

- گەورەم، ئەوە زانای بەناوبانگ "مەلا سەعیدە"!

جۆرێ لە شڵەژان و تێکچوونی بەسەرەوە دەرکەوت، چونکە وا دیاربوو پێشبینی ئەوەی نەدەکرد لەناو زانایاندا، کەسێك هەبێت بەو جۆرە سنگی لێ دەرپەڕێنێ.. هەوڵیدا کەمێك ڕق و تووڕەبوونەکەی قوتبداتەوە، پاشان ڕاستەوخۆ ڕووی کردە من و بە دەنگێکی بەرز کە بە گاڵتەزانین و سوك سەیرکردنی پێوە دیاربوو،

پرسیاری لێکردم:

- بۆچی هاتویت بۆ ئێرە..؟

چاوە زەق و دەرپەڕیوەکانی و، ڕەگی لاملی وەکو تیمساح ئاوسابوون!

بەجۆرێك لە هێمنی و لەسەرخۆیی کە متمانە بەخۆبوونێکی بەرزی دەگەیاند سەیرمکرد، تا زیاتر بیتۆقێنم و سەرکوتی بکەم، پاشان بە دەنگێك

کە هەناسەکەیم لە ناخەوە سەردەخست، وەك ئەوەی دەنگێك بێت و بۆ جیهانی گۆڕەکان بانگی بکات:

- هاتووم بۆئەوەی بانگت بکەم بۆ تەوبەکردن و ڕێی هیدایەت!..

گەردەلولەکان لە دەموچاوە گرژ و مۆنەکەی، دەیانگرماند، چەخماخەش هەردوو کوڵمە دەرپەڕیوەکەیی کوناودەر دەکرد و، فرمێسکی ڕق و تووڕەییش خەریك بوو سوورایی چاوە زەق و دەرپەڕیوەکەی بدڕێنێ، سمێڵە چڕەکانی لەسەر نەریتی پاشاکان چین چین شانەکرابوون، تێك چوون بەڵام چۆن تێکچوونێك..!

زۆر مۆڵەتم نەدا.. بەڵکو دەستمکردەوە بە خاڵیکردنەوەی تفەنگەکەم و، پەنجەم دەخستە سەر وشەکان بەڵام چۆن پەنجەخستنێك؟!

بەڵێ!.. بگەڕێرەوە بۆ لای خوا، ئەی پاشا! بگەڕێرەوە! واز لە ستەمکاری بهێنە! دەست بکە بە نوێژکردن..! بەچ مافێك یان بەچ شەرعێك، ئەو چەوساوانە دەکەیتە کۆیلە و ئازاریان دەدەیت؟

لە داخ و ڕق و تووڕەییدا کڵپەی ئاگر گەمارۆی دەموچاویدا و! ئەو تۆزە بیناییەش لە چاوەکانیدا مابوو دووکەڵ ئەویشی داخست!.. ئایا ڕاستە ئەمە ئەوە ئەم جۆرە قسانە دەبیستێت؟ و لە گەنجێکی وەکو ئەمەشەوە؟! چ نارێکییەك یان تێکچوونێك لە بوونەوەردا ڕوویداوە، هەتا ئەم هەژار و بچکۆلەیە پێی بوێرێ؟ بەڵام ئایا بۆچی بە گوللەیەکی دەمانچەکەی یان بە مشتێکی دەستی ئەم دەنگە ناساز و بێزارکەرە بێدەنگ ناکات؟ بۆچی بەپێی ئەو زەبر و زەنگەی کە پێی ناسراوە ڕەفتار ناکات؟ ئەی ئەوە چی لێقەوماوە؟.. خۆ لەوەو پێش خۆ بەزلزانین و لەخۆبایی بوونی ئەو، تا ئەو ڕادەیە مۆڵەتی بە کەس نەداوە! بەڵکو لەوەو پێش کەس نەیوێراوە بەرامبەر ئەو بەو جۆرە پێی

لێ ڕابکێشێ..! ئەوە نهێنی تێکچوون و شڵەژانەکەی بوو..! بۆیە نازانێ چی بکات؟ و چۆن ڕەفتار بکات؟

هەروەها ئەویش ناوی بەدیعوززەمانی بیستبوو.. ئەو زانا لاوەی کە کەس ناتوانێ گرەوی لێ بەرێتەوە و پێشبڕکێی لەگەڵدا بکات! داستانێکە عەقڵەکان لەدەستدەدا و، دڵ و ڕۆحەکانیش حەیران دەکات! بەڵام من بۆ؟ نە زانام و نە لەوبارەوە هیچ داواکارییەکم هەیە، کەواتە دەبێ چی زاڵی کردبێ بەسەر مندا؟

بۆ یەکەم جار پاشا هەستی بە کەمێك ترس کرد! ترسێك نەیدەزانی سروشت و هۆکارەکەی چییە! بەڵام بە هەموو ئەو پێوەرانەی کە ئەو دەیزانین خۆی بە بەهێزتر دەزانی، بەڵام.. ئایا جگە لەو پێوەرانە، پێوەری تر هەن؟ یان ئایا جۆرێکی تر لە هێز هەیە؟ یان تۆ بڵێی ئەم لاوە شێتە جادووی لێکردبێ؟!.. کەواتە دەبێ نەفەسی شەڕەکە کەمێك درێژەی پێ بدرێت، هەتا یەکەم جار سروشتی شەڕەکە ئاشکرا ببێت، چونکە لە بەرژەوەندی ئەودا نەبوو بوترێ پاشا، بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی کوشت، لە کاتێکدا ناوبانگی سەعید هەموو ئاسۆکانی داخستبوو! بەڵام هەرچۆنێك بووە، دەبێ بیکوژێت، بۆیە بەجۆرێك لە سنگ دەرپەڕاندن هاواری کرد و وتی:

- ئەی ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێی نەمکرد؟

ئەمەی پێ وتم و لە مەبەستەکەی تێگەیشتم، بۆیە بڕیارمدا مۆڵەتی نەدەم بیر لە هەڵهاتن بکاتەوە، یان هەلی نەدەم درێژە بە شەڕەکە بدات و، بڕیارمدا لە خولی یەکەمدا بجەنگم.. پاشان بە دوو چاوی دامەزراوەوە سەیرم کرد و بە هێمنی و لەسەرخۆیی یەکەم جارم و دەنگی دواترم، وتم:

- دەتکوژم!

ترس و لەرز دەوری چادرەکە و ئەوانەشیدا کەتیایدا بوون، هەمووان هەستیان بە خراپەیەك دەکرد، تۆ چوزانی ڕق و تووڕەیی پادشا لە چ سنوورێکدا دەوەستێت؟ و چەند کەس دەکوژرێن لە ئەنجامی ئەم سنگ دەرپەڕاندنە بەهێزە یان ئەم سەرکێشییە گەوجانەیە؟! ئەمە چ کارەساتێکە یان چ مۆتەکەیەکە؟! بێدەنگییەکی ترسناك باڵی کێشا بەسەر دانیشتواندا.. هەمووان دڵنیابوون لەوەی کۆتایی ئەم لاوە نزیك بووەتەوە! بەڵام لە دوای ئەوە دەربازبوون چۆن دەبێت لەدەست پاشا؟

بەڵام یەك کەس نەیدەزانی ئەو بە تەواوەتی شکستی هێناوە! تەنانەت هێزی ئەوەی تیا نەبوو قۆڵی بۆ سەرەوە هەڵبڕێ، پەنجەیشی نەبوو بیخاتە سەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەی، تەنانەت دەستی نەبوو مریشکێکی پێ بخنکێنی! ئاخۆ حاڵی چۆن بێت لە شەڕێکدا کاتێك لەبەردەم گەنجێکی بەهێز و زیرەکدا بوەستێت!؟ پاشا لەناخیدا تەواو ببوو بۆیە بڕیاری خۆ بەدەستەوەدانیدا، بەڵام بەجۆرێك لەبەردەم خەڵکیدا ئابڕووی بپارێزێ و لەنێو دانیشتواندا ناوبانگی لەدەست نەچێ!

لەوە زیاتر لەناو چادرەکەدا بەرگەی دانیشتنی نەگرت، بۆیە دەرپەڕییە دەرەوەی چادرەکە و جۆرێك لە ڕق و توڕەیی پیشاندا.. بەوە دەیویست تێکچوون و شڵەژانەکەی بشارێتەوە، دوای ئەوەی کەمێك لەناو فەزای بەرین و هەوای ئازاددا سووڕایەوە، تووڕەبوونەکەی هێور بووەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ ناو چادرەکە، پێش ئەوەی دابنیشێ، پرسیارەکەی پێشووی دووبارەکردەوە، وەك بڵێی بڕوای بەو وەڵامە نەکردووە کە دەستی کەوتبوو:

- بۆچی هاتویت بۆ ئێرە؟

- بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارەم دایەوە، ئەی پاشا!

پاشا ئاماژەی کرد، بۆ شمشێرەکەی مەلا سەعید کە بە کۆڵەکەی چادرەکەدا هەڵواسرابوو و بە گاڵتە و ڕابواردنەوە وتی:

- ئایا بەم شمشێرە ژەنگاوی و کولە دەمکوژی؟

یەکسەر لە مەبەستەکەی تێگەیشتم، دەیەوێ سەرچاوەی هێزەکەم تاقیبکاتەوە، ناخۆ جەستەمە یان چەکەکەم؟ گاڵتەی بە گەنجی و پیاوەتیم دەهات، لە بەرامبەر هێز و زەبر و زەنگی خۆیدا شان و شکۆ و مەترسی لاوێتی منی بە کەم دەزانی، بۆیە بە سنگ دەربەڕاندنێکی گەورەتر لەوەی ئەو پێشبینی دەکرد، وەڵامم دایەوە:

- لەڕاستیدا ئەم شمشێرە نابڕێت.. بەڵکو ئەوەی دەبڕێ دەستەکەیە! بەڵێ بەم دەستەم دەتکوژم! مشتم لەناو هەوادا لەبەردەمیدا ڕادەوەشان!

بۆ دەربازبوون لە شەڕەکە، جارێکی تر پیلانەکەی شکستی هێنا. پاشان لە چادرەکە هاتە دەرەوە و لە توڕەبووندا دەکولا!.. ئەو تا ئێستا بەرەنگاری هیچ زانایەك نەبووەتەوە، خۆیان لە شەڕی ئەو دەپاراست و لێی دووردەکەوتنەوە! نەنانەت ئەویش خۆی لەوان بەدووردەگرت.. بەڵام ئەوەتا ئەم زانا گەنجە خەریکە ناچاری دەکات دەستی بە خوێنی سوور ببێت!.. کێشەکە لەوەدایە ئەو زانایەکی ئایینی ئاسایی نییە، بەڵکو زانایەکی بەناوبانگ و ناسراوە! ئەو بەدیعوززەمانە.. بەڵکو داستانی زەمانەیە! بێگومان کوشتنەکەی هەراو هۆریایەکی بەرامبەر دەوروژێنێ و نارەحەتی و دەردەسەرییەکی گەورەی بۆ دروستدەکات! چووە ناو گێژاوێك لە تێڕوانین و دووبارە چاوپێداخشاندنەوە و چەندجار بیرکردنەوە و مەزندەکردن و هەڵسەنگاندن..!

پاش چەند ساتێك لە هاتن و چوون، وەستا، وەکو بڵێی شتێکی دۆزیبێتەوە، بەرەو چادرەکە گەڕایەوە، ڕاوبۆچوونی هاتە سەر فێڵێکی نوێ، بەڵکو ئەم فێڵە ئابڕووی بپارێزێت و لە ڕووبەڕووبوونەوەی لاوەکەش ڕزگاری بکات..

هاتە ژوورەوە بۆ ناو کۆڕەکە و بە دەنگی بەرز وشەکانی دەدا بەگوێی ئامادەبووانـدا:

- گوێ بگرە کوڕە! من تۆ تاقیدەکەمەوە! لەناو خەڵکی "جەزیرەی ئیبن عومەر"دا چەندین زانام هەیە، مونازەرەیەکت بۆ ڕێکدەخەم لەگەڵیاندا! ئەگەر هاتوو سەرکەوتی بەسەریاندا، ئەوا من بەڕاستی وەڵامی داواکەت دەدەمەوە، گەرنا، فڕێت دەدەمە ناو ڕووبارەکەوە! بەڕاستی فێڵێکی جوانە، دەربازبوونێکی زیرەکانەیە، زانست گەورەی بڕیاربەدەستانە.. زانایان ئەهلی حەل و عەقدن، لە هەموو حاڵەتێکدا ئەوان مەرجەعن! دیارە پاشا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ملی شۆڕکردووە، تۆ چوزانیت؟ ڕەنگە ئەوە پێشەکییەك بێت بۆ تەوبەکردنێکی ڕاستەقینە!.. سەیری سەرجەم ئامادەبووانم کرد، گشت چاو و گوێکان ڕوو لە من بوون، بە ئەوپەڕی ئارامگرتنەوە چاوەڕێی وەڵامدانەوە بوون.. وەکو بڵێی دەپاڕانەوە و دەیانوت: ئەی لاو چاوەڕێی چی دەکەیت؟ ئەم پێشنیارە سەخاوەتمەندانەیە پەسەند بکە! ئێمەش لەو کابوسە ترسناکە ڕزگار بکە!

لەڕاستیدا، منیش وام بە چاك زانی داواکارییەکەی پاشا پەسەند بکەم.. چونکە وام هەستدەکرد ئەرکەکەی منیش گەیشتووەتە مەبەست، زانایانیش قسەی خۆیان هەیە، هەموو ڕووداوێکیش قسە و باسی خۆی هەیە.. بەهەرحاڵ شەڕەکە هێشتا کۆتایی نەهاتبوو! پاشان بە جۆرێك لە ئارامی و لەسەرخۆیی تێکەڵ بە ئاوازی سۆز و میهرەبانی وتم:

- ئەی پاشا، من نالێم زاڵ دەبم بەسەر زاناکاندا و مافی ئەوەشم نییە بڵێم سەردەکەوم بەسەریاندا.. هەروەکو چۆن تۆ مافی ئەوەت نییە من بخەیتە ناو ڕووبارەکەوە! بەڵام ئەگەر توانیم وەڵامی پرسیارەکانی هەموو ئەو زانایانە بدەمەوە، ئەوکاتە من داوای تفەنگێکی "ماوزەر" لە تۆ دەکەم، بۆئەوەی ئەگەر بەڵێنەکەی خۆتت نەپاراست، خۆتی پێ بکوژم!

پاشا بێدەنگ بوو حەزیدەکرد کۆتایی بەم گاڵتەجارییە قورسە بهێنێت! پاشا ئاماژەی کرد بۆ ئامادەبووان تا بەرەو گۆڕەپانی مونازەرە بەڕێبکەون.

هەمووان بەرەو گوندەکە جووڵان، پاشا و دەست و پێوەندەکەیشی پێشیان کەوتبوون، ڕوو بە "خان بانی" شوێنەواری دێرین کەوتنە ڕێ، لەسەر ڕۆخی ڕووباری دیجلە، چونکە لەوێ مونازەرەکە دەبەسترا..

پادشا پیاوەکانی خۆی نارد بۆ لای زانا ناسراوەکانی شار، تا ئەوەی کێشەکەیان پێ ڕابگەیێنن. داوای لێکردن بە وردی پرسیاری زانستی هەڵبژێرن و، بەدوای بابەتە نامۆکانی زانستدا بگەڕێن! بەڵکو بتوانن متمانە و باوەڕ بگێڕنەوە بۆ خۆبەزلزانین و لوتبەرزی پادشای بریندار، ئەوە هەلی سڕینەوەی داستانی لاوە سەرکێشەکەیە لەناو خەڵکدا، چونکە کوشتن سزایەکی کەمە بۆ ئەو!

زاناکان لەنێوان دەیان کتێبدا سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و گەڕان بوون، هەر بابەت و پرسیارێکی سەخت و دژواریان لێرەو لەوێ دەکەوتە بەرچاو تۆماریان دەکرد!.. بەڵام لاوەکە داوای کرد شوێنێکی تایبەتی بۆ ئامادەبکەن، تا کەمێك بخەوێت و ماندووبوونی سەفەری دەربکات، ئەوەندە متمانەی بەخۆی هەبوو، خێرا چووە ناو خەوێکی قووڵەوە. ئەگەرچی هەڕەشە و گوڕەشەی زۆری بیستبوو،

بەڵام ئەو گوێی بە هیچکام لەو شتانە نەدەدا، هەرگیز بە بای خەیاڵیدا نەدەهات، چاوبگێڕێ بە هیچ یەکێ لەو کتێبانەی ئەوان دەیانکردنەوە و دایاندەخستن! چونکە ئەو گەورەترین کتێبخانەی لە زاکیرەیدا هەڵگرتووە، کە قوتابخانە و پەیمانگاکانی ئەو وڵاتە ناسیبێتیان؟! لەبەر ئەوە خەوت، وەك بڵێی پەیڕەوی قسەی شاعیری عەرەب دەکات، کە دەڵێ:

أَنَامُ مِلْءَ جُفُونِي عَنْ شَوَارِدِهَا　　　وَيَسْهَرُ الخَلْقُ جَرّاهَا وَيخْتَصِمُ

چەند کاتژمێرێك بەسەر پادشادا تێپەڕین، وەك تێپەڕینی سەدەکان، نوورسیش چاوەکانی کردەوە تا پێی بوترێ "کوڕەکە بەستراوە و، زاناکانیش ئامادەن و، پادشاش چاوەڕێی ئەنجام دەکات"، ئەمانە چەند ڕستە و دەستەواژەیەك بوون، ئەوەندە مانای ترساندن و تۆقاندنیان لەخۆدەگرت، بەس بوون بۆ سڕینەوە و لەناوبردنی هەموو ئەو زانیارییانەی پایەدارترین و جێگیرترین زانا لە زاکیرەیدا لەبەری کردبن!

لاوەکە بە هێمنی و لەسەرخۆیی هاتە ناویان، سڵاوێکی کرد و دانیشت، پیاڵە چاکانیش یەك لەدوا یەك بەسەر ئامادەبووندا دابەش دەکرا. بەڵام زاناکان لەبەر سەرقاڵ بوون بیریان بە لای چاوە نەبوو، چونکە هێشتا خەریکی هەڵدانەوەی پەڕەی کتێبەکان بوون، بە ئاشکرا شڵەژانیان پێوە دیاربوو، جارجار هەندێکیان شتێکیان دەچپاند بە گوێی هەندێکی تریاندا. بەڵام برادەرەکەی ئێمە بۆ خۆی بێخەم دانیشتبوو، چای دەخواردەوە و چاوەڕێی پرسیارەکانی دەکرد.. پرسیارەکان زۆر دواکەوتن..! بە گاڵتەوە پیاڵەی یەکێکیانی هەڵگرت و خواردیەوە بێئەوەی ئەو بە خۆی بزانێ! پاشان پیاڵەی دووەمیشی خواردەوە، ئەویش ئاگای لێ نەبوو و بەخۆی نەزانی، پاشان سێیەم و چوارەم، هەتا چای

هەموویانـی خـواردەوە، ئەوانیـش هێشـتا لەنـاو هەڵدانـەوەی پەڕەکانـدا نەهاتبوونـە دەرەوە!

هـەر هەموویـان بـێ ئاگابـوون لـەوەی لـە دەوروبەریانـدا دەگـوزەرا، تەنهـا یـەك کەسیان نەبێت، کـە لەوپـەڕی پلـەی بەئاگایـی و وریاییـدا بـوو! ئەویـش مسـتەفا پاشـا بـوو! ئـەو نەیـارەی کـە چاوەڕێـی ئەنجامـی ئـەو شـەڕەی دەکـرد، کـە هێشـتا دەسـتی پـێ نەکردبـوو! بێگومـان چاودێری ڕەوشـی کارەکانـی دەکـرد، دڵەڕاوکـێ و شـڵەژانی تونـدی زانـاکان و ئارامـی و لەسـەرخۆیی لاوەکـە و ڕەفتـارە ژێـر بەژێرەکـەی لەگـەڵ پیاڵـەی چاکانـدا لەبەرچـاوی پاشـا شـاراوە نەبـوو! بۆیـە بـە تووڕەییـەوە هـاواری کـرد:

- بەڕێزان! مـن کەسێکی خوێنـدەوار نیـم، بـەڵام وادیـارە لـە ئێسـتاوە لەبـەردەم "مـەلا سـەعید"دا شکسـتتان هێنـاوە! دەبینـم ئێـوە خۆتـان بـە هەڵدانـەوەی پەڕەکانـەوە سـەرقاڵ کـردووە و ئاگاتـان لـە خۆتـان نەمـاوە، ئەویـش بۆخـۆی دانیشـتووە و چاکانـی ئێـوە دەخواتـەوە! چاوەڕێـی چـی دەکـەن؟ لەبەرچـی دەسـتناکەن بـە مونـازەرە؟

ئـەوەی ڕاسـتی بـێ، چەنـد مانگێـك بـوو داسـتانی بلیمەتیـی بەدیعوززەمـان گەیشـتبووە گوێیـان وتۆقاندبوونـی! ئەگـەر داستانی پادشا نەبوایـە نەدەهاتـن بـۆ ئەم شـوێنە! خاوەخـاو و سسـتی نواندنیـان لـە هەڵدانـەوەی پـەڕەکان هۆکارەکـەی ئەوەبـوو نەترسـان بەدیعوززەمـان پرسـیارێك یـان چەنـد پرسـیارێکیان ئاڕاسـتە بـکات و بـەو هۆیەشـەوە هەمـوو تـەرازووەکان هەڵبگەڕێنـەوە، خـۆ ئـەوان چـاك ئاگایـان لـە کێشـەی بەدیعوززەمانـە لەگـەڵ پاشـادا،خۆ ئەگـەر لـە مونازەرەکـەدا بیدۆڕێنـن دەبـێ چ دەریایـەك، یـان چ وشـکانییەك بیانپارێزێـت لـە زەبـر و زەنـگ و سـزای پاشـا!؟

پێی وتم:

لە نهێنی سستی نواندن و شڵەژانەکەیان تێگەیشتم، بەزەییم پێیاندا هاتەوە، چونکە ئەوان لە منن و منیش لەوانم، نابێ لەبەردەم ئەم دێوە دڕندەیەدا ئیحراجیان بکەم! بۆیە بۆ دڵنیاکردنەوەیان وتم:

- بەڕێزان! من بڕیارمداوە هیچ پرسیارێکتان لێ نەکەم.. بەڵکو من لێرە بە فەرمانی خوا ئامادەم لەبەردەم ئێوەدا، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی ئێوە دەیکەن!

لەسەر ڕوخساری هەموویاندا کرانەوەم بەدی کرد..! پاشان دەستمکردەوە بە قسەکردن و وتم: کەواتە با دەست پێ بکەین! پاشا کاتێ زۆری بەدەستەوە نییە تا بەفیڕۆی بدات، ئومێدەوارین ئەم دانیشتنەمان ببێتە دەرگای خێر و چاکە...!

پرسیاری یەکەم دەستی پێکرد.. یەکێك بوو لە بەناوبانگترین وردەکاری و گرفتە ئاڵۆزەکان لە نێوان زانایان و قوتابییانی زانستدا.. پاشان پرسیاری دووەم و سێیەم هەتا گەیشتنە چل پرسیار لە وردەکارییەکانی زانست و گرێ کوێرە و گرفتە ئاڵۆزەکانی! بە زمانێکی پاراو وەڵامی هەموویانم دایەوە، هەروەکو کتێبێکی کراوە لەبەردەممدا بخوێنمەوە! بەڵام بە هەڵە وەڵامی یەکێکیانم دایەوە،کەچی هیچکام لە زاناکان لەوە ئاگادار نەبوون! بەڵکو نیشانەی ڕازیبوونیان پیشاندەدا و، دانیان دەنا بە دروستی ئەو وەڵامانەی دەموتن! هەتا ئەوکاتەی مونازەرەکە کۆتایی هات و زانا بەڕێزەکان ویستیان مۆڵەت وەربگرن و بڕۆنە دەرەوە، ڕامگرتن و وتم:

- ببوورن بەڕێزان! لە وەڵامی فلانە پرسیاردا بەهەڵەدا چووم، بەڵکو وەڵامە

ڕاستەکە وەها و وەهایە..! لە پێشتر زیاتر شڵەژانیان پێوەدەرکەوت، جگە لە دانپێدانان و خۆبەدەستەوەدان، چارەیەکی تریان نەبوو! ئاگادارم یەکێکیان غیرەت گرتی و داوای هاوڕێیەتی لێکردم، تاکو لەو ڕێیەوە زانستی دەست بکەوێت!

هەرچی مستەفا پاشایە، ئەم مونازەرەیە بەس بوو بۆئەوەی لوتبەرزی و لەخۆبایی بوونی تێکبشکێنێت، تەنانەت وای لێهات لە کۆتایی پرسیارەکاندا جاروبار بە جۆرێك لە سۆز و بەزەیی و پشتگیری لێکردن سەیری دەکردم! هەتا کاتێك مونازەرەکە تەواوبوو و برادەرەکانی چوونە دەرەوە، بە ڕوخسارێکی گەشەوە دەم بەخەندەوە هات بۆ لام، پاشان "ماوزەر"ەکەی لەسەر شانی داگرت و پێشکەشی کردم:

- ئەمە خەڵاتی منە بۆ تۆ ئەی بەدیعوززەمان! ببوورە.. ئێستا ڕاستی قسەکانتم بۆدەرکەوت، لەڕاستیدا تۆ زانایەکی ڕاستەقینەی، ئەو کارەی پێی هەڵدەستیت، دینەکەت فەرمانت پێ دەکات! بێگومان تۆ شایستەی هەموو ڕێزێکیت..! من بەڵێنت پێدەدەم لەم ساتەوە تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە بۆ لای خوا و دەست بە نوێژەکانم بکەم! دیوەزمەکە بە سەلامەتی کۆتایی هات... ئەوە ێتاییەکی باش بوو، سوپاسی خوام کرد لەسەری!

دوای ئەم ڕووداوە، مانەوەم لە شاری "سەعرەد"و دەوروبەریدا بەلاوە سەخت بوو، چونکە ئاگری ئێرەیی بردن و حەسوودی لە لای قوتابیانی زانست و هەندێك لە زانایان - خوا ڕەحمیان پێ بکات- گڕی گرت و، هەندێك عەوامیش بە پیرۆزیان دەزانیم و بۆ تەبەروك دەوریان لێ دەدام.. بۆیە بڕیاری ڕۆیشتنمدا..!

تەمەنم لەو کاتەدا نزیکەی پانزە ساڵان دەبوو، لە حاڵی خۆم بێزار بووم، دەستەم هەڵی نەدەگرتم، لە هیچ شوێنێك ئارامم نەدەگرت و جێم نەدەبووەوە.. لە

نێوان سەعرەد و بەتلیس و شیرواندا دەستمکرد بە هاتووچۆ.. هەتا بۆ دواجار لە تیللو گیرسامەوە.. لەوێ شێتیی زمانی عەرەبی دای لە مێشك و ژیریم، چونکە لەگەڵیدا کار و فرمانێکم هەبوو..!

بە لەبەرکردنی "قاموس المحیط"ی فەیروز ئابادی دەستم کرد بە تیمارکردنی گەرمی و تای نوێی دڵم هەتا گەیشتمە پیتی"سین"..! لەوێ جۆش و خرۆشی حەز و ئارەزووی لەبەرکردنم خاو بووەوە و گەڕامەوە بۆ میزاجی هێمن و ئارامی جارانم..! سەرنجمدا خاوەنی"قاموس المحیط" مانا جۆراوجۆرەکانی هەریەکێك لە وشەکان دێنێت، منیش ئەوە هات بە بیرمدا بە پێچەوانەی ئەم ئاڕاستە و شێوازەوە فەرهەنگێك دابنێم، واتە ژمارەی ئەو وشە جۆراوجۆرانە بهێنم کە ئاماژە بۆ تەنیا واتایەك دەکەن، بەڵام بە هەمان شێوەی پێشوو ئەم خولیا و ختوورەیە سارد بووەوە و نەما..!

پاشان ڕۆشتم بۆ "ماردین"، لەوێ چاومکەوت بە دوو قوتابی، یەکێکیان قوتابی سەید جەمالەدینی ئەفغانی بوو.. ئەوی تریان لە پەیڕەوانی تەریقەتی سنوسی لیبی بوو، بەهۆی ئەو دوو قوتابییەوە شارەزای بەرنامە و پرۆگرامی سەید جەمالەدینی ئەفغانی بووم لە بەخەبەرهێنانەوەی ئوممەت لە خەوی بێئاگایی، هەروەها تەریقەتی سنوسی لە ڕۆحانیەتە جیهادییەکەیدا، تەنها چەند ئاماژەیەك بوو، بەڵام بە لای منەوە بەس بوو، بۆ بەئاگاهێنانەوەی مانایەکی نوێ لە دەروونمدا و چەسپاندنی وێنەی داهاتوو لەسەر دڵم و کێشانی نەخشەی کەسایەتی داهاتووم.

## بەسەرهاتێکی تر: نەزەری حەرام نهێنیی زانا پایەماڵ دەکات..!

لەسەر پێداگریی زۆری "عومەر پاشا" بە -ڕەحمەت بێ- و خۆشەویستی لە ڕادەبەدەری بۆ زانست و زانایان، دوو ساڵ لە شاری "بەدلیس" لە ماڵی ئەواندا مامەوە، لە نهۆمی سەرەوەی خانووەکەیدا ژوورێکی تایبەت کردبوو بە من. شەش کچی هەبوو، وەکو پاشتر زانیم: سیانیان بچووك بوون، سیانیشیان باڵغ و گەورە بوون.. هەرچەندە من بەدرێژایی دوو ساڵ لە خانوویەکدا لەگەڵیان ژیام ، کەچی سێ کچە گەورەکەیانم لەیەکتر جیانەدەکردەوە، چونکە هەرگیز سەیرم نەدەکردن و سەرنجم نەدەدان، لەکاتێکدا من گەنجێکی تازە پێگەشتوو بووم! هەتا ئەوە بوو ڕۆژێکیان زانایەك بە میوانی هات بۆ لام، لە ماوەی تەنها دوو ڕۆژدا هەموویانی ناسی و لەیەکی جیاکردنەوە! ئەوانەی دەوروبەرم لەم کارەی من سەرسام بوون، لەبەرئەوەی من کچەکانم نەدەناسی! ئەوەبوو پرسیاریان لێکردم:

- تۆ لەبەرچی سەیریان ناکەیت؟ ئەو وەڵامەی کە لە خۆوە هاتە سەر زمانم ئەمە بوو:

- پاراستنی ڕێز و شکۆی زانست ڕێی نەزەری حەرامم لێ دەگرێ..!

ئەوە دیمەنێك بوو لە ژیانی خۆمدا بینیم: سوپاس بۆ خوا چاوەکانم لە حەرام پارێزران! بۆیە -بە فەرمان و ویستی خوا- ڕۆحم بەرزبووەوە، تا ئەو ڕادەیەی خوا دەرگای نهێنیی لەبەرکردن و تێگەیشتنی ڕاستییەکانی زانستی

لێکردمـەوە! لـە بەرەکـەت و پیرۆزیـی ئـەو نهێنیـەوە لـە مـاوەی سـێ مانگـدا ڕاستییەکانی نەوەد کتێبم لـە دڵمدا خەزنکردن، واتـە ڕۆژانـە سێ سـەعات لـە خەزنکـردن و خوێندنـەوە.. لـەوەو دوا لـە زاکیـرە و حافیـزەی خۆمـدا هەرچییەکم دەویسـت دەرم دەهێنـا، چۆنـم دەویسـت و کـەی دەمویسـت.. ئێستاشـی لەگەڵـدا بێت زاکیـرەم زۆر بـە چالاکی و هێزەوە هەرچییەکم چاوپێکەوتـووە و بیستووە، وە هەرچییـەك لـە بەردەممدا دەرکەوتـووە، لـە وێنـە و واتـا و دەنـگ، هـەر هەمـووی ئامـادە دەکات و دەیهێنێتـەوە یـاد.. هەروەکـو شـریتێکی سـینەمایی ئامادەکـراو، هەرکاتێك بانگم لێکردبێت وەڵامـی داومەتـەوە! ئـەوە حاڵـی مـن بـووە بەدرێژایـی تەمەنم، کـە خۆی دەدات لـە هەشتا ساڵ وەکو دەبینی !.. لەبەر کارێکی تایبەت خوا لـە بەهـرەی خەتخۆشـی بێبەشـی کـردم، بـە زەحمـەت نەبێت، ناتوانـم بنووسم! تۆ بۆت هەیـە بـە مـن بڵێی تـۆ لـە خـەت و نووسـیندا کەسێکی نەخوێندەواری! لەڕاستیدا پاشتر بینیم ئـەوە چ بەهرەیەکـی مـەزن بـوو، چونکـە ئەگـەر بمزانیایـە بـە جوانـی بنووسـم، ئـەو مەسـەلە و بابەتانـە بـەو جـۆرە سـەیر و سەرنجڕاکێشـە لـە دڵمدا جێگیـر نەدەبـوون! و لەبەرئـەوەی دڵـم پڕبـوو لـە حـەز و تاسـە بـۆ فێربوونـی زانسـت، و لەبەرئـەوەی هەسـتم بـە بـێ بەشـی دەکـرد، لـە خەتخۆشـی و نووسـینی دروسـت، دەسـتم بـە خوێندنـەوەی هـەر زانستێك دەکـرد لەسـەر لاپەڕەکانـی ڕۆحـم دەمنووسـیەوە. ئـای! چەنـد ئـازار و ناخۆشـی هەیـە، کەچـی لـە دووتوێیـدا بەهـرە و نیعمـەت و خۆشـی هەڵگرتـووە.. ئـەوە لـە منـەوە و بـە دەسـتی مـن نەبـوو.. بەڵکـو قەدەرێك بـوو لەبـەر حیکمەتێکـی خوایـی بـەرز و بـاڵا بـەرەو لای مـن درایـە بـەر، یـان مـن بـەرەو لای ئـەو درامـە بـەر.

## شێتیی زانستە هاوچەرخەکان

ئـاگادار و شـارەزای ئـەو پلانانـە بـووم کـە دوژمنـان دژی ئوممەتـی ئیسـلام دایـان دەرشت.. دڵنیابـووم لـەوەی شێوازە کۆنەکـەی زانسـتی کـەلام کەموکورتـە و ناتوانێ بەربەرچی ئـەو گومـان و دوودڵییانـە بداتـەوە کـە ئەمڕۆ بـەدەوری ئاینـدا چنـراون، هەربۆیـە ڕەشـەبای چوونـە نـاو زانسـتە نوێـکان، لـە دڵمدا هەڵیکـرد..! لەبـەر ئـەوە دەسـتمکرد بـە ماشـینەوەی ئـەو زانسـتانەی دەهاتنـە ڕێم..! لـە مێژوو، جوگرافیـا، بیـرکاری، جیۆلۆجیـا، فیزیـا، کیمیـا، فەلەکناسـی، فەلسـەفە...هتد، هەتـا لـەو زانسـتانەدا، بناغـەیەکی گشـتی وتێڕوانیـن و تێگەشـتنێکی گشـتگیر و تـەواوم بـۆ دروسـتبوو، بەپێـی ئـەوەی خەڵکـی فێـری دەبـوو، بەرنامەڕێژییـان بـۆ دەکرد، مـن لـە ماوەیەکـی زۆر کورتـدا ئـەوە فێربـووم، ئەمـەش لەسـەر بـاو و نەریتـی ڕۆحیـی خۆم بەبێ فێرکار و مامۆستا، بەڵکو لـە ڕێژنـەی فتوحاتـی خواییـەوە دەڕژا بەسـەر ڕۆحمدا، هەمیشـە دواتـر کـرۆك و ناوەڕۆکـی ئـەو کارەم دەزانـی!

لـە مـاوەی بیسـت و چـوار کاتژمێـردا کتێبێکـی جوگرافیـام لەسـەر پـەڕەی دڵ لەبەرکرد، پێش ئـەوەی لـە ماڵـی والـی "تاهیـر پاشـا"دا بـۆ ڕۆژی دوای ئـەوە لەگـەڵ مامۆسـتایەکی جوگرافیـادا مشـتومڕ و گفتوگـۆی لەسـەر بکـەم و بـە بەڵگـەش مامۆسـتاکە ببەسـتمەوە! بێبـاوەڕی و ئیلحـادی ڕەشـیش دەسـتی کردبـوو بـە بڵاوکردنـەوەی تاریکییـە ترسـناکەکانی لەسـەر زەویـدا.. ئـەو زانسـتە نوێیانـەی

کە خوێندبوومەوە بەس بوون بۆ ئەوەی ئاسۆی چوونە ناو جیهانی سەردەمی نوێم لێ بکەنەوە، بەڵام ئەوەی کە لە کار و فرمانی بەدیعوززەمانەوە بوو، لە دەروازەی مەزنی قورئانەوە بووە! کوڕی خۆم من جگە لەوەی بەندەیەك بووم، خوا تەنها بە فەزڵ و چاکەی خۆی لە خزمەتی پەیامەکانی نووردا بەکاری هێنام، هیچی تر نەبووم..! چونکە نهێنیی هەموو لێدەرکەوتن و درەوشاوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی ئەو ئیخلاسەی کە لە هەناوی مەبەستی خزمەتدا هەیە! ئەوەیە کوڕی خۆم سەرنج بدە و بیر بکەوە..!

پاشان سەری دانەواند و بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو.. کتوپڕ بەلەمە بچکۆلەکەی لەسەر ئاوی دەریای بۆسفۆردا بە توندی کەوتە جووڵە و لەرینەوە. شەپۆلەکانی ئاوەکەش بە توندی بەری دەکەوتن!.. بە ترس و سەرسوڕمانەوە سەیرمدەکرد و، وام دەزانی ژێرئاو دەکەوێ..! چاوەکانم کلۆفاند، هەتا ئەو پەردەیەی بەسەریانەوە بوو لای بدەم.. وانەکانی دانایی و حیکمەت مەزنتر بوون لەوەی خۆم بە تەنیا بەرگەی درەوشانەوەکانیان بگرم..! لەگەڵ ئەوەشدا وتم: گەورەم زیاترم دەوێ! زیاترم دەوێ! خێرا بە پەنجەی ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان، و..

بەلەمە بچکۆلەکە بەیانی بەسەردا هات و، لەپڕ لە قسەکردنی ڕەوان بێدەنگ بوو! دەرکەوتن و درەوشانەوەکەش لە بەردەممدا بەرزبووەوە و نەما.. پاشان دەنگی بانگ لە منارەکانی ئەستەمبووڵەوە لە هەموو لایەکەوە هەڵبڕا.. و لەگەڵ شەپۆلی درەختەکاندا چوومە ناو ڕیزی نوێژەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو هەتا پەردەی ڕۆژ سەرلەنوێ دابەزییە سەر شارەکە.

* * *

پاشان چەندەها شەو و ڕۆژ گوزەریان کرد، نەمزانی چەند ڕۆژگار، و یان چەند سەردەم بەسەریاندا تێپەڕبووە.. منیش شەو لە دوای شەو پێشبینی و چاوەڕێی دەستکەوتن و درەوشانەوەی نوێم دەکرد، بەڵام بێ سوود بوو..! بەفر خانووەکانی شارەکەی داپۆشی بوو، تارای سپی دابوو بەسەر هەموو شتێکدا، گومەزی مزگەوتەکان، درەختەکان، هەندێك لە ڕێگا و بانەکانیشی داخستبوو، ڕەشەبا و سەرماوسۆڵەیەکی توند هەڵی دەکرد و ڕێگا و شەقام و کۆڵانەکانی پڕ دەکرد لە شەختە و بەندان، لەبەر ئەوە جوڵە و هاتوچۆ و ڕۆیشتن زۆر هێواش بوو..! بەدرێژایی ئەو ڕۆژە زستانییە ترسناکە منداڵانی قوتابخانەکان لە ماڵەکانیان نەدەهاتنە دەرەوە..! منیش لەپشت پەنجەرەی قوتابخانەی نوورەوە لە "گەڕەکی فاتیح" سەیرم دەکرد .. کاتەکەش بەرەو خۆرئاوابوون دەچوو.. ئەسپەکانی شەویش لە دەرگادا وەستابوون و دەیانحیلاند.. گوێم لە دەنگێکی نزم بوو، خێرا یەکێك لە قوتابییانی نوور ڕۆیشت دەرگاکە بکاتەوە، بەڵام هەندێك بۆڵە بۆڵم لێ بیست، پاشان گەڕایەوە، بێ ئەوەی کەس لەگەڵیدا بێتە ژوورەوە! دووبارە گوێم لە تەقەی دەرگا بوو ، قوتابییەکەش بە پەلە چوو بیکاتەوە بەڵام بە تووڕەییەوە گەڕایەوە دواوە و کەسیش لەگەڵیدا نەهاتە ژوورەوە! هەروەها بۆ جاری سێیەمیش تەقەی دەرگا هات، زۆر سەیرە..! ئەمە چ نهێنییەکە؟ هەستێك زۆری بۆهێنام زیاتر لە ترس دەچوو.. ترسێکی تێکەڵ بە لێشاوی حەزێك بۆ زانینی نهێنیی تەقەکان! بۆیە مۆڵەتم لە قوتابییەکە وەرگرت هەتا دەرگاکە بکەمەوە.. بە جۆرێك لە حەزکردن بە سنگ دەرپەڕاندن، هەڵسامەوە و بە توندی دەرگاکەم کردەوە.. ڕەشەباکە زۆر بەهێز بوو، کزەباکە زۆر لەوە توندتربوو بتوانم دەرگاکەی بەڕوودا دابخەم..! وەکو کەسێك هاوار و دادوبێداد بکات سەیری ناوەوەی قوتابخانەکەم کرد، بەڵام کەسم بەرچاونەکەوت..! تووڕەیی

ڕەشەباکە زیادی کرد، لەبەر ئەوە خۆم پێ نەگیرا ئەوە نەبێ خۆم ڕادەستی شەپۆلە بەهێزە ڕامالەرەکەی بکەم، لەگەڵ ڕەشەباکەدا ڕۆیشتم..! نازانم ئاڕاستەی گەردەلوولەکە بەرەو کوێیە و کەی لەنگەر دەگرێ..! هەتا خۆم لەسەر چیایەکی بەفریندا بینییەوە و لەنێوان حاڵەتی بێهۆشی و بەئاگابووندا ئەم دیو و ئەودیوم دەکرد، چیایەك بە تەواوەتی خۆری لێ ئاوابوو و ئەستێرەی شەوی نیشتبووە سەر.. درەختەکان و هاوشێوەکانی لە هەموو لایەکەوە دەورەیان دابووم.. ورده ورده هەستمدەکرد بە دەست و پێ و ئەندامەکانی جەستەم هەر لە تەوقی سەرمەوە هەتا پاژنەی پێم، دڵنیابووم لە سەلامەتی هەموو ئەندامەکانی جەستەم، پاشان هەوڵمدا هەڵبستمەوە، بەڵام نەمتوانی..! هەر تەنها چەند چرکەیەکی پێچوو، هەتا هەستمکرد هێزێك لەناو درەختەکاندا ڕامدەکێشێ تا خۆم لە دامێنی چیاکەدا بینییەوە، ئەو شوێنە لە تەختاییەوە نزیك بوو، کتوپڕ لەنێو درەختەکاندا دیمەنی کوخێکی بچکۆلەم لێ دەرکەوت و، ڕووناکییەکی کزی وەکو ڕووناکیی مۆمی لێ دەردەچوو، هەستم کرد گەرمای ژیان بە توندی لە جەستەمدا هەڵدەقوڵێ.. هەڵسامەوە و خێرا بە وریاییەوە چوومە ناو کوخەکە و داوای ئەمانم کرد.. کەسم دەستنەکەوت.. بەردەوام ڕووناکیش لەنێوان توێکڵ و لقەکاندا دەردەپەڕی! حەسیرێکی کۆنم بینی وام دەزانی شوێنی زیکر یان نوێژکردنە، نوێژم هاتەوە یاد، پاشان تەکبیری نوێژدابەستنم کرد: اللّٰه أکبر، پاشان خوێندنی سورەتی "النور"م بەسەردا هەڵهات و دەستمکرد بە خوێندنەوەی.. لەپڕ لە هەموو شوێنێکەوە نوور بە توندی هەڵدەقولا..! بینیم شێوەی کوخەکە وەکو جوانترین کۆشك و بەرزترین شورا و گومەز لە بەردەممدا دەدرەوشێتەوە! تەزووی ئارامی بە جەستەی بیمارمدا هات، بووە شیفایەکی بەپەلە و مەڵهەمێکی جوان: پڕشنگدان و درەوشانەوەکانیش سەرلەنوێ دەستیان پێکردەوە..!

پاشان سەلامم دایەوە.. بینیم لە لای ڕاستمەوە لەسەر بەشێکی حەسیرە کۆنەکەدا دانیشتووە و پاڵیداوە بە داری کوخەکەوە.. وەکو ئەوەی خەریکی ویردەکانی بێت.. بێئەوەی وشەیەك بەدەممدا بێت، زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆیی ڕێك دانیشتم و ڕووم تێکرد..!

پێی وتم: دەتگەڕێنمەوە بۆ ساڵی ١٨٩٩ی زایینی، هەروەها لە سنووری ئەو تەمەنەی کە ئێستا تۆی تێدا دەژی، پەنجا ساڵی تر دەتبەم بەرەو پێشەوە، هەموو ئەمەش لەپێناو وانەی حیکمەت و ژیریدا، لەبەر ئەمە خەمت نەبێ! بێگومان زەمەن لەو ڕووەوە کە جووڵەیەکی بەش بەش کراوە لە بەرچاوی ئێمەی نەوەی ئادەمدا نەبێت حەقیقەتی نییە، ئەگینا زەمەن ڕاستییەکی گەردوونییە و هەر لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی بەیەك درێژبوونەوە کشاوە.. خۆ ئەگەر بیهێنیتە پێش چاوی خۆت دەبینیت تەنیا پارچەیەکە، یان بەدیهێنراوێکە لە بەدیهێنراوەکانی خوا و، کەسایەتییەکی تەواو و یەکەموکورتییە، ئێمەش بەپێی ئەندازەی تەمەنی خۆمان، پەی بە چەند بەشێکی زۆر بچووکی دەبەین.. لەبەر ئەوە، ئەگەر بە هەر ناڕاستەیەك خۆت بتەوێ ڕابردوو یان داهاتوو، تەقە لە دەرگای بدەی ئەوا شتی زۆر سەرنجڕاکێش و سەیروسەمەرە دەبینی! بەڵام لەڕاستیدا پێویستیت بە هەندێك ڕوونی و بێگەردی هەیە بۆئەوەی بیبینی..! چونکە کەسێك نووری نەبێت هیچ شتێك نابینێ!

## مەقامی تاقیکردنەوە

## ڕەنج و مەینەتییەکانی "سەعیدی کۆن"..!

ئەوە لەساڵی ١٨٩٩ی زایینیدا دەستی پێکرد، ئەو ساڵە لە ژیانی من ئاڵوگۆڕێکی مەزن بوو، تەمەنم نزیکەی بیست ساڵان بوو.. لەو ساڵەدا بەرەو قورئانی پیرۆز ڕووم وەرچەرخاند و کردمە قیبلەی جیهادی خۆم.. لەو کاتەدا لە بایەخدان بە زانستە جۆراوجۆرەکانی تر دەستم بەتاڵ بووەوە و، خۆم یەکلا کردەوە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستەکانی قورئان و بەس! ئەوەبوو لە ماڵی "تاهیر پاشا" -بە ڕەحمەت بێت- ئاڵوگۆڕێکی دەروونیم بەسەردا هات، چونکە لەوەوە زانیم ئەورووپا خەریکی داڕشتنی پلانێکی چەپەڵە دژی قورئانی پیرۆز، تاهیر پاشا ئەو هەواڵەی پێدام، کە ڕۆژنامەکان لە هەموو لایەك بڵاویان کردبووەوە و، تیایدا وتە بەناوبانگەکەی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانی "ولیەم گلادیستۆن" هاتووە، کە دەڵێ: "هەتا ئەم قورئانە بەدەست موسڵمانانەوە بێت، ئێمە هەرگیز ناتوانین بە تەواوەتی دەستیان بەسەردا بگرین و حوکمڕانییان بکەین، کەواتە دەبێ هەوڵ بدەین ئەو قورئانەیان لە دەست بسێنین و دایانبڕین لێی!" ئا لەوێدا هەژان و هەڵچوونێکی وام بەسەردا هات، توانام بەسەریدا نەبوو! ئەتوت لە منەوە نییە و لە کرۆکی ڕۆحی منەوە نییە.. وەکو بڵێی چەند هەورە بروسکەیەکە لە چەخماخەی ناوەکانی جەلال و مەزنیی خواوە لێم دەدات.. وای لێکردم هەموو

ئاڕاسته و بۆچوونه فیکرییەکانم لە بەدەستهێنانی زانست و فێربووندا بگۆڕم و، هەموو ئەو زانستە جۆراوجۆرانەی کە لە زەینمدا خەزنم کردبوون، وەکو پەیژەیەك بەکاربهێنم بۆ گەیشتن بە زانین و پەیبردن بە واتاکانی قورئانی پیرۆز و، ڕاستییە ئیمانییەکانی بسەلمێنم بۆ خۆم و بۆ کەسانی تریش.. و لە دوای ئەوە لە زانست و کارەکەمدا و لە ئامانجی ژیان و بانگەوازەکەمدا جگە لە قورئان هیچ مەبەستێکی ترم نەبێت و، موعجیزەی مەعنەویی قورئانی پیرۆزیش لەمەدا بووە چاوساغ و ڕابەرم.. بەڵێ، بێگومان نزیکەی نەوەد کتێب کە پێشتر لەبەرم کردبوون، بوونە پەیژە و پلیکانە بۆ سەرکەوتن و گەیشتن بە ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز.. هەر کە گەیشتمە لێوارە بەرزەکانی، بینیم هەموو ئایەتێك لە ئایەتەکانی دەورانـدەوری گەردوون دەدات و لە خۆی دەگرێت..! سەیرە لەڕاستیدا قورئانی پیرۆز هیچ پێویستییەکی منی نەهێشتەوە، تا جگە لە خۆی بگەڕێمەوە بۆ سەرچاوەیەکی تر! تەنانەت بەهۆی ئەو دڵنیایی و یەقینە قورئانییەوە کە پێی گەیشتبووم، بە هەر کەسێك کە لە ڕێگەی نووردا پێم دەگەیشت دەموت ”دەبێ بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنم قورئان خۆرێکی مەعنەوییە و هەرگیز تیشك و ڕووناکی ئەو خۆرە کز نابێت و بە کەس ناکوژێتەوە!“ نزیکەی حەوت ساڵ بوو لە دەروونی خۆمدا لەو ڕاستییەدا دەژیام! ڕاستەوخۆ لە قورئانەوە وانەی نوور و ڕاستییەکانی ئیمان فێر دەبووم.. پاشان لە زاکیرەی خۆمدا ئەوەم خەزن دەکرد، تا ئەو کاتەی خوا مۆڵەتی وادەی هەڵهاتنیدا! بەڵام لەبەرکردنم بۆ زانیارییەکان بەپێی بەرنامە و ڕێبازی "سەعیدی کۆن" بوو، کە لەسەر مشتومڕی دەم و ململانێی سیاسی ڕاوەستابوو.. لێرەدا پاش ئەو ماوەیە لە خەزنکردن و کۆکردنەوەی زانیارییەکان، ئەوە بە دڵمدا

هات خۆم یەکلا بکەمەوە بۆ کارکردن بە بانگەوازی قورئان، بچمە دەرەوە بۆ ناو خەڵك.. بۆیە ئەوەم بەبیردا هات بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە مەزنە باروبنەی خۆم بپێچمەوە و بچم بۆ ئەستەمبووڵ. ئەوەش لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵیمدا بوو..!

وا دەهاتە پێش چاوم تارمایی و دێوەزمەکانی تاریکی یەکەم جار ئەستەمبووڵ داگیر دەکەن! لەبەرئەوەی ئەستەمبووڵ لە ئێستادا سەری ئوممەتە و پردی پەڕینەوەیە لە جیهانی ئیسلامییەوە بۆ ئەورووپا.. هەتا ئێستاش منارە و گومەزەکانی ئەم شارە دێرینەیە شایەتی دەدەن لە سەر زیندوویەتی ئیسلام بە هەمیشەیی و ڕوانینی بەسەر ئاسۆکانی خۆرئاوادا بۆ هەتا هەتایە..! ئەوەتا "ئاڵای هیلال" بە سەری بەرزەوە لەسەر سنوورەکانیدا دەشەکێتەوە..! ئاڵاوی ئەو تێکشکانە ناخۆشەیان لەبیرناچێتەوە کە -ئەمیری دەریا و ڕووبارەکان- و وەرگێڕ و پیادەکەری فەتحی پێغەمبەرایەتی و سوڵتانی ڕزگارکەر: محمد فاتیح -بە ڕەحمەت بێت- لەسەر بۆسفۆری ئەو شارە، بەسەریدا تۆمارکردن..! داستانەکە هەمووی لەوێیە.. خۆ ئەگەر ئەستەمبووڵ بکەوێت و داگیربکرێت، هەموو شتێك لەم جیهانەدا دەکەوێت و لەدەستدەچێت! بۆیە چار نییە دەبێ بڕۆم ! پاشان بەبێ دەنگی سەیری کردم و وتی: سەیری ئەوێ بکە! بەدەست ئاماژەی کرد بۆ کەلێنێك، کە لە دیواری کوخەکەدا هەبوو و ڕووناکییەکی کزی لێوە دەهاتە ژوورەوە.. سەرم هەڵبڕی لەپڕ چاوەکانم پڕبوون لە نوورێکی جوان، و.. سوار چاکەکەم بینی، سواری ئەسپی ڕەشەبا بوو، وەکو بروسکە ڕۆیشت و لای نەکردەوە بەلای کەسدا..!

......................

پێی وتم:

هەموو دەروازەکان داخرابوون! ڕێگەی پەڕینەوە نەبوو.. شورا کۆنەکانم دەبینی دەجوولاَن، هەر کاتێك یەکێك لێیان نزیك دەبووەوە، بە جوولەیەکی ترسناك دەکشان و بۆ سەرەوە بەرزدەبوونەوە، تەنانەت ڕێیان لە هاتنە ژوورەوەی نوور دەگرت و، بەریان بە تیشکی خۆر دەگرت بگاتە گومەز و دەرگاکان! هەموو شتێك لە تاریکاییەکی نوتەکدا دەژیا! شەمشەمە کوێرەکان بە تەنیا ئەو دەورویەرەیان پڕکردبوو! کەمێك گەڕامە دواوە، لە سەر لێواری لای ڕاستی بۆسفۆر خەڵکانێکم دەبینی هەوڵیان دەدا بزانن ڕێگای هاتنە ناوەوەی شارەکە لە کوێوەیە.. پرسیارم لە یەکێکیان کرد وتم: چرات پێیە؟.. خێرا وەڵامی دامەوە و وتی چاوەڕێی هەڵهاتنی خۆر دەکەین! وتم: هاوار بۆ تۆ، ئەمە زەمەنی گیرانی خۆر و مانگە ! هەر کەس خوا نوورێکی پێ نەبەخشێت هیچ نوورێکی دەستناکەوێت..! پرسیارەکەم دووبارە کردەوە و وتم: ئایا چراتان پێیە؟ وتیان: نەخێر..! وتم: کەواتە بانگ بدەن..! وتیان بانگی کەی؟! وتم: بانگی کاتی بەلاَ و نەهامەتی! دەنگی بانگ بەرزبووەوە و هەر لە بۆسفۆرەوە هەتا مەرمەرە، پەردەی ئاسۆکانی دەدڕی.. سەرلەنوێ خۆر هەڵهات و شاری خەمەکانی ڕووناك کردەوە! پاشان دەرگای دەروازە مەزنەکان خرانە سەرپشت.. و لەدەست تارماییەکانی تاریکی دەرچوو! بەڵێ کوڕی خۆم..! ئەستەمبووڵ هەرگیز دەرگاکانی خۆی لە ڕووی بەندەکانی خوادا دانەخستووە، ئەگەر ئامادەبن. وتم: ئەگەر ئامادەبن..! گوێت لێیە؟ و ئەگەر جارچییەکەیان جاڕیدا، دەسا ئەی ئەسپسوارەکانی خوا بەڕێ بکەون..!

چووە ناو شارەکەوە، لەو کاتەدا دانیشتوانەکەی ئاگایان لێ نەبوو.. پاشان گەشتی تاقیکردنەوە دەستی پێکرد..!

## زانكۆی زەهرا و تۆمەتی شێتی!

پێی وتم: ئەو بارودۆخە خراپەم دەبینی کە دانیشتوانی پارێزگاکانی خۆرهەڵاتی تورکیا تیایدا دەژیان، بۆمدەرکەوت بەختەوەریی دنیاییمان لە دوو سەرچاوەوە دەستدەکەوێت، سەرچاوەی یەکەم: خوێندنی ئەو زانستە نوێیانەی کە ئێستا هەن. سەرچاوەی دووەم: قوتابخانە ئاینییەکان! دەبێ ئەو دووانە لەگەڵ یەکدا گرێ بدرێن و تێکەڵ بکرێن. دەبێ زانایانی ئاینی هۆگری زانستە نوێکان ببن و، بکرێنەوە بەڕوویاندا، چونکە کاروبار لەو شوێنانەدا بەدەست زانایانی ئاینییەوەیە، بۆیە دەبێ سەرکردایەتی بەپێی پێویست هۆشیار و سەرکەوتوو بێت .. ئەمە ئەو هەستە بوو کە پاڵی پێوەنام بۆئەوەی بێم بۆ ئەستەمبوڵ.. لەبەر ئەوە سکاڵانامەیەکم پێشکەش بە سوڵتان عەبدولحەمید -بەڕەحمەت بێت- کرد، لەبارەی پێویستی کردنەوەی قوتابخانەی "زەهرا" لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا، بۆ بەشداریکردن لە هەڵسانەوەی ئوممەتدا و، دوورخستنەوەی بەڵا و کارەسات لێی و، پاراستن و بەهێزکردنی بە زانستێك کە هەردوو بەرنامە و ڕێبازە کۆن و نوێیەکە پێکەوە گرێ بدات و کۆیان بکاتەوە.لێرەوە تاقیکردنەوەکە دەستی پێکرد..

هاتنم بۆ ئەستەمبوڵ لەپێش سەردەمی ڕاگەیاندنی دەستووردا بوو، لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانیدا.. چەند کتێبێکی بەنرخم لە زانستی کەلامدا

پەیدا کردبوو، لەبەرئەوەی زانیم فەلسەفەی سۆفیستایی لەنێو هەندێك خەڵکدا بڵاوبووەتەوە، بەوردی و سەرنجەوە ئەو کتێبانەم خوێندەوە. بۆیە زانایان و مامۆستایانی قوتابخانە ئایینیەکانم بانگهێشت کرد بۆ گفتوگۆ و یادخستنەوە، تا بزانم ڕێڕەو و ئاڕاستەی حاڵی زانستی لە وڵاتدا بەرەو کوێ مل دەنێت. کاتێك بینیم ئامادەبووان سەریان سووڕماوە لە بچووکیی تەمەنم لەچاو تەمەنی خۆیاندا، پێم وتن "چ پرسیارێکتان پێ خۆشە بیکەن!" لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو ئەو مەسەلە و بابەتانەی ئامادەبووان دەیانخستە ڕوو، بە تەواوەتی لە زەینمدا مابوون.. شێوازی بیرکردنەوەی ئەو دەم لە مشتومڕێکی ڕووت زیاتر نەبوو! بۆیە زەحمەت نەبوو بە ئاسانی لە سروشتی ئەو ڕەشەبایە تێبگەم کە بەسەر وڵاتدا هەڵی کردبوو!

کاتێك دەنگوباس و واتەواتێك لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە کە دەیوت: لە خۆرهەڵاتی وڵاتەوە گەنجێك بە قەڵافە و بەژن و باڵایەکی نامۆوە ڕووی کردووەتە شار، ناوی "بەدیعوززەمان"ە، هەر پرسیارێکی لێ بکرێت وەڵامی دەداتەوە و، بە بەڵگەی عەقڵی و مەنتیقی فەلسەفەی سۆفیستایی هەڵدەوەشێنێتەوە.. هەر دەڵێی زانیارییەکانی سەبارەت بە فەلسەفەی ئیسلامی و زانستی کەلام سنووریان نییە..!

لەبەر ئەوە خاوەن ئێرەیی و ئاخە نەیارەکان کەوتنە دووزمانی و قسەهێنان و قسەبردن، سکاڵانامەکەم گەشتە لای سوڵتان عەبدولحەمید، ئەم بارودۆخە هەمووی سەریکێشا بۆئەوەی بەرەو نەخۆشخانەی شێتەکان بدرێمە بەر و، بە تۆمەتی شێتی بەند بکرێم!.. دەست و پێوەند و دەوروبەری سوڵتانیش تێکەڵەیەکی سەیر بوو، لە بەکرێگیراوانی بێگانە و سیخوڕ و کەسانی هەلپەرست

و چاوچنۆك و خاوەن بەرژەوەندی..! زۆر بەدەگمەن پیاوی ژیر و چاکیان لەناودا بەرچاودەکەوت..! ڕەشەبای تاریکایی بەسەر هەمـوو کۆشکدا هەڵی کردبوو، لە هەمـوو لایەکـەوە پیلان دەوری دابـوو، جگـە لـە چەنـد پاشـماوە و شـوێنەوارێکی لـەڕ و لاواز چیدی لـێ نەمابـوو، ئەویـش چاوەڕێـی دەکـرد بـۆ دواجـار هـەرەس بهێنـێ..! سـوڵتانیش دوایـین کـەس بـوو بـەوە بزانـێ ! هـەر واش بـوو!

لە نەخۆشخانەکەدا کاتێك پزیشکەکە وەکو شێت گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم، واقـی وڕمـا و سەرسـامی باڵـی کێشـا بەسـەریدا.. زۆری پێنەچـوو ڕاپۆرتێکـی نووسـی، کـە ئـەم دەربڕیـن و دەسـتەواژەیەی لەخـۆ گرتبـوو: ”لەنـاو ئەوانـەی هاتوونەتە ناو ئەستەمبووڵەوە، کەسێك نییە بەوێنەی ئەم پیاوە زیرەك و بیرتیـژ و زرنـگ بێـت، بەڕاستی ئـەم پیـاوە، دەگمـەن و نـاوازەی جیهانـە!“.. دوابـەدوای ئەم ڕاپۆرتە ترس و دڵەڕاوکێ کەوتـە نـاو ڕیـزی بەرپرسانی کۆشـکەوە، بە پەلـە هەوڵیاندا پینـەی ئـەو ئابڕووچوونە بکـەن پێش ئـەوەی گـەورە ببێت و هەواڵەکەی بڵاوببێتـەوە، بۆیـە فرمانێکـی بـە پەلەیـان دەرکـرد تـا دەمـودەسـت لـە نەخۆشـخانە بکرێمـەدەرەوە! وەزیـری ناوخۆیـان بـە فرمانێکـی کارگێڕییـەوە نـاردە لام و تیایـدا بـڕی سـی لیـرەی زێڕیـان وەکـو موچـەی مانگانـە بـۆ بڕیبوومـەوە! لەگـەڵ بڕێـك لـە بەخشـیش، ئـەوەش لەپێنـاو دوورخسـتنەوەم لـە ئەستەمبووڵ! لەڕاسـتیدا ئـەوە فێڵێکـی شـەیتانی بـوو، لـەو ڕۆژگارەدا لـە بەرامبـەر هەندێـك لـە پیاوچـاکان و زانایانـی بێئـاگاو خەڵەتێنـراو پەیـڕەو دەکرا!

بەرپرسەکە دەستی درێژکرد و بەڵگەنامەی مووچە و بەخشـشەکانی پێدام.. و بەرلـەوەی وەڵام بدەمـەوە، ئـەوەی کەوتـە بیـر و دڵمـەوە ئـەم جارەیـان زۆر ساردوسـڕ بـوو! هـەر تەنیـا چەنـد چرکەیەکـی بەسـەردا چـوو، هەتـا لـە دڵمـدا گەردەلـوول

هەڵی کرد..! لەناو دارستانەکەدا دەستمکرد بە ڕاکردن لە مەنزڵێکدا لەنێوان پایز و زستاندا ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد.. درەختەکانم دەبینی بەملاو بەولادا لار دەبوونەوە، لەژێر فشاری هەور و باراندا لق و پەلوپۆکانیان دەشکانەوە...! گەڵایەك بەسەر جەستەیانەوە نەما، چ ئەوانەی کاتی هەڵوەرینیان هاتبوو چ غەیری ئەوانەش..! لەناو دارستانەکەدا هەموو شتێك بەتەواوەتی ڕووت و بێ بەرگ و پەڕوباڵ بوو! بەفریش بە زللە بەریووە ڕوخساری حەقیقەتی ڕەها و! درەختە وشك و ڕەق و تەقەکانی ناو کۆرسی سروودی گریانە بەئازارەکەش فرمێسکی خوێنیان بۆ دەڕشت.. ئەوانە زللەی میهرەبانی و چەپۆکی ئامۆژگاری و تەمێکردن بوون! بەڵێ، بەڵام زۆر توند و بەئازار بوون! جەستەی نەخۆش و دەردەدارم ڕاپەڕی بەڵام چۆن ڕاپەڕینێك.. جل و بەرگە دڕاوەکەم، لەگەڵ ڕەشەباکەدا ڕۆشت، سەرماش هێرشی کردە سەرم، ڕەنگی پێستم گۆڕا، تەنانەت ئەوەندە ڕووت و تەنك بوو، گۆشت و ئێسقانەکانی جەستەم لەژێرەوە دەبینران، وەك شووشەیەکی ڕوونی لێهات نەمدەتوانی هیچ شتێك لە خۆم بشارمەوە..! خۆم بەناوی "الستار"ی خوادا هەڵواسی..! یاستار! یاستار..! لەپڕ درەوشانەوە و دەرکەوتنی نوورەکانی ناوی "الجلال" ی پەروەردگار گۆڕان و گوازرانەوە بۆ نوورەکانی ناوی "الجمال"ی خوا.. بینیم درەختەکان سەرلەنوێ بەرگی سەوزیان پۆشی و، ڕەشەباکەش بەرەو خۆرئاوا پشتی هەڵکرد و ڕۆشت.. پاشان گرمەی هەوریش لە دوورەوە هاواری لێکردم: "ئەی سەعید..! ئەی سەعید..! "صەعید"بە، واتە خاك بە، وەك خاك خۆنەویست بە، بۆئەوەی ڕوونیی پەیامەکانی نوور لێل نەکەیت..!" وتم: سەرم لەڕێتە! وا بە گیرفانە شڕ و هەمانە دڕاوەکەمەوە بۆ لات هاتم کە هیچ شتێك هەڵناگرن بۆ من..!

لەسەر پشتی ئەسپی ڕەشەبا هاتم بۆ لات و جگە لە شمشێری حیکمەت و وتەکانی نوور هیچ شتێکم هەڵ نەگرتووە..!

چاوەکانم بەسەر نوسراوەکەی بەرپرسەکەدا کردەوە.. بینیم ڕەشەبا لە دەوروبەری سەرمدا بە تووڕەییەوە دەگرمێنێ بەسەر هەموو شتێکدا.. بانگدەرەکەش هاواری لێکردم: ئەوە چیتە بۆ وەڵام نادەیتەوە؟ بۆ قسە ناکەیت و وەڵامت نییە؟، بێگومان وەڵامم دایەوە، ئەگەر لە وەڵام تێبگات، بەڵام ئەوەی بانگی لێ دەکەیت، مردوو گیانی تیادا نییە..! بێگومان ئەوەی هاتە ناو دڵ گەیشتە کۆتایی ! کەواتە، چار نییە دەبێ لەگەڵ تەختە وشك و مردووەکاندا قسە بکرێت:

هەرچەندە لەو ڕۆژەدا من گەنجێکی هەژار و دەستکورت بووم، بەڵام وتم: "بێگومان من سواڵکەر نیم و نەهاتووم داوای مووچە بکەم! ئەگەرچی بڕەکەی هەزار لیرەش بێت! من بە تەنها لەپێناو نەتەوەکەمدا هاتووم بۆ ئێرە..! نەك لەپێناو خۆمدا، پاشان ئەوەی ئێوە دەتانەوێ بیدەن بە من، جگە لە بەرتیلێك لە بەرامبەر بێدەنگکردنمدا هیچ شتێکی تر نییە! ئەوەش بزانن من کاتێ هاتم بۆ ئەستەمبووڵ، گیانی خۆمم خستە سەر لەپی دەستم..! فەرموون چیتان لە دەستدێت و پێتان خۆشە لەگەڵمدا بیکەن! من چاك دەزانم چی دەڵێم، دەمەوێ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم بەئاگا بهێنمەوە، ئەوەش وەکو خزمەتێك بەرامبەر ئەو دەوڵەتەی کە سەر بەوم، نەك لەپێناو دەستخستنی مانگانە و مووچە، پاشان ئەو خزمەتەی کەسێکی وەك من بتوانێ پێی هەڵبستێت، جگە لە پێشکەشکردنی ئامۆژگاری بە نەتەوە و دەوڵەت هیچی تر نییە، ئەم ئامۆژگارییەش هیچ نرخ و بایەخێکی نابێت، ئەگەر کاریگەرییەکی چاکی نەبێت، کاریگەریی خراپیشی نابێت، ئیخلاسی تێدا نەبێت و خاڵی نەبێت لە تەپوتۆزی تەماح و چاوچنۆکی،

ئەمەش کاتێك ڕوو دەدات، کە ئەو ئامۆژگارییە بێ بەرامبەر بێت و دوور بێت لە سوود و بەرژەوەندی، لەبەرئەوە من چاوپۆشیم لێ دەکرێت، کاتێك ئەم موچەیە ڕەت دەکەمەوە!"

لە لای ئەو هاتمە دەرەوە و، لە دڵمدا باخ و بێستانی زەیتون و پرتەقاڵ و بەهارێکم هەڵگرتبوو هەرگیز گوڵەکانی سیس نەبن..! چاوەکانم بەبێ ترووکان بڕیبووە خۆرێك ڕووناکییەکەی لە ئاسمانی ڕۆحمدا بۆ هەتا هەتایە ئاوا نەبێت..!

بەشی
سێیەم

# ئەستەمبووڵ لەنێوان پیاوچاکان و خراپەکاراندا!

"بزانە! وەك چۆن ڕێبوار لە ڕێی ڕۆشتنەکەیدا ڕێی بە چەند مەنزڵێك دەکەوێت، هەر مەنزڵێکیش مەرجی تایبەتیی خۆی هەیە، بە هەمان شێوە ڕێبواری ڕێگەی خواش چەندین مەقام و پلە و حاڵەت و پەردە و بارودۆخی هەیە، هەر کەس تێکەڵیان بکات بەهەڵەدا دەچێت!"

(سەعیدی نوورسی، مەسنەوی عەرەبی، لاپەڕە ٢٤٠)

لە نهۆمی سەرەوەی ئەکادیمیای "چاملەجا" خەوتبووم.. کاتێك خەوزڕانێکی بێزارکەر لە خەو هەڵیساندم، سەیری کاتژمێری مۆبایلەکەم کرد، زانیم شەو تەنها نیوەی ڕۆشتووە، دووبارە ڕاکشامەوە، بەڵکو خەوم لێ بکەوێ، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە خەیاڵەکان بەتوندی دەهاتنە ناو بیر و هۆشم. -لە پاش نوێژی عیشا- بەدەم کاریگەری و گوێگرتن لە وتەکانی مامۆستا "محمد فەتحولڵا گولەن" لە وانەیەکی نوورانی یەکێك لە مزگەوتەکانی ئەستەمبوڵدا، خەوم لێکەوتبوو، لە وانەکەیدا ئەو پارچە زامدار و بەئازارانەی دڵی دەگوشی کە مابوون و دەگریا..!

شەوەکە زۆرگەرم بوو، هیچ نیشانەیەك نەبوو بۆ هەڵکردنی بایەك یان شنەبا و شەماڵێك.. هەستم بە خنکان و هەناسە توندی دەکرد، بۆیە هاتمە دەرەوە بۆ بەر پەنجەرەکە و، بە سەر ئەو پردە مەزنەدا ڕوانیم کە بەسەر بۆسفۆردا کشابوو، زۆر دوور نەبوو، لایەك لە دەریای مەڕمەڕە دیار بوو.. وێنەی فەتحولڵا کاتێك دەگریا لێم جیانەدەبووەوە و دڵمی پڕدەکرد لە ئازار و زووخاو..! کەمێك چاوەکانم لێکنا، پاشان کردمەوە بەسەر چرا و گڵۆپ و ڕووناکیی شارە بەرین و بێ بنەکەی بەردەمم. دیمەنەکەی بە شەودا زۆر جوان و دڵگیر بوو، ئەستێرەکانی ئاسمانیش مرواریییەکانیان لەسەر زەوی پەرشوبڵاو دەکردەوە، لەپڕ بینیم، وەك بڵێیت ئەسپێك لە پانتایی دەریای مەڕمەڕەدا دێتە

دەرەوە و، پاشان بەرەو ڕووی من بە ڕاکردن دەردەچێت و ئاسمانی شەو شەق دەکات.. ترسم لێنیشت و کەمێك پاشەوپاش گەڕامە دواوە، پاشان سوارێکم لێدەرکەوت سواری پشتی ئەسپێك ببوو و، دەستی بۆ سەرەوە هەڵبڕیبوو! بۆیە بیرم لەوە کردەوە بۆ ناو ژوورەکەم ڕابکەم، بەڵام توانای جووڵەم نەبوو، هێز و توانام لەبەر بڕابوو! سوارەکە کەمێك لێم نزیك کەوتەوە.. هەوڵمدا ناسنامەکەی بزانم، وا دەردەکەوت وەك بڵێی مامۆستا فەتحوڵڵا خۆی بێت! بەرگی ئامۆژگار "واعظ"ی لەبەرکردبوو: عەمامەیەکی سپی، عەبایەکی ڕەش کە بە نەخشێکی ئاڵتوونی چنرابوو.. بەڕێزان، لەبەرئەوە ترسەکەم نەما، ڕوخساری هێمن و جوانی، ترس و تۆقانی لە مرۆڤ دووردەخستەوە، ئەگەرچی ڕاستەقینەش بوایە! هەوڵمدا دەستەواژەیەکی تورکی بڵێم لەو هێندەی کە دەمزانی، بەڵکو بەو هۆیەوە لێی نزیك ببمەوە، پاشان بیرمکردەوە لەوەی ئەو زانایەکی مەزنە و بە زمانی عەرەبی ڕەوان قسە دەکات، پرسیارێك هات بە مێشکمدا زۆرجار لە قوتابییەکانیم کردبوو، بەڵام کەسیان تینوویەتیان نەشکاندبووم! بۆیە بانگم کرد:

- گەورەم فەتحوڵڵا..! کارەکە قەزای خوایە، جگە لە خوا کەس هیچی بە دەست نییە و هەر خۆی زاڵ و بەدەسەڵاتە، ئێمەش بەندەی خواین، تۆ بۆچی لە هەموو وانە و ئامۆژگاریەکانتدا دەگری..؟

لێوەکانی جوڵاند، وەك بیەوێ وەڵامم بداتەوە، بەڵام وێنەکەی لەبەرچاوم تێکچوو، پاشان بەرەو نەمان چوو، بێئەوەی بە تەواوەتی ون ببێت.. ئەوەندەی نەبرد ڕوخساری کەم کەم گۆڕا، بە چاکی چاوم تێ بڕی و دەستمکرد بە وردبوونەوە لێی، پرسیارم لە خۆم کرد، ئایا ئەمەی دەیبینم حەقیقەتە یان خەیاڵە؟ ڕوخساری لەگەڵ بەدیعوززەمان، سەعیدی نوورسیدا تێکەڵ بوو، هەتا

دەتوت بەتەواوەتی ئەوە، تەنانەت وەك بڵێی: لەڕاستیدا بەدیعوززەمان خۆیەتی! دوای ئەوە بۆم دەرکەوت هەردووکیان یەکێکن ..! ئەوە ئەو شتە بوو کە من دەمبینی، چاویش لای نەدا لەوەی دەیبینی و ئەملا و ئەولای نەدەکرد..!

پاشان دیمەنەکە بەدەرکەوت و درەوشانەوەی وێنەی سەعید نوورسی کۆتایی هات..!

پێی وتم:

- "بێگومان ئازاری ئوممەتە بێچارەکەم منی هاڕی..! دوژمن هەموو کێڵگەکانی سوتاند..! بەڵام ئێستا من سەرلەنوێ زەوی دەکێڵم و تۆو دەچێنم. ئەوە ئەرکی ئەم کاتەیە کوڕی خۆم، با تۆش بزانی!.."

وتم:

- زیاترم فێر بکە!

وتی:

- کێڵگەیەك بە فرمێسك ئاو نەدرێت، گوڵەکانی هەرگیز ناپشکوێن.

پاشان وتی:

- ئەستەمبووڵ گەورەی ئەویندارانە، بەڵام لە هەمان کاتدا، جێگەی تەماح و چاوچنۆکی شەیتانەکانیشە.. بە هیچ مارەییەکیش ڕازی نابێت، جگە لە یاڵی ئەو ئەسپانەی کە خۆیان فڕێ دەدەنە ناو شەپۆلەکانی بۆسفۆرەوە..! بەڵام ئەمیر لەکوێیە؟ ئەوەی درەوشانەوە و دەرکەوتنەکان و خەڵوەت و چۆڵەوانییەکان و، دەریا و بیابان بڕەکان لەکوێیە؟ لە پێشەکی رزگارکەراندا سمی ئەسپەکانی

لەگەڵ دەنگی "اللّـە أكـبر"دا پریشـك فـڕێ بـدەن.. ئەسپەكان لـە گۆڕەپانـی جەنگدا لەگەڵ عاشقاندا ملیان بخەنە ناو ئارەقی شەوبێداری و سوجدە و ڕكوع ببەن، مەبەستیشیان بەدەستهێنانی پاداشت و ڕەزامەندی خوا بێت، تا ئەوكاتەی بەرەبەیانی ڕاستەقینە "الفجـر الصـادق" بەسـەر وڵاتـدا هەڵدێت!؟ كـوڕی خۆم، ئەگەر تەنیا یەك گەردیلەی نـوور پرشـنگ بهاوێت، تاریكستانی خەمناك بۆی نییە بمێنێ، مەگەر بە دەگمەن.. ئیتر بۆ خۆت بیربكەرەوە..!

بەڵام -مەخابن- لەنێوان لاوازیی پیاوچاكان و فێڵی شەیتانەكاندا نوورەكەی خامۆش بوو..! بە تەنیا مامەوە. بەنێو كووچە و كۆڵانەكاندا بە هەناسەبڕكێ دەگەڕام و تەقەم لـە دەرگای خانـووە بچكۆلانـەكان دەدا، تـا مۆمـەكان بەسـەر هەژاراندا دابەش بكەم، بەڵام -داخی بە جەرگم- دەرگاكانیان نەدەكردەوە! لـەو كاتەوە تاوەكو ئێستا من دەگریم، هەتا خوێنبەرەكانی دڵم پسان..! دەسا سەرت هەڵبڕە و سەیربكە بەڵكو ببینی، ئەمەش هەندێك لە پارچەكانیەتی.

## لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا

هەڵۆکە هێشتا بە ئاسمانەوە دەسووڕێتەوە، بەڵام -مەخابن- هیچ شتێك نابینێ ..! بەڵکو بە دوای شوێنێکی سەلامەت و ئارامدا دەگەڕێت بۆئەوەی تیایدا بنیشێتەوە، چونکە ڕەشەباکە زۆر لە باڵەکانی ئەو بەهێزترە..! جارێك بەلای ڕاستدا لێیدەدا و جارێکیش بەلای چەپدا، وایدەزانی باڵەکانی توخمێکی نامۆن و بەشێك نین لەو، پاشان بە دەنووك بەربووە جەستەی خۆی و پێستی لەتوپەت دەکرد و خوێن و ئازاری لێ دەچۆڕا..! دەسا ئاهو ناڵە و حەسرەت بۆ من! بەرەو کام چاڵی قووڵ بەر دەبیتەوە ئەی ئەمیری ڕۆژگار؟ یان لە کام هەڵدێرەوە دەکەویتە خوارەوە؟ ئایا بەهۆی ئەوەوە بوو کە خۆت بەسەری خۆتدا هێنات، یان تارمییەکانی تاریکی هێنایان بەسەرتدا؟ خۆ هێشتا و بۆ هەمیشەیی منارەکان پارێزگارییان لێ دەکردی، دەی لەبەرچی ئامێزی ئەوانت بەجێ هێشت؟

ڕەشەبای خۆرئاوایی هەڵیکرد بەسەر خەلافەتی ئیسلامی و سوڵتان عەبدولحەمیددا.. جیهادی "سەعیدی کۆنیش" هەر لەو پێناوەدا بوو..

پێی وتم: بە فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمید لە نەخۆشخانەی شێتەکاندا بەند کرام! کوڕی خۆم -لەڕاستیدا-، من دوژمنی سوڵتان و خەلافەت نەبووم..

چونکە -هەر زوو- زانیبووم ئەو دووانە قوربانی دەستی ڕێکخراوەکانی یەهود و ئیستیعماری جیهانی و پیلانە دەرەکییەکانن! من پێشتر وتم ''سەڵتەنەت و خەلافەت یەك شتن، بەیەکەوە بەستراون و جیانابنەوە.. هەرچەندە ڕواڵەتی هەریەکەیان لەویتر جیاواز بێت.. لەبەر ئەوە سوڵتانی ئێمە سوڵتانە و، لەهەمان کاتیشدا خەلیفەیە! لەڕاستیدا ئەو "سومبولی"ی جیهانی ئیسلامییە. چونکە لەڕووی سەڵتەنەتەوە کاروباری سی ملیۆن کەس -هەروەك ژمارەی دانیشتوانی تورکیای ئەو کاتە ئەوەندە بوو- و لەڕووی خەلافەتیشەوە پێویستە چەقی پشت پێبەستنی هەموو موسڵمانانی جیهان بێت، ئەوانەی کە پەیوەندییەکی نوورانی دەیانبەستێت پێیەوە و، دەبێت جێگەی ئومێدیان بێت و پشتگیری و یارمەتی و کۆمەکییان بکات! هەر لەبەر ئەوەش بوو لە دێر زەمانەوە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و بنەماڵەی عوسمانیم خستووەتە ناو دوعاکانمەوە..''

## لەگەڵ موفتی وڵاتی میسردا

ئەگەر ئەم جەستەیە پەنجەیەکی بچووکی دەستی یان قاچی بریندار بێت، ئەوا هەموو ئەندامەکانی تری هەست بە ئازاردەکەن و تا دەیانگرێت و خەویان لێ ناکەوێت.. داخۆ دەبێ حاڵی چۆن بێت ئەگەر ئازارەکە لە سەردا بێت و زامی شکاندنەکەش بەرەو مێشك ڕۆچووبێت؟.. زانایانیش لە هەموو وڵاتاندا لە خەم و پەژارەدا دەتلانەوە و ئەمدیو ئەودیویان دەکرد، لە کاتی کارەساتە مەزنەکانیشدا جگە لە ئەستەمبووڵ بە قورساییە مێژووییەکەی و بۆن و بەرامە ئیمانییەکەی، هیچ شوێنێکی تریان نەبوو پەنای بۆ بەرن..! ئێوەش ئەی ڕۆڵەکانی ئەم ڕۆژگارە نوێیە، وا گومان دەبەن لە کاتی ئێستادا ئەستەمبووڵ هیچ سوودێکی نییە و لە مۆزەخانەی مێژوودا بووەتە یادگاری!.. نەخێر! نەخێر! بەبێ ئەستەمبووڵ چار نییە هەرچەندە سەفەرەکە درێژەش بکێشێ..! سبەینێش بۆ ئەو کەسەی بە ئارامگرتنەوە چاوەڕێی دەکات نزیکە!

وڵاتانی عەرەبیش، ئەمڕۆ بەدەست ئێش و ئازارەوە دەناڵێنن، پزیشکێکیش نییە ئازارەکانیان چارەسەر بکات، خۆ ئەگەر هاواری ببردایە بۆ دایە گەورەی و سەری بخستایەتە سەر سنگی، لە لای ئەو -بۆ ئارامی ئیمان- دەرمانێکی دەستدەکەوت و خەمەکانی نەدەهێشت!

پێی وتم: لە ساڵی یەکەمی سەردەمی ئازادیی سیاسیدا، ئەو کاتەی سوڵتان مژدەی لەدایکبوونی دەستووری ڕاگەیاند، شێخ محەممەد بەخیت موتیعی حەنەفی، بە سەردان هات بۆ لامان، ئەو کاتە موفتی وڵاتی میسر بوو، چاویکەوت بە ژمارەیەك زانا لە ئەستەمبووڵ، دەروونیان بەرامبەرم پڕ کردبوو، داوایان لێکردبوو بە مەبەستی دەمکوتکردنم مونازەرەیەکم لەگەڵدا ئەنجام بدات! پرسیاری لێکردم و وتی:

- دەربارەی ئەم ئازادیە عوسمانیە کە هاتووەتە پێش و ئەو مەدەنیەتە ئەوروپییەی سەری هەڵداوە، چی دەڵێیت؟

یەکسەر و بێ وەستان وەڵامم دایەوە و وتم:

- لەڕاستیدا دەوڵەتی عوسمانی سکی پڕە بە دەوڵەتێکی ئەوروپی، ڕۆژێك دێت ئەو سکەی دادەنێت..! ئەوروپاش سکی پڕە بە ئیسلام ،ئەویش ڕۆژێك دێت سکەکەی دادەنێت..!

شێخ پشتگیری لە قسەکەم کرد.. سەبارەت بە تورکیا وابوو، ئەوە هاتە پێش! کوڕی خۆم، لە ئایندەدا کاتێك پێکەوە دەچین بۆ داهاتوو، دەبینین ئەوروپاش سکەکەی دادەنێت!

پاشان ڕووی کردە زاناکانی دەوروبەری و پێی وتن:

- ئەم گەنجە مونازەرەی لەگەڵدا ناکرێت، کەسیش ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت، چونکە زمانی بە حەق دێتە گۆ!

بەڵێ، لەڕاستیدا لەدایکبوونی یەکەممان لە شێوە ناشرینەکەیدا بینی، ئەوە بوو تورکیا لە دوورکەوتنەوەی لە ئاین بە چارەکە سەدەیەك پێش ئەوروپا کەوت، بەڵام لەدایکبوونی دووەم -ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت- بەوە

دەبێت کە لە داهاتوودا لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دەوڵەتێکی ئیسلامی سەرن دەردەکەوێت..! چاندنی کۆرپەلەکەی لە خۆرئاوادا دەبێت..!

## لەگەڵ عامانۆئێل کراصودا..!

مونازەرەکردن لەگەڵ شەیتاندا کارێکی ئاسان نییە..! پێغەمبەرمان (صَلَّىَاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لەبارەی ڕووبەڕووبوونەوەی مەسیحی دەججالدا ئاگاداری کردووینەتەوە..! و پەنای گرتووە بە خوا لە شەڕ و خراپەی مەسیحی دەججال! بەڵام ئەگەر پێی گەیشتی، دەبێ بەرەنگاری ببیتەوە و خۆڕاگر و دامەزراو بیت! ئەوەتا ئێستا بەتایبەت بانگی من دەکات: بێگومان ئەو "عەمانوئێل کراصو" جوولەکەی بەناوبانگ..! سەرۆکی حاخامەکانی ئەستەمبووڵە! ئەندامێکی دیار و ناودارە لە مەحفەلی ماسۆنیدا، نوێنەری شاری "سلانیك"ە لە پەرلەماندا، ئەو کەسەیە کە ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی بینی لە بەرکەنارگرتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا. ئیبلیس بانگم دەکات بۆ زۆرانبازی.. منیش زرێی جەنگم پۆشی و شمشێرەکەم لە کێلان دەرهێنا.. کە سوارچاك پێی خستە سەر ئاوزەنگی ئەسپەکەی، ئیدی بۆی نییە دابەزێت.. دەسا ئەی سوارچاکانی ڕێی خوا، سەربکەونە سەر پشتی ئەسپەکانتان و بەڕێبکەون..!

چاوەکانی وەکو چاوی حەربای وشکانی دەخولانەوە، جارێك بۆ دواوە، جارێکیش بۆ پێشەوە، وەك چۆن یەکێك بنێشتی ئەمریکی بێتام بجوێت بەو جۆرە وشەی بەخێرهاتن و پێشوازیکردنی دەجوی..! قسەیکرد و قسەیکرد.. پاشان هەر قسەیکرد! ئاوێنەی دەموچاوی تێك شکابوو! ڕێگایەك نەبوو بگاتە

مەبەستەکەی و ڕاشکاوانە دەری ببڕێت..! منیش بە ئاگری داخ و پەژارەی ئوممەتەکەم و، نووری خۆشەویستیم بۆ ئاینەکەم، کە دەڕژا بەسەر دڵمدا، لە چاوەکانیدا ڕۆدەچووم..! دەمبینی لەگەڵ هەموو سەیرکردن و ڕۆچوونێکم لە ناوچاوەکانیدا بە ئازارەوە دەتلێتەوە..!

ئەوەندەی بەسەردا تێنەپەڕی هەتا هێز و توانا شەیتانییەکانی داڕمان..! بێ ئەوەی من داوای لێبکەم بۆ خۆی دەستیکرد بەکردنەوەی هێمای کەڵبەکانی، کە بە چەند وشەیەکی ژەنگاوی بەیەکەوە لکابوون! هەتا بەتەواوەتی پەیامەکەیم بۆ ئاشکرا بوو. کەواتە ئەو دەیەوێ لە پرۆژە شەیتانییەکەیدا بەکاربهێنێت، کە ئامانجی ڕووخانی پایەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو! لەبەر ڕوونی مەبەستەکەی سنگم گوشاد بوو، زمانیشم هاتەگۆ..! لە ڕوویدا گڕم بەردایە چراکانی هیدایەت، پێی خۆشبێت یان نا!.. دۆزەخیش بەرەو ڕووی شاڵاوی هێنا! گڕۆی جوولەکەی بینی چۆن لەسەر پەردەکەوە دەکەوتنە خوارەوە و، بۆ ناو قاری بڵێسەی ئاگرەکە وەکو کوللە یان دوپشك تلۆر دەبوونەوە..! بینی خراپە لە شەڕی دنیادا تێدەشکێت پێش حیساب و لێپرسینەوەی دوارۆژ! ئەو شورا و قەڵایانەی بینی کە بنیاتیان دەنێن،کەچی ئەجەلێکی نزیکیان هەیە و درێژە ناکێشن! ئوممەتی ئیسلامیش پاش پەنجا مەقام لە مەقامەکانی تاریکی و سەرگەردانی، دوژمنەکانی هەڵدەلوشێ! و بینی چۆن لە ئێستاوە نەوەی قورئان چەکەرە دەکات و، لەنێوان ئێمە و ئەودا تەنها سەوزبوون و هاتنی بەهارە. پاشان بینی هەر خوا زاڵ و بەدەسەڵاتە! پاشان..

پاشان بە پەلە کۆبوونەوەکەی پچڕاند..! و لەبەر بەهێزیی ئەو ڕێژنە سوتێنەرە ئاشکرایەی کە بەلێزمە باری بە سەریدا، هەڵسا ڕایکرد و بە تەنیا

لە کۆڕەکەدا بەجێیهێشتم..! بەهۆی ڕێژنەی ئەو نوور و بەڵگە خواییانەیکە ڕژاندی بەسەر دڵمدا و لەچاوە درۆزنەکانی ئەودا تیشکی دەدایەوە، دانی بە سەرشۆڕی و بەزینی خۆیدا نا و ڕۆیشت..! تەنانەت خەریك بوو باوەڕ نەکات بەوەی بەسەریدا هات. بە کێ دەگەیشت دەیوت: بەڕاستی خەریك بوو ئەو کابرا سەیروسەمەرەیە بە قسەکانی ڕامبکێشێت بۆ ناو ئیسلام!! خێرا پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، ئیتر نەگەڕایەوە! تەنانەت خوا بەسیرەت و بینایی کوێرکرد، لەمەوپێش و لەمەودواش سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا بووە و هەر بۆ خواش دەبێت!

## لەگەڵ جۆن توركدا

تارماییەكانی تاریكی.. تۆ چوزانی تارماییەكانی تاریكی چین؟!.. ئەگەر چاوت پێیان بكەوتایە، ڕات دەكرد لێیان و گیانت پڕدەبوو لە ترس!.. شكڵ و شێوەی سەگی ترسناكیان هەبوو! گەورەكان بەر لە بچووكەكان لێیان دەترسان..! هیچ شكڵ و شێوەیەك نییە لە شەیتان ناشیرینتر بێت! ئەوانە شەیتانە ڕەشەكانن.. چەند دەستەیەكیان بەپێ دەگەڕێن و دەڕۆن، چەند دەستە و تاقمێكیان باڵیان هەیە و دەفڕن! هەندێكیان بە شەودا تەقەدەدەن لە دەرگا و دەبنە میوان، هەندێكیشیان بە ڕۆژدا، هەشیانە دەچێت بەناو زەویدا و هەشیانە بە ئاسماندا سەردەكەوێت..! ئەگەر لە ئەستەمبووڵ چاوت لێیان دەبوو چۆن لە هەموو كون و كەلەبەرێكەوە هاتن و بەسەریدا ڕژان، وات دەزانی قیامەت هەڵساوە و دەرگای یەئجوج و مەئجوجیش كراوەتەوە!

"جۆن تورك" دەجولێ.. "جۆن تورك" دەدوێ.. "جۆن تورك" لە هەموو شوێنێكەوە شاڵاو دەهێنێ..! "جۆن تورك" گۆڕەپانەكە پڕ دەكات..!

"جۆن تورك" -كوڕی خۆم- وشەیەكە بە زمانی توركی.. واتای "توركیای لاو" یان "توركیای گەنج" دەگەیەنێت . ناوی بزووتنەوەیەكی سیاسییە لە هەموو ئەو كەس و تاقمانە نرا كە هەر لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیزەوە نەیار و

بەرهەڵستکاری دەسەڵات بوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا. ئەوانە تێکەڵەیەک بوون لە پیلانگێڕانی بەکرێگیراو و چەندین نەزان و لەخۆبایی! هەندێکیان دەناسیت و زۆرێکیشیان ناناسی. هەر هەموویان لە خولگەی ماسۆنیەتی تاریک و پەستدا دەسووڕێنەوە! خۆر و مانگیان بە هەمیشە و هەتا هەتایە گیراون! ئیتر چۆن ببینن؟.. داواکارییەکانی ئەم دەستە و تاقمانە کورتدەکرێتەوە لە ڕاگەیاندنی دەستوور و، دامەزراندنی ژیانی پەرلەمانیدا. کۆمەڵەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بە بەهێزترین و کاریگەرترینی ئەم تاقمانە دادەنرێت.. بەڵام داخوازی ئەوەبوو هەنگاو بە هەنگاو خەلافەتی ئیسلامی لە مەرگ نزیکبکاتەوە.. هەر ئەوەش ڕوویدا! تەنیا خوا زاڵ و بەدەسەڵاتە! ئەندامانی ئیتتیحاد و تەرەقی لەناو دەوڵەتدا لە سوڵتان هێز و دەسەڵاتیان زیاتر بوو! -لەو ساتەدا ڕۆژگارەکەش ترسناك بوو- لەبارەی ئیتتیحاد و تەرەقی و تورکیای لاوەوە پرسیارم لێکرا؟

ئەوەبوو بە ئەوپەڕی ڕاشکاوییەوە وتم: "هەرچەندە من دەیاننرخێنم، بەڵام ڕەخنەم لەو توندوتیژییە هەیە کە سیاسەتمەدارەکانیان پەیڕەوی دەکەن، لە هەمان کاتدا -تا ڕادەیەك- مەڵبەند و لقە ئابووری و ڕۆشنبیرییەکانیان بە چاك دەزانم، بە تایبەت لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا.. هەڵەی "تورکیای لاو" لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە دان نانێن بە ئایندا وەك بناغەی ژیان! وا گومان دەبەن ئوممەت شتێکە و ئیسلام شتێکی تر، یان دوو شتی لە یەك جیاوازن! ئەمەش لەبەرئەوەی بیرکردنەوەی مەدەنیەتی خۆرئاواکە پێی وابوو "بەختەوەری شتێکە، وا لەناو خودی ژیان خۆیدایە!" دەستی گرتبوو بەسەر بیروبۆچوونەکاندا.. بەڵام ئەوەتا ڕۆژگار دەریخست کە یاسا و ڕژێمی مەدەنیەت گەندەڵ و زیان بەخشە..! ئەزموونە یەکلاکەرەوەکان دەریانخست بۆمان: لەڕاستیدا ئاین نوور و بناغە و ژیانی ژیانە. زیندوو کردنەوەی ئاینیش زیندووکردنەوەی ئوممەتە.

ئیسلامیش ئەوەی جێبەجێکردووە. بێگومان پێشکەوتنی نەتەوەکەمان بەستراوە بە ڕادەی دەستگرتنمان بە ئاینەوە و، نزمبوونەوە و دواکەوتنیشی بەستراوە بە ڕادەی پشتگوێخستن و بایەخنەدانی بە ئاین! ئەوەش بە پێچەوانەی ئاینەکانی ترەوە..! ئەمە ڕاستییەکی مێژووییە و لەبیربراوەتەوە"..!

بەڵێ، لێرەدا دژایەتی کۆمەڵەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" ستەمکارم کرد، ئەو کۆمەڵەیەی کە شەوق و تاسەی هەمووانی لەناوبرد و، دەماری دووڕوویی و دەمارگیری بەئاگاهێنایەوە و، و بووە هۆکاری دووبەرەکی لەناو خەڵکدا..! بەناوی ئازادییەوە چەندین دەستە و تاقم و گرووپی داهێنا، کەچی لەڕاستیدا ڕۆڵی ستەم و چەوساندنەوە و زۆرداریی بینی. بگرە دەستەواژەی "ئیتیحاد و تەرەقی" لەکەدارکرد..!

# ئازادیی ئاشوب و ئاژاوەگێڕی

لافاو و هەستانی ڕووبارەکانی ناو دەشت و بیابانەکان مەترسیدارە..! چەندین ساڵ ئاوەکەیان کەمدەبێتەوە و دەنیشێتەوە.. پاشان لەناکاو دێت و شتی وا لەگەڵ خۆی دێنێ هیچ چاوێك نەی بینیبێ و، هیچ گوێیەکیش نەیبیستبێ و، بە دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتبێ..! بە تەوژمە کاولکارەکەی هەرچی بێتە ڕێگەی، لە گیاندار و بێگیان، ڕایدەماڵێت. شۆڕشیش وەهایە -یەکەم شتێك کە قووتی دەدات- ڕۆڵەکانی خۆیەتی!

پێی وتم: لە سەرەتای سەردەمی ئازادیدا.. ئاژاوە و پشێوی هەموو لایەکی گرتەوە.. ترس و تۆقاندن و دڵەڕاوکی باڵی کێشا بەسەر خەڵکیدا، بەهۆی ئەو وتار و هەواڵە هاندەرانەی کە ڕۆژنامەکان بڵاویاندەکردنەوە و، دەستپێکردنی پارتەکان بۆ تۆمارکردنی ناوی "گیان بەخشەکان" بە قسەی ئەوان..! دەستگرتنی هەندێ لە کودەتاچییەکان بەسەر هەندێ پێگە و شوێندا، تەنینەوە و تەشەنەکردنی ئازادی بێ سەروبەر بۆ ناوەندی سەربازەکان، بە جۆرێك پێچەوانە و دژی یاسای گوێڕایەڵی سەربازی بێت!

شیرازە پچڕا، گرێ و پەیمانی گوێڕایەڵی هەڵوەشایەوە، چونکە ئەوەبوو شەیتانە ستەمکار و تاکڕەوەکان، لەگەڵ هەندێك دەمارگیری نەفامدا

-لەوانەی کە لە حیکمەت و ژیریی ئاین بەشبڕاوبوون- لەو زۆنگاوە بۆگەنەی ستەم و زۆرداریدا تۆوی خراپەکارییان وەشاند..! بەردەوام سیاسەتی گشتی دەوڵەت بەدەست دوژمنان و نەفامەکانەوە بوو.. نزیکەی ملیۆنێك فیشەك بە ئاسماندا تەقێنران..! چەندین دەستی ناوخۆیی و دەرەکی لە پشتی پەردەوە بۆ ڕابەرایەتی شۆڕش دژی ڕژێمی عوسمانی و خەلافەتی ئیسلامی کەوتنە بزاوت..! هەمووان ئێستا خۆیان ئامادەدەکەن بۆ ڕوخاندنی ئەوەی کە ماوە بڕوخێنریێ.. گورگی ناپاکیش لە پشت بەردەکانەوە خۆی مەڵاسداوە، چاوەڕێی هەلێکی گونجاو دەکات بۆ فڕاندنی قوربانییەکە..! من لەوێدا ڕۆڵێکم هەبوو دەبوو پێی هەڵسم..! بێگومان زۆرجار لە کۆبوونەوە گەورەکاندا درکم بەو هەست و نەستانە دەکرد کە لە لای خەڵك خرۆشابوون. بۆیە ترسام خەڵکی نەزان، نەفامانە دەست وەربدەنە سیاسەت و یاسا و، ئاسایشی وڵات تێك بدەن. منیش بە زمانی زانستخوازێکی کورد کە تازە فێری زمانی تورکی بوویێت هەڵدەستام بە هێورکردنەوەی ئەو هەست و نەستە هەڵچووانە..! لەوە دەترسام دڵەکان لە پارێزگاکانی خۆرهەڵات گەردبگرن و، هەندێك لە بانگخوازانی پارتەکان ڕۆڵەکانی نیشتمانەکەم بەکاربهێنن، کە ژمارەیان نزیکەی بیست هەزار کەس دەبوو و لە ئەستەمبوڵ دادەنیشتن، لە داگرتن و بارکردنی کەلوپەلدا کۆڵبەرییان دەکرد، ئەوانە خاوەنی دڵ و دەروونێکی پاك و سادە و بێ ئاگابوون. دەبوو بگەڕێم بەسەر هەموو ئەو چایخانە و شوێنانەدا کە حەماڵەکانی لێبوو، بۆئەوەی ئەوەندەی ژیرییان وەری دەگرێت، مانای مەشروتیەتیان بۆ ڕوونبکەمەوە..! هەتا لە سنوور دەرنەچن بۆ شتێك سەرەنجامەکەی خوازراو نەبێت.. زۆربەی ئەوانە سووتەمەنی ئاشوب و ئاژاوە و شۆڕشەکانی ناو شار بوون! هەستم دەکرد ئەگەر دەستبگرم

بەسەر ژێری ئەوانەدا، ئەوا دەتوانم بەرەکە لەژێر پێی تارماییەکانی تاریکیدا ڕابکێشم! بۆیە خۆم یەکلاکردەوە بۆ ئەو جەنگە..!

ئەو ڕۆژەش بەرواری ٦ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٠٨ ی زایینی بوو.. کاتێك حەماڵەکان مانیانگرت لە داگرتنی ئەو کەلوپەلانەی لە وڵاتی نەمساوە هاتبوون، ئەمەش دوابەدوای ئەوەبوو کە نەمسا سوودی لە ئاوابوونی ئەستێرەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی وەرگرتبوو و، بۆسنە و هێرسکی خستبووە سەر وڵاتەکەی خۆی. بە هاندانی پارتەکانی تاریکی، حەماڵەکان بڕیاریاندا مانبگرن و کەلوپەلی نەمسا دانەگرن. کەشەکە تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوو و مەترسی تەقینەوەی لێدەکرا.. ئەوە هەڵوێستێکی سیاسیی زۆر چەپەڵ بوو، لە ڕووکەشدا حەق و ڕاستی بوو، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەوڵێك بوو بۆ ڕوخاندنی خەلافەت و پایەکانی یاسا! هەرچی بەشداریکردنی بارهەڵگرەکانیشە لە ناڕەزاییەکاندا، دەرەنجامێکی تەواو پێچەوانەی مەبەستەکەیانی دەدا بەدەستەوە. ئەوەش خۆی لە خۆیدا مەینەتیی کرێکارانە لە هەموو شوێنێکدا! کێ دەتوانێ ئەو دەریا هەڵچووە بگێڕێتەوە بۆ ناو زەریاکەی؟ یان کێ شەیتانەکەی بگێڕێتە دواوە و ئاگری ڕق و تووڕەییەکەی خامۆش بکات؟ کێ؟ ئەوەتا شەیتان دەیورووژێنێ و بێزاری دەکات لە هەموو لایەکەوە هەڵمەتی بۆ دەبات و هێرشدەکاتە سەری!

پاشان سەرلەنوێ سەرکەوتمە سەر پشتی ئەسپەکەم..! دەسمگرت بەسەر یاڵی پشتمله بەرزەکەیەوە! چونکە ئەم جارەیان ئەنجامی شەڕەکە چارەنووسی وڵات دیاری دەکات! بەخوڕ باران دەباری.. لق و پۆپی درەختەکانیش لە دەوری ئەسپەکەدا لەیەك ئاڵان.. ئەسپەکەم بەناو هەوادا دایە غار، لق و پۆپی

درەختەکانیش پارچە پارچە بوون و بە ئاسماندا فڕین و بوونە دارێکی سەوز، نوور و ڕووناکییان بە هەموو لایەکدا پەخش دەکرد..! هەڵوێستەکەم بە جوانی بۆ ئاشکرا بوو، هەموو شتێك بە ئاشکرا دەرکەوت، بینیم شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی لێرە و لەوێ لەناو خەڵکەکەدان! نوورەکە دەیانترسێنێ و تەقینەوەی ڕووناکیش زراویان دەتەقێنێ..! کەواتە ئەوان لێرەن! هێرش دەستیپێکرد! ئەو جەماوەرە بێ ئاگایە بەئاگا هاتەوە و بۆی دەرکەوت لە دەوروبەریدا چی دەگوزەرێت! فڕین و پرژوبڵاوبونەوەی دارە سەوزەکانیش لە هەموو شوێنێك زیادی کرد .. ڕووناکی لە دوای ڕووناکی لە گۆڕەپانەکەدا داگیرسا.. ئەوەندەی پێ نەچوو ئاڕاستەکە گۆڕا.. لەڕاستیدا ئەو خەڵکە ئیمانداره، کوڕی خۆم ئەمە لەیادمەکە..! هەمیشە متمانەت بە چەکی نوور هەبێت..! پاشان بارهەڵگرەکان بە داخ و پەژارە و پەشیمانییەوە گەڕانەوە سەر کارەکانیان، شەمشەمەکوێرەکانیش لەناو گۆڕەپانەکەدا بۆ مۆڵگەی تاریك دەگەڕان، تا خۆیانی تێدا حەشار بدەن..! قەیرانەکەش بە ئاشتی کۆتایی هات، بە خۆشی و ئاسوودەیی ژیان بەرنەسەر تا کاتێکی دیاریکراو..!

## لەگەڵ کۆمەڵەی "ئیتتیحادی محەممەدی"دا

جەستەی پیر و بەساڵاچوو بە جۆرێکە، نەخۆشییەکی بەسەرەوە لاناچێت خێرا نەخۆشییەکیتر تێیدا سەرهەڵدەدات. تا ئەو کاتەی لەسەر لێواری گۆڕ سرەوت دەگرێت..!

لە ٥ی نیسانی ساڵی ١٩٠٩ ی زایینیدا، بیستم خەریکە کۆمەڵەیەك بە ناوی "ئیتتیحادی محەممەدی"یەوە دادەمەزرێت و یەکەم کۆبوونەوەش لە مزگەوتی "ئەیا سۆفیا" دەبێت. زۆر ترسام لەژێر پەردەی ئەم ناوە پیرۆزەدا هەندێ کەسی سەرەڕۆ هەڵسن بە چەند ڕەفتارێکی هەڵەشە.. چونکە کاتەکە دژوار بوو! زۆرن ئەو خەڵکانەی کە لەپشت پەردەوە پیلان دەگێڕن و کۆڕ و کۆمەڵەکان بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنن، لەبەر ئەوە ڕۆیشتم بۆ ئەوێ. دەستبەجێ چەند وتەیەکم ئاڕاستەی جەماوەرەکە کرد و تیایدا مەبەستی چاکسازی و ئەرازوو و پێوەر و ڕێکخەرەکانیم ڕوونکردەوە.. و بە تیشکێك لە نوورەکانی ناوی "الحکیم"ی خوا هەڵبەزیم و، ئاوی فێنکی ڕێژاوە بەرزەکانیم کرد بەسەر هەموو نوێژکەراندا و، بەم جۆرە بووە کانگای ساردی و سەلامەتی لەبەردەم گەرما و کڵپەی ئاگرەکەدا. مەلهەمێکی پارێزەریش بوو بۆ دڵان لە پیلانی هەر کەسێك بیەوێ ئاین بەکاربهێنێت بۆ تیرۆرکردنی ئاین!

## یاخیبوونێکی سەربازی دەرگای خەلافەت دەشکێنێ..!

کونەکە تا دێت فراوانتر دەبێت..! دەرگاکەش خەریکە دەشکێت..! هەموو وتارەکان لاڵ و بێدەنگ بوون و وشەکانیش مردوون.. زمانی گوللەش زاڵ بووە..! ئایا ئەمە کاتی ڕۆیشتن و بەجێهێشتن نییە؟.. ئایا هەر بەڕاستی کۆچ دەکەیت و دەڕۆیت ئەی بەدیعوززەمان؟ دەڕۆی ئەی برادەر؟ ئەوەتا جەستە تووشی خوێنبەربوونی مێشك بووە؟ ئەوەتا دێوەزمەکانی تاریکی کەڵبەی ئیلحاد و زەندەقە وەردەدەنە هەموو شتێك؟ یان بەکام دڵ لە مەنفا ئەمینەکەتدا شیوەنی نیشتیمان قبووڵ دەکەی؟

بەڵام بۆ کام مەبەست لێرە دەمێنیتەوە؟ ئایا زامەکان تیماردەکەیت، یان دڵەکان؟.. یان بەشداری دەکەیت لە ئاشوبێکدا کە سەرەتا و کۆتاییەکەی نازانیت و نازانی کێ شوێنکەوتە و خەڵەتێنراو و کاولکارە و، کێیش پێشەوا و تەکبیرکەر و پیلانگێڕە؟ چۆن؟ ئەوەتا ئێستا تۆ تیماربوو چارەسەردەکەیت، ئەی برادەر، دەوا و دەرمانی تۆ چ سوودێکی هەیە، لە کاتێکدا هەتا زامێك چارەسەر دەکەیت، لە پاڵیدا زامێکیتر خوێنی بەردەبێت!.. ئایا کارێکی بێ مانا نییە تەمەنت لە پینەکردنی ئەو کون و کەلەبەرانەدا بەریتە سەر کە خراپەکاران دروستی دەکەن؟ ئەوەتا تۆیش لەم جەنگە دڕندانەیەدا بە تەنیایت؟! بۆچی بیر لە وڵاتێکیتر ناکەیتەوە؟ هەر یەکێك لە وڵاتانی ئیسلام نیشتمانی

تۆیە؟! هەموو ئەهلی شکۆ و غیرەت بەرەو میسر و شام ڕۆیشتن و وڵاتیان بەجێهێشت..؟ تۆیش بۆچی بە شکۆ و زانستەکەتەوە ناڕۆیت، بەڵکو خوا تۆ بکاتە مایەی سوود و چاکە بۆ وڵاتانی تر و ئەوەی بۆیان دەبەیت لێت وەربگرن؟ بەڵکو ڕۆژێك بێتە پێش بگەڕێیتەوە..! بگەڕێمەوە..؟

گەڕانەوە سوودی چییە پاش ئەوەی کار لە کار ترازا و هەموو شتێك لەدەستچوو و ئەستەمبوولیش بووە بەشێك لە وڵاتی ڕۆم! نەخێر، نەخێرا.. نا بۆ ڕۆیشتن! ئەوە وەسوەسە و خەتوورەی دەروونی بەدخواز و فێڵی شەیتانە! لێرە دەمرم! لێرە دەمێنمەوە لەگەڵ ئەو چەوساوانەدا لە قەڵای دارولخەلافەدا جیهاد دەکەم، هەتا ئەوەی بەدوایدا عەودالم لە کار و فرمانی سەعید دەستم دەکەوێت..! من خەریکە بۆنی شتێکی نوێ دەکەم، دەبێ ئارامبگرم، لەسەر ئاگری تاقیکردنەوە هەتا خوا سەرمدەخات، یان فەرمانی بە چی دەبێت دێتە پێش! دەسا بەرەو گۆڕەپان بەڕێ بکەوە ئەی بەدیعوززەمان!.. جگە لە خواش کەس زاڵ و باڵادەست نییە!

بە توندی دەنگ و هاوارەکان بەرز دەبوونەوە: ”شەریعەتمان دەوێ! شەریعەتمان دەوێ..!“ خەڵکێکی زۆر لەوێ جەم بوون، هەمووی چەك و ئاگر بوو! بێگومان کودەتایەکی ڕاستەقینە بوو... داخۆ دەبێ سوودمەندی ئەو ئاشووبە کێ بێت؟ شەریعەت چی لێقەوماوە؟ ئایا ئەمە دروشمێکە یان پەردەیەکە بۆ ئەوەی جارێکیتر شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی لەژێریدا خۆیان حەشار بدەن، یان لەڕاستیدا گوزارشت لە خەون و ئازارەکانی چەوساوان دەکات؟ کەواتە دەبێ سوورێکی نوورانی قووڵ بدرێ بۆئەوەی پەردە لەسەر شتەکان لابدرێ و ڕاستی کاروبارەکان دەربکەوێت..!

پێی وتم: ڕۆژی ٣١ی ئازار، بۆ چەند خولەکێك جموجوولی کودەتایەکی ترسناکم بەدیکرد.. چەند داواکارییەکم کەوتە بەرگوێ.. گومانم لە ڕاستی ناڕاستەکان لەلا دروست بوو..! چونکە وەك زانراوە ئاشووب لەگەڵ تەموومژدا دێت و، بە ڕوون و ئاشکراییش پشت هەڵدەکات و دەڕوات!.. پاشان سێ خولەك پاشەکشێم کرد! پاشان لاپەڕەی ڕۆژنامەکانم هەڵدایەوە، بینیم ڕۆژنامەکان پشتگیری لەو بزوتنەوەیە دەکەن و بە بزوتنەوەیەکی شەرعی دادەنێن! بەڵێ، لە ڕوویەکەوە دڵخۆش بووم، چونکە پیرۆزترین مەبەستی من، کە بریتییە لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی شەرع بێ کەموکورتی.. بەڵام لە لایەکی ترەوە زۆر نائومێد بووم و ئازارم پێگەیشت، کاتێك بینیم گوێڕایەڵیی سەربازی کەلێنی تێکەوتووە و، گرێی ئارامی و ئاساییش هەڵوەشاوەتەوە.. زانیم مەبەستەکە تەنیا ئەوەیە، نەك جێبەجێکردنی شەریعەت! بێگومان ئاشووبێکی ڕاستەقینە بوو -مەخابن- بۆیە چوومە دەرەوە بۆ ناو سەربازە یاخیبووەکان.. هەستم بە مەترسی هەڵوێستەکە و چەپەڵی و نیەت خراپی ئەو کەسانە دەکرد کە لە پشت ئەو ئاشووبەوە بوون! داخۆ جگە لە کەسێکی شێت و سەرکەش کێ دەوێرێت قسە لەگەڵ کودەتاچییەکان بکات؟ !خۆ ئەگەر لەدەست ئەوانیش ڕزگاری ببێت، لە چنگی ئەوانەی پشت کودەتا چۆن ڕزگاری دەبێت؟ ئەوانەی لەودیو پەردەوە خۆیان مەڵاسداوە و خەریکی پیلان گێڕان و فریودانن!

پێی وتم: ڕووکاری دەرەوەی ڕووداوەکە بەو جۆرە بوو: لە ٣١ی ئازاری ١٩٠٩ی زایینیدا، یاخیبوونێکی سەربازی لەنێو کەتیبەیەکی سەربازیدا ڕوویدا.. کاتێك هەندێك سەرباز ڕاپەڕین و ئەفسەرەکانی خۆیان لە سەربازگەکەدا بەندکرد! نیوەی شەو لە گۆڕەپانی سوڵتان ئەحمەد کۆبوونەوە، هەندێك سەربازی تریش لەسەربازگەکانی ترەوە پەیوەندییان پێوەکردن و یاخیبوونیان ڕاگەیاند. ئەم حاڵە

پانزە ڕۆژ درێژەی کێشا..! چەند کەسێکیش لەو بەینەدا بوونە قوربانی، کەشێك لە هەرا و هوریا و تەقەکردنی بێ مانا باڵی کێشا بەسەر ئەو شوێنەدا، سەربازەکان هاواریان دەکرد بەدەم دروشمی: "شەریعەتمان دەوێ!.. شەریعەتمان دەوێ"! بە گەیشتنی ئەو سوپایەی کە ئیتتیحادییەکان لە شاری "سەلانیك"وە بە فەرماندەیی "مەحمود شەوکەت پاشا" ناردبووی، ڕووداوەکە کۆتایی پێهات و یاخیبوونەکە سەرکوتکرا. بەم شێوەیەش دەسەڵاتی ئیتتیحادییەکان گەڕایەوە و ئەحکامی عورفی ڕاگەیەنرا و دادگای سەربازی دانرا بۆ ئەوانەی بەرپرس بوون لە ڕووداوەکە..! چەندین سەر بە پەتی سێدارەدا هەڵواسران!.. ئەمەش ئەو بەروبوومە مەترسیدارە بوو کە ئیتتیحادییەکان لەم ئاشووبە بەدەستیانهێنا، کە سەرەتا لە بەرگی فریادڕەسێکدا خۆی نیشاندا.! ئاشووبەکان هەروا دەبن!

لەوێدا بە ئاشکرا بینیم زیاتر لە ڕابردوو -چۆن خەلیفە عەبدولحەمیدی دووەم- بووە سوڵتانێك لە کارتۆن، یان وێنەیەکی بێ گیان! و دەسەڵاتیش لە ڕاستیدا لەدەست ئیتتیحادییەکاندا بوو! لەمەوپێش و لەمەودواش سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا بووە و هەر بۆ خواش دەبێت !.. بەڵام دەبێ کارەکە تەواوبکرێ و بگاتە پایان ! بەڵکو دەرووی خێر نزیکبێت!

## لەگەڵ سەربازە بێ ئاگا و خەڵەتاوەکاندا..!

ڕۆژی هەینی بوو، کۆمەڵێك زانام لەگەڵ خۆم برد.. هەتا گەیشتینە گۆڕەپانی یاخیبووەکان لە وەزارەتی جەنگ و لەوێ وەستاین.. دەستمگرت بە نووری ناوە جوان و پیرۆزەکانی خواوە، پاشان ڕووناکی و درەوشانەوە چەخماخەیدا..!

گوێم لە دەنگی ڕەشەبا بوو، لە قووڵایی ڕۆحمدا هەڵیکرد.. ناخم وەکو مەنجەڵ دەکوڵا.. تەپۆڵکە و بانەکانی ئەستەمبوڵ لە بەردەممدا هاتنە لەرزە، دار و درەختەکانیش هاتنە شەکانەوە و ڕاوەشان..! بارانیش بە لێزمە و هێزەوە بەسەرمدا دەباری، لەناکاو لافاوێکی ترسناك لە تەوقی سەرمەوە هەتا پاژنەی پێم ڕایماڵیم، جارێکی تریش هەورەکە لە دوورەوە بانگی کردم: "ئەی سەعید..! "صەعید" بە! واتە: خاك بە لە خۆنەویستیدا، بۆئەوەی ڕوونیی پەیامەکانی نوور لێڵ نەکەیت..!" لە قووڵایی دۆڵەکەدا لەناو شاڵاوی لافاوە ترسناکەکەدا نوقم ببووم، خێرا بە هەموو هێزێکمەوە هاوارم کرد: "ئا ئەوەتا دەستم لە خۆم داتەکاند و وازم لەخۆویستی هێنا!.."

پاشان لەگەڵ گزنگ و پرشنگی خۆری چێشتەنگاودا لە گۆڕەپانی سەربازیدا بەئاگاهاتمەوە.. سەربازەکان لەناو کوڕی هەنسك و پڕمەی کپە گریاندا بوون، لە سەرسامی و شڵەژانێکی خەمناکدا لەنێوان هەست بە

سووکایەتی و حەز بە تۆڵەسەندنەوە و، دوودڵی سەبارەت بە هەر ئاکامێکی نەخوازراو ئەمسەر و ئەوسەریان دەکرد!

بەڕێزان، دەرگای خەلافەتی ئیسلامی شکا، هەرچەندە بە تەواوەتی نەکەوت.. ئەوە بەروبوومی ئەو یاخیبوونە سەربازییە بوو کە شەیتانەکان چنییانەوە! ئیتتیحادییەکان سوڵتان -عەبدولحەمیدی دووەمیان- لەسەر تەختی دەسەڵات لادا! بەڵام ناچاربوون محەممەد ڕەشادی برای، کە وەلی عەهدی بوو، لە شوێنەکەی دابنێن... بەوە هەنگاویان نا بەرەو ڕوخاندنی شوراکان..! بەڵێ، بێگومان محەممەد ڕەشاد پیاوێکی ڕۆشنبیر و ئەدیبێکی پایەبەرز بوو، بەڵام لەڕووی سیاسەتەوە لەو ئاستەدا نەبوو! ئەمە جگە لەوەی کە بەرەو لێواری پیری هەنگاویدەنا، چونکە ئەو ڕۆژەی کاروباری گرتەدەست، تازە بە تازە بەرگی تەمەنی شەست و پێنج ساڵی لەبەر خۆی داماڵیبوو!

پێی وتم: بە فەزڵ و چاکەی خوا، بە چەند وتارێکی کاریگەر هەشت کەتیبەم لە یاخیبووەکان گەڕاندەوە بۆ ژێر سایەی یاسا و گوێڕایەڵی!.. سوود و بەرهەمی ئامۆژگارییەکانم پاش ڕۆژگارێك دەرکەوت.. چونکە خوا تەمەنی خەلافەتی بۆ چەند ساڵێکی تر درێژکردەوە، هەرچەندە با تەنیا بە شکڵ و شێوەش بێت..! کوڕی خۆم، هیچ شکڵ و شێوەیەك لە خێر و چاکە خاڵی نییە.. بەو هۆیەوە تارماییەکانی تاریکی لە ئیتیحادییەکان و ئەندامانی کۆمەڵە و ڕێکخراوە ماسۆنییەکان و پارتە شەیتانییەکان لە بەرامبەرمدا ڕق و تووڕەییان ورووژا، ئەوەش سەبارەت بە من، تاقیکردنەوە و بەرزبوونەوە بوو..!

## لەگەڵ دادوەرە سەربازییەکاندا

لە دیدی تارماییەکانی تاریکیدا بە یەکێك لە سەرکردە و ڕێکخەرانی ئاشووبەکە دادەنرام! هەر بۆیە لە قەفەزی تۆمەتدا خۆم لەپاڵ یاخیبووەکاندا بینییەوە! لەو کاتەدا سەیرێکی دەرەوەمکرد، بینیم ژمارەیەك سەرباز بە پەتی سێدارەدا هەڵواسراون .. بە مەبەستی ترساندنم، پەردەی پەنجەرەکە لادرابوو..! لە بەرامبەر ئەمەدا منیش ڕوومکردە دەستەی دادگا و بە ڕاشکاوی پێموتن "لەڕاستیدا من بەوپەڕی تاسە و شەوقەوە ئامادەی ڕۆشتنم بۆ ئەو دونیا! لەگەڵ ئەوانەدا کە لەسێدارەدراون ئامادەم بڕۆم بۆ ئەوێ!"... "بێگومان ئەم دەوڵەتە، لە ڕۆژگارەکانی ستەم و زۆرداریدا دژایەتی عەقڵ و ژیری دەکرد.. بەڵام ئێستا بە تەواوەتی دژایەتی ژیان دەکات! خۆ ئەگەر دەوڵەت بەم شێوەیە بێت و لە سەر ئەو مەنتیقە بڕوات، ئەوا بژی شێتی! بژی مردن! بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران..!"

لە ڕۆژانی سەرەتای لێکۆڵینەوەدا، وەك چۆن پرسیاریان لە خەڵکانیتر دەکرد، ئاواش پرسیاریان لە من کرد!

کەواتە تۆش داوای شەریعەت دەکەیت!

وتم:

- ئەگەر هەزار ڕۆحم هەبێت، ئامادەم هەر هەموویان لەپێناو ڕاستییەك

لەڕاستییەکانی شەریعەتدا بەختبکەم! چونکە شەریعەت مایەی بەختەوەرییە! شەریعەت دادگەریی ڕەهایە! ڕەوشت و بەهایە! دەڵێم: شەریعەتی ڕاستەقینە! نەك ئەوەی یاخیبووەکان داوایدەکەن!" مەبەستی من ئەوانە بوو کە لەپشت پەردەوە ئاگری ئاشووبیان خۆشدەکرد، مەبەستم تارماییە ڕەشەکان بوو، ئەوانەی لەڕووی سیاسییەوە لە کەشی ئاژاوەگێڕی سوودمەندبوون و خەڵکیان هاندەدا بۆ یاخبوون و دواتریش هەر خۆیان دەیانکوشتن!

لەبەردەستیاندا بەبێ تاوان هاتمە دەرەوە -سەیر بوو! زۆر سەیر بوو- بە وێنەی هاتنەدەرەوەی شیرێکی بێ گەرد لە نێوان ڕیخ و خوێندا! هەر تەنها خوا خۆی زاڵە و دەسەڵات هەر بەدەست ئەوە!

وا هاتە ناو دڵم -ئەو دڵەی کە هەرگیز درۆم لەگەڵدا ناکات- فەرمانم بەسەردا دراوە جارێکیتر بۆ خۆرهەڵاتی تورکیا بڕۆم.. ئەو نوورەی هاتە ناو دڵمەوە بانگی لێکردم:

﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ (الصافات: ٩٩)

**واتە: ئیبراهیم وتی من دەڕۆم بۆ لای پەروەردگارم دڵنیام ڕێنموونیم دەکات.**

ئەوە وتەی ئیبراهیمە (عَلَيْهِ السَّلَام).. مەگەر ئەویش بە سەلامەتی لە تاقیکردنەوەکە نەهاتە دەرەوە؟! بەڵێ، بەڵێ!.. بۆیە وتم: سەرم لەڕێتە، گەورەم ئەوا هاتم..!

من پێویستییەکی زۆری دەروونیم بە گەشتێکی ڕۆحیی نوێ هەبوو..! بەڵکو لەو گەشتەدا شتێکی وا ببینم کە لەوەوپێش نەمدیتبێ.. بەڵکو خوا، لە خەڵوەتێك لە خەڵوەتەکاندا، دەرگای نۆبەرە و دەسپێشخەرییەکی نوێم لێ

بکاتەوە! لەڕاستیدا لێرە چاك و خراپ، پاك و پیس تێکەڵ بووە، ڕەنگە کارێکیترم هەبێت، بە سروشت و شێوازێکیتر لە لایەکیترەوە چاوەڕێم بکات.. بۆیە بڕیاری ڕۆیشتنمدا، نەك لەبەرئەوەی ڕابکەم، بەڵکو لەپێناو گەڕان بە دوای سەرەتای ئەو ڕێگایەی کە بەناو ئەم تاریکییە ترسناکەدا دەڕوات!

پاشان بە سواری ئەسپێکی نوێوە گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ.. چونکە هێشتا شەڕەکە کۆتایی نەهاتووە! بۆیە بەرەو شاری "وان" دەرچووم، ئەوەش لەبەر حیکمەتێکە، کە دواتر خوا خۆی ئاشکرای دەکات... لەوەو پێش و لەوەو دوایش سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا بووە و هەر بۆ خواش دەبێت. لە کۆتا ڕۆژەکانی پاییزدا، کاتێك لە دوایین دەروازەی شار دەرچووم، وەستام و سەیری دواوەم کرد و ڕوانیمە شووراکانی ئەستەمبووڵ.. بەفر هێواش هێواش دەستیکرد بە بارین، بەردە دێرین و گومەزییەکانی داپۆشی، فرمێسك چاوە خەماوییەکانمی گەرمدەکردەوە، بۆیە وتم: لە پەنای خوادا بیت، ئەی شاری ئاشتی، بۆ هەتا هەتایە خوا بە ئاو و بەفر و تەرزە پاك و پارێزراوت بکات..!

* * *

لە ئەوپەڕی وڵاتی ئەنادۆڵەوە، بۆ ئەوپەڕی خۆرهەڵات.. لەنێوان "ئەستەمبووڵ" و "وان"دا جارجار ئاسۆکان بە ڕوومدا دەکرانەوە و جارجاریش دادەخران.. هەتا گەیشتمە شوێنی نیشتەجێبوونم و عەسای سەفەرم دانا و.. بە تەنیا چوومە ناو خەڵوەتی ڕۆحەوە..! چەند مانگێکم لە گەڕان بە دوای کەموکورتیی دەروونی خۆم و خاڵی لاوازی ئوممەتەکەمدا بردە سەر.. پرسیارم لە خۆم دەکرد: تۆ بڵێی من نەخۆشەکەبم؟ باشە دەبێ پزیشکی من کێ بێت؟من لە ڕیزی ڕزگارکاراندا بە دوای خۆمدا دەگەڕام، کەچی سەرسام مابووم،

چونکە هیچ شوێنەوارێکی خۆمم لەناویاندا بەدی نەدەکرد..! ئەوە ئەسپەکانی ئەوانە لەودیو جیهانی ڕۆحەوە دێن و لەبەرچاودا دەردەکەون.. دەی کەواتە من لەکوێم؟ لەکوێم؟ بانگەوازە قووڵەکەم هاتەوە یاد: ”ئەی سەعید، "صەعید"بە، واتە خاك بە وەکو خاك خۆنەویست بە، بۆئەوەی ڕوونی پەیامەکانی نوور لێڵ نەکەیت..!“

تا ئەو ڕۆژەی تیایدا بای شام بە سەر دڵمدا هەڵیکرد، حاڵەتی ڕۆحیم لەنێوان هەڵکشان و داکشاندا سەروخواری دەکرد..! ئینجا هاتەوە یادم..!

شام.. ئەو شوێنەی زۆرێك لە زانایانی عەرەب و تورك تێیدا کۆبوونەتەوە.. بەڵام چی دەکەن؟ ئەوان کاریان چییە؟ لە کاتێکدا ئوممەت تووشی خوێنبەربوونی مێشك بووە..؟ چی دەبوو ئەگەر سوپایەکیان لە دەستپاك و بەهێزەکان پێکبهێنایە؟ چی دەبوو ئەگەر هەر یەکە لەوان ئەو نوورەی کە خوا پێی بەخشی بوون، دایان بگێرساندایە و بچوونایەتە ناو خەڵك لە بازاڕ و یانەکاندا بەریان بەو تاریکییە بگرتایە کە شاڵاوی هێناوەتە سەر زەوی! بۆچی لە سووچی مزگەوت و تەکیەکاندا گۆشەگیری دەکەن؟ ئایا هەر بەڕاستی ئەمە سەردەمی تەسەووفە؟ هەر ئەوە گرفتەکە بوو! بانگدەری سەفەر بەتایبەت بۆ لای ئەوان ڕایوەشاندم! سەفەرەکەم بۆ وڵاتی شام بوو.. لەوێ لە مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق پرشنگی "خوتبەی شامی" بەسەر دڵمدا هەڵهات!

ئەوەش لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٠ی زایینیدا بوو، نوورەکانی بەس بوون بۆ ڕووناککردنەوەی دڵ و دەروون، ئەگەر لەوێ کەسێك هەبێت ببینێ، هەموو گۆشەیەکی مزگەوتی ئەمەوی گەرم بووە. بەڵام کوا حەقیقەت بینی ئەم

ڕۆژگارە؟ کوان ئەو خاوەن بیناییانەی لە دەمی شالآوی نەفسی بەدخواز و داوی ئارەزووە ورووژێنەرەکاندا ڕێی خۆیان بزرناکەن؟! داخی بەجەرگم، کارەساتەکە گەلێك ترسناکە..!

ئەمە بەڵگە و بیانوی بەدەست ئەو کەسانەوە نەهێشت کە لەوێدا ئامادەبوون.. دەسا بەڕێبکەون، کاتی گەڕانەوەیە بۆ وڵاتی نوور و سەنگەری جیهاد..!

ئەوانە زاناکانن، ڕێبازە جۆربەجۆرەکان و بەرژەوەندییە تەسکەکان بووەتە هۆی لەیەك دوورکەوتنەوە و دابڕانیان -مەگەر ئەو کەسەی خوا ڕەحمی پێ بکات..! گومانیش لەوەدا نییە کە ئوممەت بێ ئەوان ناژی.. داخی گرانم! دەبێت ڕێگای دەربازبوون چۆن بێت؟

قەلآکانی قوتابخانەی "زەهرا" جارێکی تر لە دڵمدا بەرزبوونەوە و لە دوورەوە هاتنە بەرچاوم.. ماوەیەکی زۆر بیرمکردەوە: دەرچوون لەم قەیرانە بێ پەروەردە و فێرکردن ئەستەمە! بەبێ ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم دەرباز بوون مەحاڵە، بەبێ ڕەببانی بوونی وانە و خوێندن و فێربوون هیچیتر ناکرێت! چونکە بەهای شمشێر بەندە بە بەهای ئازایەتی ئەو کەسەی دەیوەشێنێ!.. ئەمجارەیان بیرێکی بەهێزتر ڕژا بەسەر ڕۆحمدا: دەبێ بگەمە ئەستەمبووڵ، هەرچەندە سەفەرەکە درێژەش بکێشێ!.. بەر لە هەڵکردنی ڕەشەبا -کوڕی خۆم- لەوێ بووم..!

سوڵتان ڕەشاد بڕیاریدا گەشتێکی هەمەلایەنە ڕێکبخات و سەرانسەری وڵات بەسەر بکاتەوە. سا بەڵکو بتوانێ مووررووە پەرشەکانی ئەو ملوانکەیە کۆبکاتەوە کە کاتی کۆکردنەوەی بەسەرچووە. ڕووگەی گەشتی ئەمجارەی سوڵتان "ڕوم ئیلی".. بوو، کە ناوچە عوسمانییەکەی کیشوەری ئەوروپا دەگرێتەوە. منیش وەکو نوێنەری

پارێزگاکانی خۆرهەڵاتی وڵات، یەکێك بووم لە هاوگەشتەکانی.. لە درێژەی گەشتەکەدا سوڵتان ڕەزامەندی لەسەر پرۆژەی "زانکۆی زەهرا" پیشاندا و، بۆ ئەو مەبەستەش نۆزدە هەزار لیرەی زێڕی تەرخانکرد! زانکۆکە دەکەوتە ناوچەیەکی دڵگیرەوە کە دەیڕوانی بەسەر دەریاچەی "وان" دا. بەڵام زۆری نەبرد..

دێوەزمەی جەنگی جیهانی یەکەم باڵیکێشا بەسەر هەموو لایەکدا..! داگیرکارانیش دەست درێژییانکردە سەر وڵات و، کاولکاری شاڵاوی بۆ سەر هەموو شتێك هێنا..! بۆیە بانگم لە هاوەڵانم کرد: ئەها ئەی سوارچاکانی ڕێگەی خوا، سەربکەونە سەر پشتی ئەسپەکانتان و بەڕێ بکەون..!

بەشی
چوارەم

# درەوشانەوەکانی مەرگ. . !

"ڕاستییەکانی قورئان، چەندین گەوهەری بەنرخن، گیانم لەپێناویاندا بەختدەکەم، نایانفرۆشم وەکو تۆ!.. مەرگ بە هاودەم و هاوڕێ دەزانم، لێی ناترسم وەکو تۆ!.. دەم بەخەندە و پێکەنینەوە دەچمە ناو گۆڕ، لەرزم لێ نایەت وەکو تۆ..!"

(سەعیدی نوورسی، وتەکان)

## بەسەرهاتی ئاژاوەکەی بەدلیس

لە دەمی هەنگاونان بەرەو کاری چاکەدا، شەیتان دەکەوێتە خۆی و دەستدەکات بە جموجووڵ! کوڕی خۆم با تۆش بزانی..! لەو کاتەدا کە ئێمە سەرگەرمی خۆ ئامادەکردن بووین بۆ دروستکردنی زانکۆی زەهرا، کەمێك پێش جەنگی جیهانی یەکەم، چەند کەسێکی دیندار و لەخواترس لە شاری "وان"ەوە هاتن بۆ لام و پێیان وتم:

”هەندێ لە سەرکردەکانی سوپا ڕەفتاری دژ بە ئاینیان لێ دەوەشێتەوە، بۆیە دەمانەوێ لە دژیان ڕاپەڕین و شۆڕش ڕابگەیەنین، جا بۆیە هاتووین بڵێین تۆیش بەشداریمان بکە!“، بە بیستنی ئەو قسەیە یەکسەر لە دڵی خۆمدا هاوارم کرد: اللّٰه أکبر! گێچەڵی نەفرین گەیشتووەتە ئەم ڕادەیە! ئەوەتا لە ساتەوەختی بنیاتنانی زانکۆکەدا، هەستی ئەو خەڵکە سادە و ساکارە دەخرۆشێنن! منیش لە لایەن خۆمەوە بە شێوەیەکی هێمنانە پێم وتن:

”بڕوانن، ڕەفتاری دوور لە ئاینی ئەو سەرکردانە بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، لەم ڕووەوە ناکرێت بەرپرسیارێتی و ئۆباڵیان بخەینە ئەستۆی تەواوی سوپا، ڕەنگە لەم سوپای عوسمانیەدا سەد هەزار پیاوچاك و دۆستی خوا هەبێت، بۆیە من هەرگیز ناتوانم شمشێرەکەم لە دژی ئەم سوپایە هەڵبکێشم، لەبەر ئەوە

ناتوانم بەشداریتان بکەم.“ ئیتر ئەوانیش ڕۆیشتن و پەلاماری چەکەکانیاندا، ئاکامەکەشی ڕووداوە دڵتەزێنەکەی شاری "بەتلیس" بوو.. ئەوە بوو لە یۆنیۆی ساڵی ۱۹۱۳ی زایینیدا هۆزە نیشتەجێبووەکانی دەوروبەری شاری بەتلیس، بە سەرۆکایەتی -شێخ سەلیم- هەڵگەڕانەوە و شۆڕشیان دژی دەسەڵات ڕاگەیاند و بۆ ماوەی هەفتەیەك دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت! بەڵام -مەخابن- جگە لە تۆقاندن و کوشتنی کەسانی بێتاوان هیچ ئەنجامێکی نەبوو..! ئەوە بوو سوپا بە چەکی قورسەوە گەمارۆی شارەکەیدا و تەڕ و وشکی پێکەوە سوتاند و هەموو شتێکی هاڕی! چەند مانگێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێ نەپەڕیبوو کە ئاگری جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرسا و، ئەو سوپایەش لەژێر ئاڵای ئاییندا بەشداری لە جەنگەکەدا کرد و چووە ناو تەنووری جیهادەوە، سەدان هەزار شەهید لەو سوپایە بەرەو ئاسمان بەرزبووەوە و..! بە خوێنی خۆیان بڕوانامەی دۆستایەتی خوایان مۆرکرد! پاش ئەو جەنگە بە ماوەیەکی کەم.. ساڵی درەوشانەوە و لێدەرکەوتنی هەرە مەزن هاتە پێش..!

## مەقامی یەکەم: چیای "ئارارات" دەدوێ!

لەو شەوەدا بە جلوبەرگی سەربازییەوە بینیم، زۆر سەرم سوڕما! تفەنگێکی"ماوزەر"ی کردبووە شانی! ویستم داوای لێ بکەم وەك جاران دەستبکاتەوە بە وتنەوەی وانەی حیکمەت، لەپڕ هەستم کرد قورساییەکی سەیر زمانمی بەست، لێوەکانمی کۆت و زنجیرکرد..! چاوەڕێمکرد ئەو خۆی دەستبکات بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە، بەڵام هیچی نەوت! بەرێزان، بێدەنگ بوونەکەی ئەوەندە درێژەی کێشا، هەتا وەڕس بووم! بە ئاماژە تکاملێکرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە! پاشان گریام! من دەمزانی ویژدانی پڕە لە سۆز و شەفەقەت، بۆیە هەر کە چاوی بە فرمێسکەکانم کەوت، بە سۆز و بەزەییەوە سەیری کردم و وتی:

لە ڕۆژگاری تەنگانە و ناڕەحەتیدا چۆن بەتەمای بەدەستهێنانی حیکمەتیت، لەکاتێکدا لەسەر بەرەی سستی و تەمبەڵی بۆی ڕاکشاوی؟

وتم:

- کەواتە فێرمبکە گەورەم..!

وتی:

- چەکەکەت هەڵبگرە و نزیك بەرەوە! ئەمە ڕۆژگاری "سەعیدی کۆن"ە، کوڕی خۆم، جگە لە زۆرانبازی هیچ چارێکی ترت نییە..!

بەئاماژە وتم:

- سەرم لەڕێتە قوربان!..

خێرا دڵم گوشاد بوو و زمانیشم بەربوو!.. کەمتر لە چاوتروکانێك بە جلوبەرگی سەربازی و چەکەوە خۆم بینییەوە! گوێم لە دەنگی گەوهەرەکانی حیکمەت دەبوو، لە نێوەندی تەقەی گوللە تۆپەکاندا هەڵدەوەرین!

پێی وتم:

- سەرەتا بە خەوی ڕاستەقینە دەستی پێکرد، وەك ڕژانی جوانیی بەرەبەیانی ڕاستەقینە بەسەر ناوچەوانی ئاسماندا.. خەوێك بوو دابەزی بۆ سەر دڵی خەمبارم، لە تاریکستانی سەرگەردانی دەریهێنام بۆ ناو نووری دڵنیایی! لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە بوو! ڕووداوێك بوو ڕێڕەوی ژیانمی گۆڕی..!

پێی وتم: لە پێش هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی یەکەمدا بوو:

"ئارارات"، چیایەکە، بەڵام نەك وەك هەموو چیایەکیتر! چیایەکە خۆشیدەوێم و منیش ئەوم خۆشدەوێ!.. چونکە ئەو جێگای خەڵوەت و، شوێنی دەرکەوتن و، مەنزڵی گەشت و سەیرانی من بوو..! لەگەڵ ئەودا چەندین نهێنی و بەسەرهاتی تایبەتم هەیە..!

لەو شەوە بەناوبانگەدا، کە فریشتەکان ئامادەی بوون، من لەسەر قەدپاڵە مەزنەکەی بووم، بە لوتکە سەرکەشەکانیەوە بەسەر سەرمەوە دەکشا.. لەو کاتەدا کە من لە حاڵەتی زیکردا بووم، ساتی لێدەرکەوتنی درەوشانەوەی هەرە مەزن هاتە پێش:

دەنگی تەقینەوەیەکی مەزن پەردەی بێدەنگی شەوی دڕاند، پارچەکانی

لەناو دەنگدانەوەکەدا پرژوبڵاوبوونەوە..! چیاکە لە قووڵیی ناخیدا تەقییەوە و لەت و پەت بوو..! زەویش لە دەوروبەری ئەودا هەر چوار پایەکانی کەوتنە لەرزە، تەقینەوەی مەزن دەستی پێکرد، گابەردەکانیش لە قوڵایی چیاکەوە بە چەشنی گوللە تۆپی گەورە، بەخێرایی دەردەپەڕین، لەگەڵ کڵپەی ئاگردا بە هەموو لایەکدا پەرش دەبوون..! بۆئەوەی هەموو جێیەکی جیهان بگرێتەوە و، بە سامناکییەکەی تەواوی زەمین داپۆشێت..!

لە ساتەوەختی ڕووداني هەموو ئەمانەدا من لە جێگای خۆم ڕاوەستابووم، مەرگی ترسناکیش لە بەرددەمدا ئاسۆی فراوانی تەنیبوو، ئاسمانی پەردەپۆش کردبوو.. لەتاو بینینی ترسناکیی دیمەنەکە ئاگام لە خۆم نەمابوو.. لەناکاو هەستم کرد دایکم لەپاڵمدایە..! دەستبەجێ بانگم لێکرد: دایەگیان..! دایە..! مەترسە دایەگیان! ئەوە فەرمانی خوایە..! بێ گومان ئەو بەبەزەیی و دانایە..!

ئەوەندەی بەسەردا نەچوو هەتا نووری مەقامەکە پرشنگیداو درەوشایەوە بەسەرمدا: بێگومان چاومپێکەوت.. بە شکڵ و شێوە کەسێکی مەزن بوو، پەردەی نوور درابوو بەسەر ڕوخساریدا، لەبەر ئەوە دەمبینی و نەمدەبینی..! پاشان لە بەرزاییەکەوە فەرمانی کرد و وتی:

- ئەی سەعید..! ئیعجازی قورئان ڕوون بکەرەوە..! پاشان..

پاشان لە خەوەکەم ڕاپەڕیم..! بەڵام ئایا لەڕاستیدا خەوتبووم؟

لە ئەنجامی ئەو خەوەدا و بەهۆی ئەوەی هاتە ناو دڵمەوە، زانیم ئاڵوگۆڕێکی مەزن لە جیهاندا ڕوودەدات. لە ئەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنەشدا ئەو شورایانەی دەوری قورئانیانداوە هەموویان دەڕوخێن و، قورئان دەکرێتە ئامانج

و هێرشێکی دڕندانەی دەکرێتە سەر..! بەڵام قورئان خۆی بەرگری لە خۆی دەکات. ئیعجازەکەشی ئەو قەڵا پۆڵاینەیە کە دەیپارێزێ. ئەوە هاتە ناو دڵم کە لەم ڕۆژگارەدا کەسێکی وەك من پاڵێوراوە بۆ ئەوەی هەڵبستێت بە ڕوونکردنەوەی جۆرێك لەم ئیعجازە، کە لەڕاستیدا زۆر لەسەرو توانا و سنووری منەوەیە. ئیتر زانیم کە من پاڵێوراوم بۆئەوەی هەڵبستم بەم کارە..!

ئەوە سەرەتای گۆڕانکارییەکان بوو لە ژیانمدا..!

لە ئاسۆی ڕۆژەکانی ئایندەدا بە ئەندێشە سیما و ڕوخساری "سەعیدی نوێ"م بینی دەدرەوشایەوە.. بەڵام هەرکات سەیری دواوەی خۆمم دەکرد، "سەعیدی کۆن"م دەهاتەوە پێشچاو لەناو بوونمدا نیشتەجێ ببوو.. ڕزگاربوون لە کەسایەتیی بەهێز و، هاتنە دەرەوەش لەژێر هەژموونی سەعیدی کۆندا کارێکی هەروا ئاسان نەبوو..! کەوتمە ناو چەندین پلە لە سەرسام بوون و چەندین مەقام لە خەم و پەژارە.. دوابەدوای ئەویش زللە دوای زللە بەسەر دەموچاومدا دادەباری..! تا ڕۆژەکانی تاقیکردنەوە هاتە پێش، ژانی لەدایکبوونێکی نوێ دەستی پێکرد..!

جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرسا..! نێزەی داگیرکەرانی ڕووس درێژکرا بەسەر وڵاتدا و..! سوپای عوسمانییش لە جەنگەکە تێوەگلا! دەبوو منیش لەوێ بم..!

## مەقامی جیهاد..!

قـەدەری "سـەعیدی نـویێ" ئەوەبـوو لـە جەرگـەی بـەرەی پێشـەوەی جەنگـدا لەدایکببێـت..! حەقیقەتـی لەدایکبوونێـك ئەگـەر لـە یەکـەم ڕۆژیـدا بـە ئاگـر نەپێچرابێتـەوە، جگـە لـە مردوویـەك لـە مـردووەکان هیچیتر نییـە..! بەڵکو زانـای ڕاستەقینە هەمیشـە فەرماندەیە..! ئیمام بۆی نییـە خۆی بشارێتەوە و لەبەرچاو ون بێـت!

کەواتـە بـا لـە قوتابییـان کەتیبەیەکـی خۆبەخـش پێـك بێـت!.. دەبـا جیهـاد یەکـەم وێسـتگەی خوێنـدن بێـت لـە زانکـۆی زەهـرادا..! بانگـەوازی: "یاللأنصـار..!" بەرزبووەوە.

دەسـتبەجێ پۆلێـك جەنـگاوەری ئامـادەبـاش لـە سـوارچاکان لـەدەورم کۆبوونەوە،"کەتیبـەی ئەنسار"ی جیهادیـم لـێ پێکهێنـا، کەتیبەیەکی ڕەببانـی بـوو، قوتابییـە نەجیبەکانم پێشـیانکەوتن..! ئەسپە ڕەسـەنەکانیش کەوتنـە غـاردان و بـە سـمەکانیان تـۆزی بەهەشـتیان کـرد بـە ئاسـماندا!

پێـی وتـم:

ئـەوە لـە سـاڵی ١٩١٦ی زایینیـدا بـوو، ڕاجیمـەکان بەوێنـەی بـاران گوللەیـان دەبارانـد..! سـەربازەکانیش گـوڕیـان خواردبـووەوە و بـەرەو هێڵەکانـی پێشـەوە

پێشڕەوییان دەکرد. بۆ هەر لایەکت بڕوانیایە جەستەی پارچە پارچەبووی سەربازەکانت بەرچاودەکەوت. منیش لەگەڵ شەهید مەلا حەبیبی قوتابییمدا لە بەرەی "پاسینلەر" هێرشمانکردە سەر ڕوسەکان.. تۆپەکانیان لە خولەکێك یان دوو خولەکدا سێ گوللە تۆپیان پێوە دەنایەن..! ئەوەبوو سێ گوللە تۆپ لە بەرزی دوو مەترەوە بەسەر سەرماندا تێپەڕی..! ئەمە بووە هۆی ئەوەی سەربازی ناو سەنگەرەکان بکشێنە دواوە..! ئەمەش خۆی لە خۆیدا یەکەمین تاقیکردنەوە بوو.. ڕوومکردە مەلا حەبیب و پێم وت:

- تۆ چی دەڵێیت مەلا حەبیب؟ لەبەر گوللە تۆپی ئەو کافرانە من خۆم ناشارمەوە..!

ئەویش دەمودەست وتی:

- منیش هەروەها، هەرگیز دواناکەوم و لێت جیانابمەوە..! لەم بەینەدا گرمەی تۆپێك کە لە نزیکمانەوە تەقیەوە، ڕایچڵەکاندین..! بەڵام بەهۆی متمانەی تەواوم بە پارێزگاریی خوایی، گوێم نەدایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هاوارمکرد:

هەڵمەت بەرن بۆ پێشەوە..! تۆپ و تفەنگی بێباوەڕان ئێمە ناکوژێت، هەرگیز دانابەزین بۆ ئاستێك بیر لەوە بکەینەوە هەڵبێین!

هەرواش بوو..! سنگمان بەرامبەر گوللە تۆپە کاولکەرەکانیان یەك لە دوای یەك دەرپەڕاند و بەرەو پێشەوە ڕۆیشتین.. کەتیبەی "ئەنسار" ئاگری دەپژاند بەسەر دوژمنانی خوادا و، بست بە بست زەوی لە چڵك و چەپەڵییان پاکدەکردەوە.. تەنانەت هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە کە فەرماندەی خۆبەخشەکان، بەدیعوززەمان نوورسی، لە هەمان کاتدا لەم بەرەی جەنگ و لەو بەرەی جەنگیش بوونی هەیە، ئەمەش

بۆ خۆی ترس و دڵەڕاوکێی خستە دڵی سەربازە ڕوسەکان و لە ترساندا هەڵهاتن!

جارێکیان هەواڵیان پێدام کە ڕوسەکان لە بەرەی "نورشین" دەستیان بەسەر سی تۆپدا گرتووە..! بەو هەواڵە ئاگر بەربووە گیانم! بەناو ڕیزەکاندا دەگەڕام و بانگم دەکرد:

- کێ پەیمانی مردنم لەگەڵ دەبەستێ؟ خێرا سێ سەد خۆبەش بەدەورمدا کۆبوونەوە! کە شەو داهات بەرەو "نورشین" کەوتینە ڕێ، وەختێ لە شارەکە نزیك بووینەوە، دەنگۆیەکم نارد تا لەناو سەربازانی دوژمندا بڵاوبکرێتەوە و ورەیان تێکبشکێنێت. ناوەرۆکی دەنگۆکە ئەمە بوو: سەرکردەی کەتیبەی ئەنسار، کە بەرپرس بوو لە بەرگریکردن لە "بەدلیس"، بە خۆی و سێ هەزار سەربازەوە بەرێوەیە بۆ ڕزگارکردنی تۆپەکان، هاوکات فەرماندەی بەناوبانگ "موسا بەگ"یش بە هەزار سەربازەوە پاڵپشتی دەکات! لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەم دەنگۆیەدا، ترس و لەرز کەوتە دڵی ڕوسەکانەوە و هەر ئەوەندەیان لەدەست هات چی زووترە هەڵبێن! پاشان سەربازەکانم دابەشکرد بەسەر تۆپەکاندا و یەك بە یەك گەڕاندمانەوە بۆ "بەتلیس"، گڕ و گرمەی گوللەش لەو نێوەندەدا تاریکایی شەوی کون دەکرد! تەنانەت بەدەستی خۆم لەگەڵ دووان لە قوتابیەکانمدا دوا تۆپمان ڕزگارکرد و هێنامانەوە!

کوڕی خۆم، لە دوایدا شاهیدی چەندین حاڵەتی سەیر و نامۆ بووین، چووینە ناو چەندین مەقامی ئیمانییەوە، ئەگەر خوای گەورە دەرگای جیهادی لەپێناوی خۆیدا لێمان نەکردایەتەوە، بێگومان بۆمان نەبوو بچینە ناو ئەو مەقامانەوە..! دەرەنجامی دروشانەوە و لێدەرکەوتنی زانستی بێگەرد و خاوێن لە قوتابخانەی یەکەمی نووردا، خوا ڕێزی لێنایین..!

خەونەکەی چیای "ئارارات" لێم جیانەدەبووەوە.. لەنێوان سەنگەرێك و سەنگەرێکی تردا، ئایەتەکانی قورئان بە وێنەی قەڵای پارێزەر لە بەردەممدا ڕاستدەبوونەوە و دەیانپاراستم.. جەنگیش بۆ خۆی جۆرێك پێشبڕکێیە، سەیرە..! پلە بەرزەکانیان بەسەرمدا دەدرەوشانەوە، وەك منارە و گومەز بەسەر جیهاندا دەیانڕوانی.. لەسەر لێوارە بەرزەکانیەوە شتانێکم دەبینی، جگە لە من کەسانی تر نەیاندەبینی..! لەناو سەنگەردا، لە هێڵی پێکدادان و ملنان و تێهەڵچووندا تفەنگەکەم ئاراستە دەکرد! هەتا کاتێك کڵپەی ئاگرەکە هێور دەبووەوە، یان لەسەر پشتی ئەسپەکەم دەستمدەکرد بە کێشانی وێنەی بینینەکانم، ئەوەی بینیم تەفسیرێکی ئیعجازی بوو بۆ قورئانی پیرۆز، کە بەخوڕ دەڕژا بەسەر زمانمدا و، منیش بۆ قوتابی نەجیب و وەجاخزادەی خۆم، مەلا حەبیبم دەخوێندەوە و ئەویش دەینووسیەوە! هەتا ئەوەی تەفسیری"إشارات الإعجاز في مظان الإجاز"..ی لێهاتە بەرهەم.

# مەقامی بەزەیی

## بەسەرهاتێک

پێی وتم:

چەکدارەکانی ئەرمەن لە چەند ناوچەیەکدا منداڵی موسڵمانانیان سەردەبڕی..! لە بەرامبەردا هەندێ موسڵمانی نەزانیش دەستیان دایە سەربڕینی منداڵەکانی ئەوان..! تا ئەو کاتەی ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا.. ئەوەبوو لە یەکێك لە پێکدادانەکاندا دوژمنمان تێکشکاند و، ژمارەیەکی زۆر لە منداڵەکانیان کەوتنە دەستمان.. سەربازەکانمان لە هەموو لایەکەوە دەوری منداڵەکانیان دابوو..! منیش لە لایەکەوە تەماشای ڕوخساری بێتاوانیانم دەکرد و، لە لایەکی تریشەوە هەستم بەو ترس و سامە دەکرد کە لێیان نیشتبوو. ئاخر ئەو خنجیلانە بێگەردانەی کە نە دەستیان هەبووە لە هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگدا و نە قاچ، کەی ڕەوایە ببنە یەکەم سوتەمەنی جەنگ، لەکاتێکدا سەرتاپا ئومێدیان بە ژیان هەیە! کام شەیتان بوو ڕێگەی دانا بۆ مرۆڤ و فێریکرد ئەو جوانییە پرشنگدارە لەو ڕوخسارە بێگەردانەدا بکوژێت؟

لە ناخی دەروونمەوە هاوارم کرد: نەخێر..! نەخێر..! تەنانەت چیاکانی

دەوروبەریشم لە ئاهو ناڵە و حەسرەتدا، خۆیان دەخواردەوە و زایەڵەی ناڵەی بریندار و خەمناکی منیان قوتدەدا..!

پاشان لەسەر پشتی ئەسپەکەمەوە لامکردەوە و هەتا هێزم تێدا بوو بەناو سەربازەکاندا هاوارم کرد:

دەستبەرداری ئەو منداڵانە ببن و هیچ ئازارێکیان پێمەگەیەنن..! هەر هەموویان ئازاد بکەن..!

دەنگێکم بیست، وەك بیەوێت پاساو بهێنێتەوە بۆ ئەو کارە:

- بەڵام..!

منیش وەك ئەوەی گوێم لە هیچ شتێك نەبووبێت، خێرا هاوارم کردەوە:

- هەر هەموویان.. بەڵێ، هەر هەموویان..! هاوار بۆ ئێوە! کوشتنی منداڵ لە ئایندا حەرامە..! حەرام..!

ئیتر بەوپەڕی پارێزراوی و سەلامەتییەوە بەرەو لای دایکانیان لە پشت هێڵەکانی ڕوسەوە بەڕێمانکردن..!

وەك ئەوە وابوو بە زمانی حاڵ پێیان بڵێین: ئەمە ئاینی ئێمەیە -ئەی ڕوسەکان- دەبا ئاینەکەی ئێوەش بێتە زمان و قسە بکات! بەم شێوەیە، بەدەم شوکرانەبژێری و یادی خواوە گەڕاینەوە. ئەوەش گفتوگۆیەکی ئیمانی زۆر سەیر بوو.. دڕندە نامەردەکانی جەنگی لاڵکرد..!

ئەوە وانەیەکی بەنرخ و پەند و ئامۆژگارییەکی کاریگەر بوو بۆ ئەرمەنەکان، پاڵی پێوەنان سەریان لە ڕەوشتی موسڵمانەکان سووڕبمێنێت، هەربۆیە

سەربازەکانیان دەستیان لەو نەریتە ناشرینەی خۆیان هەڵگرت و وازیان لە سەربڕینی منداڵی مسوڵمانەکان هێنا.

ئەمەش بۆ خۆی بووە پەیماننامەیەکی کردارییی لە نێوانماندا، بێئەوەی هیچ بەڵگەنامە و پرۆتۆکۆڵێك لە ئارادا بێت..!

پاشان قوتابییەکان سەرکەوتن بۆ ئاستی پۆلی دووەم لە سەنگەری جیهاددا، لێدەرکەوتن و درەوشانەوەکانیش یەك لە دوای یەك بەردەوام بوون.. هەتا تاقیکردنەوەی دووەم هاتە پێش.. کوڕی خۆم ئەمەیان لە تاقیکردنەوەی یەکەم سەیر و نامۆتر بوو.. ئەوەش لە جەنگی "بەتلیس"دا بوو، لەو کاتەدا من لە بەرەی پێشەوەی شەڕدا بووم، بۆردومانکردنی سەر موجاهیدەکان تاوی سەندبوو، بەو هۆیەوە سێ گوللەی ڕوسەکان چەند شوێنێکی جەستەمی پێکا، بەڵام من هەر سووربووم لەسەر مانەوەم لە بەرەی جەنگدا. چەند کاتژمێرێك بۆردومانەکە بەردەوام بوو.. تا ئەو کاتەی موشەکی شکان و دیلی هاتە پێش..!

دەبوو نەگۆشت و نە ئێسقانم هیچی نەمێنێ! مەگەر پارچەکانی سەربازێکی نەناسراو لەپاش شەڕەکە کۆبکرێتەوە..! لەئەنجامی تەقینەوەی موشەکەکانی دوژمن، بەجارێك لە چوار لاوە پێکرام. هەستمدەکرد دەوروبەرم خاپوور بووە. ژانی زامێکی قووڵ هەموو کیانمی دەگوشی، کەوتمە چاوەڕوانیی مەرگ.. بەڵام هەر کە پەردەی تەپوتۆز و دووکەڵی جەنگ لادرا، خۆمم بینی بە قاچێکی شکاوەوە لەسەر زەوی ڕاکشاوم و زامێکی قووڵی تێبووە.. خەڵکانێکم بینی توندی بۆردومانەکە لەتوپەتی کردبوون، لەولاشەوە جەستەی شەهیدەکان کەوتبوو و، ڕۆحیشیان بەرەو هاوڕازە بڵندەکان پەروازی دەکرد..! لە گۆڕەپانی سامناکی جەنگدا جگە لە بێدەنگی شتێکیتر نەدەدوا..!

بەفریش سەرتاپای زەمینی داپۆشیبوو، سوپای ڕوسیش گەمارۆی شوێنەکەی دابوو.. منیش لە سەنگەرێکی تەسك و تروسکدا لەناو قوڕ و لیتەدا بە زامداری کەوتبووم، جەستەی تێکشکاوم ژەهری ئاوی سارد و لیتاوی بە زەحمەت قوتدەدا..!

پاش کەمێك ئەو قوتابییانەی کە مابوون بەپەلە هاتن بۆ لام،کە بەو حاڵەوە بینیانم، دەستبەجێ تفەنگەکانیان خستە ژێر قاچە شکاوەکەم! ئەوان بە چەندین شێوە سەیری منیان دەکرد، منیش بە شێوەیەك سەیری ئەوانم دەکرد، دەبوو شتێك بڵێم:

- براکانم..! قەدەر بڕیاری دیلی بەسەردا داوم..! ئێوەش بیر لە ڕزگارکردنی خۆتان بکەنەوە..! پێویست ناکات ئێوە هەمووتان لێرە بمێننەوە.. خێرا بکەن بڕۆن ئەم شوێنە بەجێ بهێڵن..!

..................

شینایی ئاسمان بەسەر ڕووی زەویدا شکایەوە!.. وتەکان زۆر سەخت بوون لەسەر دڵی قوتابییە دڵسۆزەکانم.. چونکە ئەو دڵانەی خۆشەویستی خوای گەورە کۆی کردوونەتەوە، مەگەر مەرگ، ئەگینا هیچ شتێك لەیەکتر جیایان ناکاتەوە..! لەبەر ئەوە هەر کە مامۆستا لە خەمە قووڵەکەی بووەوە، هەمووان بەجارێك دایانە پڕمەی گریان..!

یەکێکیان هاتەگۆ و وتی:

- بۆ کوێ بڕۆین مامۆستا گیان؟ بەم حاڵەوە چۆن بەجێت دەهێڵین؟ مەگەر مەردایەتی و بوێریمان لەدەستداوە؟ سوێند بە خوا تا ئەو ساتەی

لە خزمەتی تۆدا بین، چ بمرین چ بە زیندویی بمێنین، بەلامانەوە یەکسانە، ماموستا گیان هەرگیز ناڕۆین! بەڵکو هەر لێرەدا لەگەڵ تۆدا دەمرین!

سی و چوار کاتژمێر لە ترس و ئازار وەکو چەندین مانگ بەسەرماندا تێپەڕبوون، بەبێ خواردن و خواردنەوە، بەبێ دەرمان و فریاکەوتن! سەرماکە زۆر سەخت بوو، بەفریش لەولاوە بێ وچان دەباری و هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو، تەرمەکانیش لێرەو لەوێ دەنێژران و بەخاك دەسپێران.. جگە لە قەلە ڕەشەکانی جەنگ کە ورگیان تێربوو، برسێتی پەلاماری هەموو شتێکی دەدا و لەناوی دەبرد!

لە کۆتاییدا ڕایان هاتە سەر ئەوەی یەکێکیان بچێت بۆ سەربازگەی ڕوسەکان و هەواڵی شوێنەکەیان پێ بدات.. ئەوەبوو بە دیلی براین بۆ سەربازگەی سیبریا..!

## مەقامی شەهیدبوون

**پاشماوەی بەسەرهاتەکە:**

پێی وتم:

"سیبریا" وڵاتی مەرگی لەسەرخۆیە.. لەوێ پلەی گەرما دێتە خوارەوە بۆ دەیان پلەی سەدیی ژێر سفر، وەچە لە پشتی پیاواندا دەمرێت و، فرمێسك لە چاواندا دەیبەستێت و، گریانیش مەحاڵ دەبێت..! گڤە و گەردەلوولی بەفر شێوەن بۆ چەوساوەکان دەکات! لوتبەرزی و لەخۆبایی بوونی روسیانەش زوڵم و زۆرداری بە کەلەسەری مردووان و جەستەی بەستووەکانی ناو بەفر، هەتا مەرگی شین بنیات دەنێت! ناو بەناویش ملهوڕی جەنگی ڕوسی "نیکۆلا نیکۆلاڤیچ" خاڵی قەیسەر و فەرماندەی گشتی بەرەی قەفقاز، دێت و دەچێت و بەوناوەدا تێپەڕدەبێت.. هێز و بازووی دەسەڵات و زۆرداریی ڕوسی بەسەر دیلەکانەوە، لە نەتەوە و ڕەگەزە جیاوازەکان نمایش دەکات. هەتا کاتێك بە ئەسپەکەیەوە لێیان نزیك دەبووەوە، هەمووان وەك گوزارشت لەملکەچی و گوێڕایەڵی، ڕادەپەڕین و دەستەنەزەر لە بەردەمیدا ڕادەوەستان! ڕێسا و پەیڕەوی بەندینخانە بەو جۆرە بوو. هەتا ئەوەبوو ڕۆژی بەدیعوززەمان هاتە پێش.

ئا ئەوەتا فەرماندەی گشتی لەبەردەم تارمایی دیلەکاندا ئامادەیە..

ئەمەش پەیکەری لەڕ و لاوازی ئەوانە بە پەلە سڵاوی لێدەکەن و لە بەردەمیدا ڕادەوەستن.. چاوە شینەکانی بەناو ڕیزەکاندا دەگێڕا و نیشانەی زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزیان بەسەرەوە دیاربوو، ژەهری شەماتەت و پێ خۆشبوونیان لێ دەڕژا و، شەرابی فیز و خۆبەزلزانینیان دەنۆشی! هەموو ڕیزەکان ڕێك و ڕاست بوون، تەنها یەك ڕیز نەبێت کەلێنێکی تێدا بوو! تەنیا پیاوێك بە هێمنی و لەسەرخۆییەکی سەرنجڕاکێشەوە لە جێگەی خۆیدا دانیشتبوو! سوپاسالار لە تووڕەییدا برۆکانی گرژکرد و! بەرەو ئەو لایە ڕووی وەرچەرخاند، پاشان سەیری کرد، پاشان ڕووی گرژ کرد و چارەی ترش کرد..! وەکو بڵێی بڕوای بەوە نەدەکرد لە بوونەوەردا شتێك هەبێت لەبەر قەدر و ڕێزی ئەو هەڵنەستێتەوە..! نزیك بووەوە لە پیاوەکەی لای چەپی، بەڵام ئەو بێئەوەی گرنگی بە هیچ بدات لە شوێنی خۆی تەخت دانیشتبوو..! ئەم جارەیان سوپاسالار ویستی سەرنجیڕابکێشێت، نەبادا ئاگای لێ نەبووبێ یاخود نەیناسیبێتەوە. بۆیە سەرلەنوێ بە بەردەمیدا تێپەڕی. کەچی دیسانەوە هیچ جۆرە کاردانەوە و گرنگی پێدانێکی لێوە بەدی نەکرد! سەیرە..! ئەمە چییە..؟

سوپاسالارەکە، بە هەڵچوونەوە پرسیاری لە وەرگێڕەکە کرد:

- ئایا نەیناسیم؟

بەدیعوززەمانیش بە هێمنی و لەسەرخۆییەکی قووڵەوە، دەڵێ:

- بەڵێ دەتناسم!.. تۆ نیکۆلا نیکۆلاڤیچ، خاڵی قەیسەر و فەرمانەدەی گشتیی بەرەی قەفقازیت!

- کەواتە لەبەرچی دەتەوێ سوکایەتیم پێ بکەیت؟

- نەخێر! ببوورە..! من سوکایەتیم بە تۆ نەکردووە. بەڵکو تەنیا ئەوەم ئەنجامداوە کە بیروباوەڕەکەم فەرمانم پێ دەکات!

سوپاسالاریش بە ڕق و کینەوە ددانەکانی جووت دەکات و بە گاڵتەجاڕییەوە دەڵێ:

- بیر و باوەڕەکەت؟ فەرمانی چیت پێ دەکات؟

- من زانایەکی موسڵمانم، لە دڵمدا ئیمانم هەڵگرتووە، ئەو کەسەی ئیمانی لە دڵیدا هەڵگرتووە، چاکترە لەوەی ئیمانی نییە. خۆ ئەگەر لەبەر تۆ هەڵبستامایە، ئەو کات قەدرنەزانی و بێڕێزیم بەرامبەر بیروباوەڕەکەم ئەنجامدەدا.

چاوەکانی سوپاسالار بەر لە لێوەکانی هاتنە قسە و بڕیاریاندا: "بێگومان تۆ دەبێ بمریت!" ئەوجا تۆمەتباری کرد و وتی:

- لەو ڕووەوە کە تۆ سیفەتی "بێ ئیمانیت"دا بەسەر مندا، ئەوا بزانە کە بەو هەڵوێستەت سوکایەتیت بە خودی من و سوپاکەم و نەتەوەکەم و تەنانەت قەیسەریش کردووە، دەسا با هەر ئێستا دادگایەکی سەربازی پێکبهێنرێت!

لە بەرامبەر ئەمەدا دیلە تورك و ئەڵمان و نەمساوییەکان، کە زۆر چاك شارەزای خەشم و قینی ڕوسەکان بوون، دەوریان لێدا و تکایان لێکرد کە چی زووترە پۆزش بهێنێتەوە و داوای لێبووردن لەو زاڵمە بکات.

ئەویش لە بێدەنگییەکی قووڵدا ڕۆچووبوو، لە هەمان کاتدا سەیری ئاسمانی دەکرد و گوێیشی لە وتە دڵسۆزانەکانی ئەوان دەگرت، هەر کە ئەوان لێبوونەوە، بە دەنگێك کە لە دەنگی ڕۆژی دوایی دەچوو، هاتە گۆ و وتی:

- سوپاستان دەکەم بۆ ئەو خەمخۆری و دڵسۆزییەی بەرامبەر من هەتانە!

بەڵام بەرێزان بمبوورن! چونکە من لەڕاستیدا حەزدەکەم کۆچبکەم بۆ ئەو دونیا! تامەزرۆی ئەوەم بە خزمەتی پێغەمبەری نازدار بگەم! بۆ ئەمەش پێویستم بە جەوازێکی سەفەر هەیە پێی بچم بۆ ئەو دونیا..! پاشان من ناتوانم بە پێچەوانەی ئیمانەکەمەوە ڕەفتاربکەم.. بۆیە داوای لێبووردن دەکەم..! کە دەستدەنێم بە ڕووی تکاکەتانەوە.

- بێدەنگی باڵدەکێشێ بەسەر هەمووانداو، ئەوە نەبێت لێرە و لەوێ دیلێك لە داخ و پەژارەدا ئاخی هەڵدەکێشا و گڕی گەرمای دەروونی خەمباری پەردەی بێ دەنگییەکەی دەدڕان، بە دوودڵیەوە لەنێو بەزەیی پێداهاتنەوە و سەرسام بووندا سەیری بەیعوززەمانی دەکرد..!

تەنیا چەند ساتێکی بەسەرداچوو، هەتا دادگا بەگوێرەی بڕگەی سوکایەتی کردن بە قەیسەر و سوپای ڕوسی، بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکرد! پاشان پۆلیسی سوپا بە فەرماندەیی ئەفسەرێك ئامادەبوو بۆئەوەی بیبەن بۆ گۆڕەپانی لەسێدارەدان. بەدیعوززەمانیش هەڵدەستێتەوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە بە ئەفسەرەکە دەڵێ: تەنها پازدە خولەك ڕێم بدەن بۆئەوەی دوا ئەرکی سەرشانم بەرامبەر پەروەردگاری خۆم ئەنجامبدەم..! مۆڵەت دەدرێت.. ئیتر هەمووان دەکەونە تەماشاکردنی بۆئەوەی بزانن چی دەکات؟

پیاوەکە دەستنوێژ هەڵدەگرێت و ڕوو دەکاتە قیبلە، پاشان دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و بەدەم "اللّٰە أکبر"ەوە دەچێتە ناو جیهانی بەرینی نوێژەوە..!

- اللّٰە أکبر..!

بەوێنەی دارخورمایەکی بەژن باڵا ڕاوەستا بوو.. چاوەکانیشی بڕیبووە

زەوی. لێوەکانیشی بە هێواشی دەجووڵاند.. پاشان ڕکوع و سوجدە دەبات.. لە گەشتێکی گەردوونیدا هەرچی شت هەبوو لە دەوروبەریدا، لە دار و درەخت و مرۆڤ، دەداتەبەر و، هەر هەموویان بەرەو مەلەئی ئەعلا بەرزدەکاتەوە و سەریاندەخات..! پەراسووەکانی بەفریش لەژێر پێکانیدا دەتوێنەوە، کە کڕنووشیشی دەبرد، جۆگەلەی فرمێسك لە چاوی بەردەکانەوە سەری دەکرد..! لەولاشەوە بەهۆی کڵپەی شەوق و تاسەی گەیشتن بە خوا، کە لە دڵیەوە دەهاتە دەر، ئەو دڵەی کە بە ترس و ئومێدەوە جگە لە خوا دەستبەرداری دونیا ببوو، هەموو شتێکی دەوروبەری گڕی گرتبوو..!

لە نزیك گۆڕەپانەکەوە، سوپاسالار لە شوێنێکی بەرزەوە چاودێریی بەدیعوززەمانی دەکرد بزانێ چی دەکات.. چاوەکانی ئەبڵەق ببوون. حاڵەتێکی وەك ترس یان سەرسوڕمان، یان شتێکی هاوبەش لەنێوان ئەو دووانەدا خۆی فڕێ دەدایە ناویانەوە..! وەکو بڵێی هێزێکە و جەستەی سەرسەخت و زۆرداری ئەو دەداتە بەر بڵێسەی ئاگر..! بۆیە شوێنەکەیی بەجێهێشت تا ڕزگاری بێ لەو شتەی کە نەیدەزانی چییە.. بەڵام ناتوانێ ڕزگاری ببێ! پاشان بەوپەڕی هێزەوە دەربەڕی بۆئەوەی خۆی لەبەردەم بەدیعوززەماندا ببینێتەوە، وەك بڵێی کەسێکی تر لەسەر زمانی ئەو دەدوێ و، بە دەنگێکی کز و ملکەچەوە دەڵێ:

- ببوورە! من داوای لێبووردنتان لێدەکەم! من وامزانی مەبەستتان سوکایەتی کردن بوو بە من، بۆیە منیش لە بەرامبەردا ڕێوشوێنی یاساییم گرتەبەر.. بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە ئێوە بە ئیلهام وەرگرتن لە ئیمانەکەتانەوە ئەو کارەتان ئەنجام داوە، وە ئەوە جێبەجێدەکەن کە بیروباوەڕەکەتان فەرمانتان پێ دەکات! من حوکمەکە هەڵدەوەشێنمەوە! لەڕاستیدا حوکمێکی ناڕەوابوو! ئێوە بەهۆی تەقوا و

چاکەکاریتانەوە شیاوی هەموو ڕێز و سەرسوڕمانێکن! دووبارە داوای لێبووردنتان لێدەکەم، چونکە بەڕاستی ئێوەم بێزارکرد! جارێکی تر تکادەکەم لێم ببوورن..!

چ دیلەکان و چ ئەفسەرە ڕوسەکانیش بە سەرسامییەوە سەیری ئەو دوو پیاوەیان دەکرد..! ئایا ئەمەی دەیبینن حەقیقەتە یان خەیاڵ؟ چۆن؟ لەپێش بەدیعوززەمان کەس لە زەبروزەنگی "نیکۆلا" ڕزگاری نەبووە!

چاوی زۆرێك لە دیلەکان لە دەریای فرمێسکدا نوقم ببوو، خۆیشیان نەیان دەزانی داخۆ لە خۆشی مامۆستاکەیان دەگرین، یان لەبەر کەرامەتی ئیمان و سەربەرزیی ئیسلام؟

## مەقامی فریاکەوتن و بەهاناوە هاتنی خوایی..!

پێی وتم:

ئەوەش کاتێك بوو کە لە باکووری خۆرهەڵاتی ڕوسیا دیل بووم، لە شارێکی بچووکدا کە پێی دەوترا "قوستورما"..لە نزیك یەکێك لە کەناراوەکانی ڕوباری بەناوبانگی "ڤۆڵگا" مزگەوتێکی لێبوو تایبەت بە تەتارەکان، لە پەنجەرەی بەندیخانەکەمەوە بۆم دەڕوانی و وام هەستدەکرد لە میحرابە خەمبارەکەیدا نوێژدەکەم.. پاشان ڕێگەم پێدرا بچمە دەرەوە بۆ نوێژکردن لەو مزگەوتەدا، بگرە جاروبار هاوشێوەی ژیانی کەسێکی دوورخراوە، لەژێر چاودێری و پاسەوانیدا شەو تیایدا دەمامەوە، ئەگەرچی تا ڕادەیەك ئازادیم بەدەستهێنابوو، بەڵام لەبەرئەوەی لەو ناوچە دابڕاوەی جیهاندا هەستم بە نامۆی و تەنهایی دەکرد، خەم و پەژارە هەراسانیان کردبووم!

ڕووداوەکەی سوپاسالاریش بووە ڕەحمەتێکی خوایی و داباری بەسەرمدا. بەو هۆیەوە ئەو چاودێرییە چڕوپڕەی بەسەرمەوە دانرابوو تا ڕادەیەك سووك بوو.. وەك بڵێی مۆڵەتی شتێکم پێ درابێت..!

تاکە کەشتی من لەو شەوە دوور و درێژە خەماویانەدا، کە ئاوێتەی ئازاری جودایی و غوربەت بوون، بریتیبوو لە دەستەوسانی و هەژاریم، هەموو

ئێوارەیەك سواری دەبووم و بەرەو لای خوا دەریام تەی دەکرد و، لەو ڕێگەیەوە لە دەرگای ڕەحمەتی ئەو زاتە نزیك دەبوومەوە.. خوێندنەوەی قورئانیش لەو ساتەدا تام و چێژێکی وای هەبوو لە دڵمدا هەرگیز لەوەوپێش هەستم بە تام و چێژ و شیرینی وەها نەکردبوو! وە هەرگیز لە ژیانمدا بەو شێوەیە جوانیی نوورەکانیم نەبینیبوو! بەڕاستی لەو ساتەوەختانەدا کە لە حوزووری پەروەردگاردا ملکەچ ڕادەوەستام، دەمبینی قورئانی مەزن بەهانامەوە دێت و نووری خواییش جوانی بەسەرمدا دەڕژێنێت..! هەروەك بڵێی لەبەرچاومدا پەردە لادرا و زەوی هاتەوە یەك و ڕێگای ئەستەمبوولیش تەخت و بەرین هاتە پێشچاوم..! سەیرە، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە من لە نیوەی باکووری گۆی زەویدا لە مەنفا بووم، کە خۆی لە خۆیدا مەنزڵی نائومێدی و بێ هیوایی بوو..! لە شەوێکدا نازانم چ شەوێك بوو، وەك چۆن پێغەمبەرمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە شاری مەککە لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە و هیجرەتی کرد، منیش لە بەندیخانەکەمدا هاتمە دەرەوە، پاسەوانەکان لە بەردەم دەرگاکەدا وەستابوون، بەڵام نەیان دەبینی..!

زەوی لەژێر قاچمدا دەپێچرایەوە، بەڵام چۆن پێچرانەوەیەك..! هەروەك چۆن هەڵۆیەك باڵە بەهێزەکانی پاڵی پێوە دەنێن و بەرە و پێشەوە هەڵمەت دەبات، بەو شێوەیە پەراسووەکانم تەکانیاندەدا و پاڵیان پێوەدەنام، لەناو سەرما و سۆڵەی سەخت و بەفر و سەهۆڵبەندانی ڕوسیادا، جەستەم لەتاو گەرموگوڕی و داگیرساویی ناو خوێنم ئارەقی لێ دەڕژا! سەیرە..! جاروبار هەستم دەکرد ئەسپی ڕەشەبا خۆی دەکا بەنێو قاچەکانمدا و، وەك بڵێی ئەسپێکە و هەڵمدەگرێ و بە نەرمی دەمبات بۆ ئەو شوێنەی کە دەمەوێ بۆی بڕۆم!

-کوڕی خۆم- ڕاستییەکەی من تاوەکو ئەمڕۆش سەرسامم...!

نازانم چۆن توانیم لە ناو مشتی ئاسنینی ئەوانەدا هەڵبێم؟ و، بە چ شێوەیەك توانیم لە چەند ڕۆژێکی کەمدا بگەمەوە ئەستەمبووڵ..؟ نازانم چۆن ئەو هەموو ماوە دوور و درێژەم بەپێ بڕی؟ دوورییەك کە بەپێ بە ساڵێکی تەواو نابڕرێت! ئەمە سەرباری ئەوەی کە هیچ شارەزاییەکم لە زمانی ڕوسیدا نەبوو! پاشان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە دیلی ڕزگارم بوو! بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە ئەوە جگە لە فەزڵ و چاکە و کۆمەکی خوایی، کە لەو ساتەدا لەبەر دەستەوسانی و لاوازی خۆم بە هانامەوە هات، هیچیتر نەبوو... تاکو ئێستاش بیر دەکەمەوە و دەڵێم چۆن لە ڕوسیا دەرچووم و لەڕێی "وارشۆ"، پاشان "ڤیەننا" و... پاشان... گەیشتمەوە ئەستەمبووڵ! زۆر سەیرە! بە ویست و فەرمانی خوای باڵادەست لەو دیلییە ترسناکە ڕزگارم بوو..! سوپاس و ستایش و پیزانین تەنها بۆ خوایە و بەس!

## مەقامی ئاهەنگ و شادی

هەرکە پێم خستە ناو شەقامەکانی ئەستەمبووڵەوە، بەرەو کوچە و کۆڵانە خەمبارەکانی پێشڕەویم کرد، خێرا لەناو گەورە و بچووك و دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتدا هەواڵ بڵاوبووەوە: بەدیعوززەمان هاتەوە! زانای موجاهید هاتەوە..! گەورەی پاڵەوانان هاتەوە! چەندین سیفات و نازناوی تر، کە لەسەر شانم زۆر قورس بوون، تەنانەت بیرم لە ڕاکردن دەکردەوە..! دواتر زانیم هەواڵی شەڕەکان لە سەربازگەکەی ئێمەوە یەك لەدوای یەك گەیەندراونەتە دارولخەلافە و مەشیخەی ئیسلام.. زۆری پێنەچوو نوێنەری خەلیفە هات بۆ لام و بانگهێشتی کردم بۆ لای سوڵتان، منیش دەبوو وەڵامی بانگێشتەکە بدەمەوە.. ئەوەی لە چاوەڕوانیمدا بوو هەرگیز پێشبینیم نەکردبوو: پێشوازییەکی فەرمی..! وەی لە من! من چیم داوە لەمە؟ چۆن؟ من جگە لە پیاوی بەندینخانە و مەنفا و تارمایی چۆڵەوانییەکان هیچی تر نیم؟!.. ئا ئەوە سوڵتان خۆیەتی، ئەوەش شێخولئیسلام، فەرمانداندەی گشتی و، ئەوانەش قوتابیی زانستە شەرعییەکانی ئەستەمبوڵ، هەر هەموویان بۆ پێشوازیکردن لە من بەڕیز وەستاون.. دیمەنێکی جوان و شکۆدار بوو..!

ئەوەش لە ڕۆژی نۆزدەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی١٣٣٦ی کۆچی، بەرامبەر هەشتی یۆلیۆی ساڵی ١٩١٨ی زایینیدا بوو، پێشوازییەکی گەرمم لێکرا

و زیاتر لەوەی من شایانی بم، ڕێزم لێنرا.. لە چاوی سوڵتان و شێخولئیسلامدا -لە جەرگەی ئەو خۆشی و شادییەدا- نیشانەی خەم و پەژارەیەکی قووڵم بەدیدەکرد، وەك ئەوەی شتێکی مەزنیان لەدەستچووبێت..! نەمدەزانی داخۆ تێکشکانی دەوڵەتی عوسمانییە بەهۆی زاڵبوونی تارماییەکانی تاریکییەوە، یان فەوتانی دەسەڵات و نەمانیەتی لەدەست سوڵتاندا!؟ ئەوەبوو ئیتتیحادییەکان بە فیعلی شاری ئەنقەرەیان کردە پایتەختی خۆیان! لەوێوە فەرمانەکان دەردەچوون و کاریان پێ دەکرا! سوڵتانیش بە فەرامۆشکراوی بۆ خۆی لە ئەستەمبوڵ مایەوە و، مەشیخەتی ئیسلامیش -لەپاڵ ئەودا- وەکو پارچەیەکی مۆزەخانەی لێهات کە مێژووی ڕابردووی دەهێنایەوە یاد! وەکو بڵێی دەربڕینی خۆشی و شادومانی بەناوی منەوە، جۆرێك بوو لە گوزارشتکردن لە پەشیمانی، یان کەفارەتی زیادەڕەوەی و کەمتەرخەمی.. لەبەرئەوەی کاروباری دەوڵەت درایە دەست شەیتانەکان و، جڵەویش بۆ جولەکە شلکرا، تا ئاگر بەربداتە گەل و وڵات! ئەهلی حەق و عەدلیش لەو زانایانەی کە دڵسۆزی خەلافەتی ئیسلامی و سوڵتان بوون، دوور خرانەوە، سەرئەنجام ئەوە بوو کە ڕوویدا!

## بەندیخانەی زانست...!!

ئەوەبوو دواتر لە دامەزراوەی "دارولحیکمەی ئیسلامی" لە ئەستەمبووڵ بە ئەندام دیاریکرام... نزیکەی سێ ساڵ تێیدا مامەوە.. دارولحیکمەی ئیسلامی -کوڕی خۆم- لەو ڕۆژانەدا سەر بە مەشیخەی ئیسلامی گشتی دەوڵەتی عوسمانی بوو، تەنیا زانا گەورەکانی لەخۆ دەگرت، وەکو: شاعیری ئیسلام محمد عاکیف، دانەری سروودی نیشتمانی تورکی و، ئیسماعیل حەققی ئیزمیرلی و حەمدی ئەلمالیلی و، کەسانی تری وەك ئەوان... بەڵام دواتر چی؟ هەر ئەوە پرسیارەکە و هەر ئەویش کێشەکەیە!

ئەوەندەی پێ نەچوو بۆمدەرکەوت کە شوێنی ڕاستەقینەی من ئەوێ نییە! هەستم بەوە کرد دەبێت بگەڕێم بەشوێن سەری ئاشوبەکەدا، چونکە بڕینی کلکی مارەکان بەتەنها هیچ سوودێکی نییە! هەموو ئەو سیمایانەی حاڵی حازر دەیانبینین، پەیکەری مردوون! و حەقیقەتی خۆیان لەدەستداوە، زیاتر لە یاری منداڵانە دەچن بۆ فریودانی خەلیفە و زانایانی موسڵمان، تارماییەکانی تاریکی تا ماوەیەکی دیاریکراو وازیان لێ هێناون..! کەواتە دارولحیکمە! بەندینخانەیەکە لە جۆریکی تر! بۆیە پێش ئەوەی کات درەنگ بکات، دەبێ بڕۆم..!

دەبا ئێستا دەست بەگەڕان بکەین!

ڕۆحم لە ناخمدا ڕاپەڕی و وەکو گەردەلوول دەستی کرد بە جموجووڵ بۆ دۆزینەوەی ئەرکە شاراوەکەم، ئەمە چ جای ئاشکراکردنی ئەو ڕاستییەی کە هێشتا ئاشکرا نەبووە، دەستمکرد بەگەڕان!

بەڵکو ڕاپەڕین و بزاوتێکی بەگوڕ، سا بەڵکو ببێتە مایەی سەرئاوکەوتنی مارەکان لە بنی دەریاچە تاریکەکەدا.

پێی وتم!

دەبوو سەعیدی نوورسی تاقیبکرێتەوە! تاکو دەربکەوێت داخۆ بەدیعوززەمانە یان بیدعەتوززەمان؟ دەبێت عەزیمەت و لێبڕانی ڕۆح و ڕادەی دڵسۆزی و بێگەردییەکەی تاقیبکرێتەوە، ئەگینا سواربوونی پشتی دەریا بێهوودەیە! دەبا یەکەم هەنگاو خاڵیکردنەوەی دڵ بێت لە غەیری خوا! دەبا یەکەم جار بەرگی دنیا لەبەرم داماڵم! پاشان با ئەو بڕە پارەیەی کە وەکو مانگانە لە دارولحیکمە وەری دەگرم، وەقفی بکەم بۆ بانگەواز بۆ لای خوا و جیهادکردن لە ڕێگای ئەودا، جگە لە بەشی بژێوی خۆیشم هیچی لێ هەڵنەگرم! ئەمە یەکەم خۆنوقم کردنە بەرەو بنی دەریاکە!

سەیری قوتابیی ڕەسەن و وەجاخزادەی خۆی، عەبدوڕەحمانی برازای کرد، ئەوەدەم سەرپەرشتیکردنی خەرجی ڕۆژانەی خۆی خستبووە ئەستۆی ئەو، خۆی ئاسا لەگەڵی دوا و وتی:

عەبدورڕەحمان! پاشەکەوتکردنی ئەم ماڵ و سامانە بە تۆ دەسپێرم!

لاوەکە لەم کارە نامۆیە سەری سوڕما، چونکە لەڕاستیدا ئەو مانگانەیە شتێکی وای زیاد نەبوو تا پاشەکەوت بکرێت، بەڵکو ئەوە نزمترین ئاستی

ژیانێکی سەربەرزانە بوو! پاشان بەوپەڕی بەزەیی و دڵسوتانەوە داوای ڕوونکردنەوەی لێکرد:

- لەبەر چ هۆکارێك مامە گیان! بۆچی بەم شێوەیە خۆت تووشی تەنگانە و ناڕەحەتی دەکەیت؟

- دەمەوێ وەکو زۆرینەی خەڵك بژیم!.. مەگەر حاڵی ئوممەت نابینی؟.. ئەوەتا بە بڕێکی کەم لە ماڵی دونیا ژیان و گوزەرانی خۆیان بەڕێ دەکەن. من نامەوێ چاو لە کەمینەیەکی دەستبلاو بکەم!

ئەی عبدورڕەحمان ئازارەکانی ئوممەتی ئیسلام منیان هاڕی!.. دەوڵەتی عوسمانی تێکشکا!.... ئەی عبدورڕەحمان دەتوانم بەرگەی ئازارەکانی خۆم بگرم، بەڵام ئازارەکانی ئوممەتی ئیسلام نەخێر..! ئەی عبدورڕەحمان من وا هەست دەکەم ئەو تیرانەی ئاڕاستەی جیهانی ئیسلامی دەکرێن، یەکەم جار بەر دڵی من دەکەون! ئاهو ناڵە، ئاخ و داخ..!

پیاوەکە چووە ناو ئەزموونێکی ویژدانیی قووڵ و، زوهد و دونیا نەویستییەکی ڕۆحانیی بەرزەوە!.. بەڵام عەبدورڕەحمان لەوە لاوازتر بوو بەرگەی ئەو ڕێڕەوە توند و دژوارە بگرێت! لەبەر ئەوە جاروبار لەو بڕە پارەیەی کە بڕیاربوو پاشەکەوتی بکات، بە نهێنی ئەوەندەی سەروبەر بەشی شێخ بکات خەرجی دەکرد، یان ئەوەندەی کەمێك تاڵاوی مەینەتیی لەسەر سووك بکات! ئەوەش تەنها لەبەر شەفەقەت و سۆز و بەزەیی پێداهاتنەوە بوو! وای بە چاك دەزانی یان بە مێشکیدا دەهات!

هەتا ئەوەبوو ڕۆژێکیان کارەکە ئاشکرا بوو! شێخ لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی و، بە توندی هاواری کرد بەڕووی قوتابیەکەیدا:

تۆ دەتەوێ چی بکەیت؟ ئەم ماڵ و سامانە بە ئێمە حەڵاڵ نییە! ئەوە ماڵی ئوممەتە! بۆچی خەرجت کرد؟... هەڵسە! ئەوا لە سەرپەرشتیکردنی کاروبارەکانم لامدایت. خۆم لەباتی تۆ ئەو کارە دەکەم!

شێرەکە بەتەنیا چووە ناو پێشەڵانی دارستانەکەیەوە..! جگە لە ئەبدالەکانی ڕۆژگار کێ دەتوانێ بەرگەی ڕێبازی سددیقان بگرێت!

چەندین ڕۆژ و مانگ تێپەڕین.. دواجار درەوشانەوەکانی ڕێبازەکە بەرهەمی خۆیاندا.. بێگەردیی ڕۆح چەندین ئاوێنەی بریسکەداری هەیە! هەر کات لە دارولحیکمە کارەکەی تەواو دەبوو و کۆڕ هەڵدەگیرا و زانایان بڵاوەیان لێدەکرد، ئەو بەتەنیا ڕووی دەکردە خەڵوەتگاکەی و بەرەو یەکێك لە لوتکە بەرزەکانی تەپۆڵکەکەی ئەستەمبووڵ دەکەوتە ڕێ، لە بەرزاییەکەوە سەیری جوانیی بۆسفۆڕی دەکرد، یان دەیڕوانی بەسەر دەریای مەڕمەڕەی دڵگیر و خەمڕەوێندا، وتەکانی خۆری ڕەسەنی دەخوێندەوە، کاتێك کە هۆنراوەی ئومێدی لەسەر ڕوومەتی ئەستەمبووڵی لێو بەبار و چاو بەفرمێسکدا دەنووسیەوە!

ئەوە بوو بینی، ئەوەی کە بینی!..

ئاسۆ گڕی گرتبوو، بە زمانە سوورە ترسناکەکەی ئاگری بەردەدایە هەر شتێك بڵێسەکەیی پێ دەگەیشت... گەردەلوولی سوتانەکەش، بەوێنەی بۆگەنترین شت کە هەبێت، دەکەوتە بەر لوتم! اللّٰە! ئەمە چییە بەرێزان؟

وەکو کەسێکی دادڕەس بەسەرسامیەوە سەیرم کرد! خێرا وەکو فەرماندەیەکی سەربازی، کە فەرمان بدات بە خۆ ئامادەکردن، یان شتێك کە لە ئاگادارکردنەوە بچێت ،هاواری کرد و پێی وتم:

- علوجەکان بەرەو ئێرە دێن!

سەیری کاتژمێری زەمانەم کرد: بینیم ئەو ڕۆژە ١٣/ ١١/ ١٩١٩ی زایینیە، لەو ڕۆژەدا پەنجا و پێنج کەشتیی جەنگی لە کەشتیگەلی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان هاتنە ناو ئەستەمبوولەوە، ئەوەش بەپێی گرێبەستی "موندروس" کە لە ڕێککەوتی ١٩١٨/١٠/٣٠ی زایینیدا بەسترابوو. بیست و دوو کەشتیان هی ئینگلتەرا و، دوازدەشیان هی فەرەنسا و، حەڤدەشیان هی ئیتالیا و، چواردەیشیان هی یۆنان بوون! پاشان ڕووی تۆپەکانیان کردە کۆشکی خەلیفە! ئەو خەلیفەیەی کە وەك دەستبەسەرێك لە کۆشکی "دولمە باخچە" دەمایەوە و شتێکی لەدەستنەدەهات.

پاشان ئینگلیز لە ١٨ ی ئازاری ساڵی ١٩٢٠دا ئەستەمبوولی داگیرکرد. بۆنی خیانەت و ناپاکییەکی بێ شەرمانەم دەکرد! بەڵام لەکوێ و چۆن؟

پاشان ختوورەیەکی سەیر هاتە ناو دڵمەوە: دەبێ ئەم جارە بە پێنووس بەشداریی خەباتی ڕزگاریخوازی بکەم! وشەکانم وەك شمشێرێك لە نوورێکی پرشنگدار هاتنە پێش چاوم، کە توێی تاریکییەکانیان لەتوپەت دەکرد! دوای ئەوە لە دوازدە پەیامدا دەستمکرد بە چاپکردنی ئەو نوسراوانەی کە دامنابوون! ئەو پارەیەی کە پاشەکەوتم کردبوو، لە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەو پەیامانەدا سەرفمکرد، پاشان فەرمانمدا ئەو پەیامانە جگە لە پەیامێك یان دوو پەیامیان، هەر هەموویان بە خۆڕایی دابەش بکرێن بەسەر خەڵکیدا..ئەمە ماڵی ئوممەتە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ئوممەت!

پەیامەکان بە خێراییەکی لەڕادەبەدەر بڵاوبوونەوە و کاریگەرییەکی بێوێنەیان جێهێشت! ئەوەش دەستپێکی سەردەمێکی نوێ بوو لە مێژووی تورکیا و ژیانی بەدیعوززەماندا!

# مەقامی وشە

پێی وتم:

کوڕی خۆم، ئەوەش لەکاتێکدا بوو فەرمانده‌ی گشتی سوپای ئینگلیز -کە ئەستەمبووڵی داگیرکرد- دەستیکرد بە وەشاندنی تۆوی دووبەرەکی لەنێوان موسڵمانانەدا ..کاتێك هەستم بە مەترسی کارەکە کرد، زانیم چەکی نوێ تەنها هێزی سەربازی نییە و بەس، بەڵکو دەبێ کارێکیتر بکرێت و بە جۆرێکی نوێ بەرگری بکرێت... چونکە دەردەکە لە جەستەی نەخۆشەکەدا ڕۆچووە! دوژمنیش وەکو خوێن بەناو دەمارەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا هاتوچۆ دەکات! بۆیە ئەو کاتە هەڵسام بە دانانی کتێبی "شەش هەنگاوەکان" لە دژی ئینگلیز و یۆنانەکان. موجاهیدی بەڕێز "ئەشرەف ئەدیب" سەرنوسەری گۆڤاری "سبیل الرشاد" هەستا بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی، ئەم هەنگاوەش هۆکارێکی کارا بوو بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانە دۆزەخییەکەی ئەو فەرمانده‌یە.

پاشان لەگەڵ گەیشتنی دەنگدانەوەی پەیامەکە بە سەرکردەکانی بزوتنەوەی ئازادیخوازیی لە ناوەڕاستی ئەنادۆڵ، دووجار بانگیان کردم بۆ پایتەختی نوێ "ئەنقەرە"، وەکو ڕێزلێنانێك -لەسەر زاری ئەوان- لەسەر ئەو کارە پاڵەوانانە و خزمەتە مەزنانەی کە پێشکەش بە نیشتیمانم کردووە..! ئاگرەکەی وڵات

ناهەموار و تۆقێنەربوو، دوکەڵەکەشی چڕوپڕ بوو، بە جۆرێك زۆر زەحمەت بوو ڕاستییەکان بەزوویی ئاشکراببن، یان بانگەوازی ڕاستەقینەی تێکۆشەران و بانگەوازی پیلانگێڕیی بەکرێگیراواندا لەیەکتر جیابکرێتەوە! چونکە زمانەکە یەك زمان بوو، بەڵام مەبەستەکان جیاواز بوون!

ناو بەناو لە گۆشەنشینی و خەڵوەتەکانمدا پرسیارم لە خۆم دەکرد: ئەوانە کێن؟ چییان دەوێ؟ پاشان چەندین ختورە و خەیاڵ بە دڵدا دەهاتن، هەتا هەموو شتێك ئاشکرا بوو! لە ئەستەمبووڵەوە بۆ ئەنقەرە؟ چۆن ئەوەتا بەرەی جەنگ لێرەیە؟ ئەمە چ بانگێشت و چ ڕێزلێنانێکە؟ نەخێر! نەخێر!..پاشان بە ڕەتکردنەوەی بانگێشتەکە وەڵامم دانەوە! لەو بارەوە ئێمەش قسەمان هەبوو:

- ئەی تێکۆشەران! ئێرە لە هەموو شوێنەکانیتر مەترسیدارترە...! بۆیە دەمەوێ لێرە جیهاد بکەم، نەك تەنها لەپشت سەنگەرەکانەوە. من باوەڕم وایە لە ئێستادا ئێرە، واتە ئەستەمبووڵ لە هەموو شوێنێك زیاتر ڕووبەڕووی مەترسی بووەتەوە، نەك ئەنادۆڵ! ئیتر سڵاو!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەردەوام بیرم شێواو و ویژدانم نائارام بوو..! ژیریم لێم نەدەگەڕا لە بلێسەی پرسیارەکان ڕزگارم ببێت و ماندوویەتیم دەربچێت..! تامی ئاسودەیی و چێژی جیهادم نەدەبینی، وەکو چۆن لە خەڵوەتی ڕۆحدا پێش جەنگی ڕوس هەستم پێ دەکرد! ئەوەتا ئەمڕۆ من لە ئەستەمبووڵم! لە جەنگی بەرگری و پارێزگاریکردن لە شەرەف و کەرامەتی پێشێلکراوی ئوممەتدا، هەست بەوە دەکەم شتێکم ناتەواوە... هەستم بەوە دەکرد بە پێی پێویست ئەرکی سەرشانم ئەنجام نادەم! سەیرە..! من چیم لێقەوماوە؟

پاشان بڕیارمدا بچمە ناو گەشتێکی ڕۆحی ترەوە، هەتا بەرەو جیهانی بەرز و باڵا بمبات و سەرم بخات، بەڵکو جگە لەوەی کە دەیبینم شتیکی

تر ببینم! جموجوڵێکی ویژدانیی دژوارم هەبوو، دارستانەکانی ئەستەمبووڵی لە نێوان دارولحیکمە و لێواری کەنداو و دەریاکاندا دەپێوا..!

کاتێك بەشی یەکەمی کتێبی "تەپۆڵکە زمروتیەکان"ی ماموستا "فەتحوڵلا گولەن"م خوێندەوە، حەز و پەرۆشییەك بۆ گەیشتنەوە بە کاروانی نوور تاساندمی... لەبارەی دۆست و خۆشەویستانەوە پرسیارم لە هاوەڵەکەم کرد: کەی ڕۆیشتن و بۆکوێ ڕۆیشتن..؟ ئەویش بە داخ و پەژارەوە وەڵامی دامەوە: ئەی برادەر، دەرکەوتن و ئاشکرابوونی نیشانەکانی ڕێ، تاکو ئێستاش نهێنییەکی شاراوەیە لە دوتوێی تەپۆڵکەی بەشەکانی تردا، هێشتا دەستنەکراوە بەوەرگێڕانیان لە زمانی ویژدانەوە، جگە لە باڵندەکانی دەریای دێوانەش کەسیتر لێیان تێ ناگات... منیش بەرەو ئازارەکانم کەوتمە ڕێ و دەستمکرد بەگریان..! پاشان لەسەر تەپۆڵکەیەك خۆمم بینیەوە، ڕاوەستابووم و لە بەرزەخێکدا لەنێوان ڕۆح و قوڕدا سەروخوارم دەکرد..! دەمێك شەوق و تاسەی ئاسمان ڕایدەکێشام و، نەورەسەکانم دەبینی لەسەر باڵی نوور و بە دەنووکی ئەڵماس هەڵیان دەگرتم و بە پانتایی ئاسۆی پاك و بێگەردا دەیان فڕاندم ...دەمێکیش ڕەشەبای ژێرەوە هەڵیدەکرد بەسەرمدا و چاوەکانمی پڕدەکرد لە گەردیلەکانی قوڕی ترشاو، ئیتر جگە لە بڵێسەی ئاگر کە دەوری جەستەمی دابوو، هیچی ترم نەدەبینی!

پاشان کتێبی "عەسای موسا"ی نوورسیم کردەوە، بەڵکو لە بێستانی دانستدا میوەیەك بچنم و تیماری دڵی سەرگەردانمی پێبکەم... کەچی لەپڕ پەڕەکان وەکو چەندین شورای بەرزی قەڵادار هاتنە پێشچاوم..! سەیری پەراوێزەکەم کرد

بینیم دەرگایەك لەبەردەممدا ڕاوەستاوە... بە توندی تەقەم لێدا، هەتا ئەوەی لەناوەوەیە گوێی لێ بێت، ئەوەندەی نەبرد مامۆستا خۆی دەرگاکەی کردەوە: "ڕۆڵە، ئەمە دارولحیکمەیە ئەدەبت هەبێ!" منیش لەتاوا شەرمەزار بووم و سەرمداخست، بێدەنگ کەوتمە شوێنی و هیچ قسەم نەکرد، هەتا مۆڵەتی دام و لە کتێبخانەی ماڵەکەدا دانیشتم. ئینجا ئەویش لە بەردەممدا لەسەر بەرماڵە بچووکەکەی دانیشت.

پێی وتم:

کوڕی خۆم، دارولحیکمە لە ژیانی مندا بەرزەخی ئاڵوگۆڕە مەزنەکان بوو..! کاتێك بووم بە ئەندام لە دارولحیکمە، لە دەوروبەری تەمەنی چل ساڵیدا بووم..! ئەوەش بۆ خۆی لە دەروونمدا بەسەرهاتێکی ترە!

تەمەنی چل ساڵی! ئەو بەرزەخە زەمەنیە ترسناکە... هەستکردنێکی توند و بەهێزی مەرگ و نەمانیی لە دڵمدا بەئاگاهێنایەوە! ڕاستە چل ساڵی لە تەمەنی مرۆڤدا قۆناغی هێز و پێز و زەبر و وزەیە، بەڵام ئەی لە هەمان کاتدا لەسەر نەخشەی تەمەنی سنووردارییدا ساتی دەستپێکردنی خاڵی شکانەوە نییە؟ ئەی مەگەر بە ناڕاستەی کۆتاهاتندا بە دەستپێکی بژمێریی سەر بەرەوخوار دانانرێت؟ کەواتە ئەوە کێشەکەیە! هەر ئەو خەوزڕانە دژوارە بوو لەناکاودا هەڵیکوتایە سەرم. پاشان شەو و ڕۆژ وازی لێ نەدەهێنام... دەبێ کێ ڕزگارم بکات..؟

سەیر لەوەدا بوو، من لەوەوپێش هەرگیز لە مردن و لەناوچوون و نەمان نەدەترسام! چونکە چەندین جار چوومەتە ناو ئەزموونی جەنگەوە، گوللەش جەستەی تێکشکاومی کونکردبوو..! چەندین جار لەسەر سەکۆی لەسێدارەدان

وەستاوم..! ئەوەش هیچ کاریگەرییەکی خراپی لەسەر دەروونم بەجێنەهێشتووە
و، لەکاتی هێرشبردن و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا هەستم بە کەمترین
ترس و دڵەڕاوکێ نەکردووە! بەڵکو چاو سوورکردنەوە و سنگ دەرپەڕاندن
بەهێزترین ئەسپم بووە بە ڕووی ستەمکار و زۆرداراندا تاومداوە، تەنانەت
ئەو وەختەش کە شمشێری جەللاد و پیاوکوژان لەسەر گەردنم دانراوە،
هەرگیز ڕووی نەداوە بۆ تەنها جارێك بە ئاماژەش داوای لێبووردنم کردبێ!
دەبێ ئێستا لەم دارولحیکمەدا چیم لێ قەومابێت؟ ئەم ترسە چییە کیان و
بوونمی تەنیوە و ویژدانمی هێناوەتە لەرزە؟! ئەم خێوە چییە لێم جیانابێتەوە
و لە کۆڵم نابێتەوە؟

ڕۆژگارێك لەسەر ئەو حاڵەتە مامەوە، نازانم ماوەکەی چەند بوو... لەبەینی
بارەگای دارولحیکمە و خەڵوەتگا تایبەتەکەمدا وەکو شێت ڕامدەکرد، لەوێ
لەسەر "گردی یوشەع" یان لەسەر تەپۆڵکەی "چاملیجا"، بووکی ئەستەمبوڵ،
بەسەر کەناراوەکانی بۆسفۆڕ و دەریای مەڕمەڕەدا دەمڕوانی... هەموو ئێوارەیەك
لەگەڵ ئاوابوونی خۆری خەمباردا، بە دڵشکاوی و دەروونی ئیفلیجەوە دەهاتمە
خوارەوە، دەتوت وێنەی ساتی شکانەوە و بەرەو خواربوونەوە لە تەمەنمدا
دەنەخشێنم..! پاشان نازانم چۆن هاواری فریادڕەسی لە قووڵایی ناخمەوە دەهاتە
دەرەوە: یا باقی..! یاباقی..! یاباقی..! من هیچکام لەو وشانەم بەدەمدا نەدەهات!
زمانیشم بە پیتێکیان نەهاتووەتە گۆ، لەگەڵ ئەوەشدا گوێم لێبوو چیاکانی
دەوروبەرم سەدای هاوارەکانی منیان دەدایەوە، شەپۆل لە دوای شەپۆل بەر تاشە
بەردەکان دەکەوتن و هەپرون بە هەپرون دەبوون، پاشان وەکو ئاهونالەی دڵێکی
شکاو، دەڕۆیشت و هێدی هێدی بەرەو نەمان دەچوو... هەتا لەگەڵ شینی
نەورەسەکان لەناو بۆسفۆڕدا دەتوایەوە: یاباقی..! یاباقی..! یاباقی..!

ڕۆژانێکی سەخت و ترسناکم لە دارولحیکمە بردەسەر، بەیانیان و ئێواران زللە لە سەر و گوێلاکم دەوەشێنرا..! تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوو..! هەتا ڕۆژی مەشهود هاتە پێشەوە و.. دەرگای نهێنییەکان کرایەوە و حەقیقەتم لێ دەرکەوت.

زللەکان لەوە گەورەتر و توندتر بوون مرۆڤ بتوانێت بەرگەیان بگرێت! لە میانەی بەرکەوتنی ئەو زللانەدا وام هەستدەکرد مەرگ خەریکە ڕۆحم داگیربکات! ئەوەش حەقیقەت بوو، نەك وەهم و خەیاڵ! ئێوارەیەکیان بەڕاستی تارمایی خۆمم بینی کەوتە سەر زەوی و لە جەستەی لاوازم هەڵوەری و جووڵەی لێبڕا..! پرسیارم لەخۆم کرد: سەیرە! ئەمە چییە من دەیبینم؟ یەکسەر خۆم وەڵامم دایەوە: ئەوە سەعیدە! ئەوە ئەو خۆیەتی! بەڵێ، بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی! ئەو ئێستا دەمرێت! لەو چرکەساتەدا هەستم کرد کەسێك لە بوون و هەناومدا مرد و، منیش لە چاوەڕوانی و پێشوازیی کەسێکیتردام لە تەمەنمدا!..

ئاە کوڕی خۆم! بەڕاستی "سەعیدی کۆن" مرد..!

***

ئەوەتا ئێستا هەموو شتێك ئامادەیە بۆ پێشوازیکردن لەوەی تازە لەدایکدەبێت..! ڕووناکییەکان کزبوون، کتێبەکانیش لەسەر ڕەفەکانەوە ملیان درێژکردبوو، تەیانڕوانی بەسەرمدا. لێرە و لەوێ بانگیان لێ دەکردم: ئێرە بکەرەوە!.. ئێرە بکەرەوە!..

## مەقامی یەکخستنی قیبلە

وام هەستدەکرد لەناو قوڕ و لیتاودا نوقم بووم..هاوارم کرد فریامبکەون، دەستم درێژدەکرد و بە شوێن ڕێگایەکدا دەگەڕام، هەستم بە دەستەوەستانیی خۆم کرد، بۆم دەرکەوت من پێویستم بە ڕزگارکەرێك هەیە دەستم بگرێت.. کتێبەکانیش لەبەردەستمدا زۆر بوون، بیر و بۆچوونەکانیش لە مێشکمدا شپرزە و شڵەژاو بوون، ڕێچکە و ڕێبازەکانیش لە بەردەممدا قیت ڕاوەستا بوون و بەریەرەکانێی یەکتریان دەکرد... نازانم چۆن دەستم خستە سەر کتێبی "فتوح الغیب"ی شێخ عەبدولقادری گەیلانی - خوا لێی ڕازی بێت- بە گەشبینیەوە کتێبەکەم کردەوە و دوعای خێرم کرد، لە لاپەڕەیەکدا ئەم دەستەواژەی خوارەوە کەوتە بەرچاوم:

”تۆ لە دارولحیکمەدایت، لەبەر ئەوە بە دوای پزیشکێکدا بگەڕێ، بۆئەوەی تیماری دڵت بکات!..“

زۆر سەرم سوڕما! بێگومان من ئەو ڕۆژە لە "دارولیحکمەی ئیسلامیدا" بووم، لەو باوەڕەدا بووم من بۆیە هاتووم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی زامەکانی ئوممەت چارەسەر بکەم، کەچی لەڕاستیدا من خۆم لە هەموو کەس بیمارتر و ئاتاجتر بووم بە چارەسەر... چاکتر وایە نەخۆش پێش ئەوە کەسانیتر چارەسەربکات، خۆی چارەسەر بکات!

- پێی وتم "تۆ خۆت نەخۆشی ..بگەڕێ بەدوای پزیشکێکدا، با چارەسەرت بکات!"..

- وتم "تۆ ببە بە پزیشکم ئەی شێخ!"

دەستمکرد بەخوێندنەوە.. ئەو لەگەڵ خودی مندا دەدوا.. ئاه، کوڕی خۆم، چەندە بە زمانێکی زبر لەگەڵمدا دەدوا!.. بێگومان لەخۆبایی بوونمی تێکشکاند و کیانی ڕاماڵیم..! بەوەش نەشتەرگەرییەکی قووڵی لە دەروونمدا ئەنجامدا!.. لەوە زیاتر بەرگەم نەگرت!.. لەبەر ئەوە تا نیوەی کتێبەکەم خوێندەوە و نەمتوانی تەواوی بکەم، پاشان کتێبەکەم دانا و وازم لە خوێندنەوەی هێنا..!

ڕۆژگارێك بەسەر تەمەنی ئەو حاڵەتە دەروونییەمدا تێپەڕیکرد، نەمزانی ماوەکەی چەند بوو، پاشان هەستمکرد ئازاری نەشتەرگەرییەکە نەماوە و لە جێگەیدا چێژێکی ڕۆحیی سەیر بەجێماوە!.. سەرلەنوێ دڵ و دەروونم پڕبووەوە لە تامەزرۆییەکی بەرپێنەگیراو بۆ کتێبی "فتوح الغیب"!.. گەڕامەوە بۆ لای، وشە بە وشەی خوێندنەوەکەم تەواوکرد، ئیتر ئەو بووە یەکەمین مامۆستام لە سەرەتای ئەم ڕێگا نوێیەدا.. سوودێکی زۆرم لێوەرگرت، چەندین کاتژمێری دوورودرێژم لەگەڵدا بردەسەر.. گوێم لە پەند و ئامۆژگاری و ویردەکانی دەگرت، لە ڕێژاوی موناجاتەکانی تینویەتی خۆمم دەشکاند.

پاشان کتێبی "مەکتوبات"ی ئیمام ئەحمەد فاروقی سەرهەندیم دەستکەوت، بە نیەتێکی پاك و گەشبینییەکی زۆرەوە دەستم دایە، تەوافوقێکی سەیرم تێدا بەدیکرد!.. چاوم بە دوو نامە کەوت کە بۆ کەسێکی نووسیبوو بە ناوی "میرزا بەدیعوززەمان"، بەڵێ بەم جۆرە "میرزا بەدیعوززەمان"..! وام هەستدەکرد بە تایبەت لەگەڵ من دەدوێ ،چونکە ناوی باوکم -بەڕەحمەت بێت- "میرزا"

بـوو، دوو نامەكـەش ئاڕاسـتەی "میـرزا بەدیعوززەمـان" كرابـوون. بۆیـە وتـم: یـا سبحان اللّـە! بێگومـان دوێنراوی نـاو ئـەم نامانە منـم!! چونكە نازناوی "سـەعیدی كۆن" بریتـی بـوو لـە "بەدیعوززەمـان"، واشـنازانم جگـە لـە "هەمەدانـی" خاوەنـی مەقامـات، كـە لـە سـەدەی چوارەمـی كۆچیـدا ژیـاوە، كەسێكی تـر بـەم نازنـاوە ناوبانگـی دەركردبێـت، كەواتـە دەبێـت كەسـێكیتر هەبێـت جگـە لە"هەمەدانـی"، لـە سـەردەمی ئیمامـی ڕەببانـی سـەرهەندیدا ژیابێـت و بـەم نازنـاوەوە گوفتـاری ئاڕاستە كرابێت، دەبێ حاڵی ئەویش لـە حاڵی مـن چووبێت، وا منیـش دەوای دەردی خۆمـم لـەو دوو نامـەیـەدا دەسـتكەوت!..

ئامۆژگارییەكەی ئیمامـی سـەرهەندی جەختـی لەسـەر ئـەوە دەكـردەوە كـە دەبێ موريد تەنیا ڕوو لە یـەك قیبلـە بكات! واتـە شوێن یـەك پێشـەوا و ڕابـەر بكەوێت و، خۆی بـە كەسـی تـرەوە سـەرقاڵ نـەكات! جاروبـار وتارەكـەی بانگـی لـێ دەكـردم: "قیبلـەت یەكبخە!"

ئـەم ئامۆژگارییـە ئـەو كاتـە لەگـەڵ ئامادەیـی و حاڵەتـی ڕۆحیمـدا نەدەگونجـا.. بـۆ ماوەیەكـی زۆر بیرمدەكـردەوە: شـوێن كامیـان بكـەوم؟ گەیلانـی یـان سـەرهەندی؟ بـەدوای ئەمیانـدا بـڕۆم یـان ئەویانـدا؟ لـەو ناوەنـدەدا سـەرم لـێ شێوابوو.. سەرلێ شێوانەكەم زۆر سـەخت بـوو، چونكـە هەريەكەيـان دارای هێـزی كێشـمەندی و تایبەتمەندیـی خـۆی بـوو، نەمدەتوانـی شـوێن یەكێكیـان بكـەوم و واز لـەوی تریـان بهێنـم.

لەكاتێكـدا مـن لـە گێـژاوی ئـەم سـەر لێشـێوان و سـەرگەردانییە سـەختەدا دەتلامـەوە... لەپـڕ ختوورەیەكـی ڕەحمانـی تەقەیـدا لـە دەرگای دڵـم و بانگـی لێكـردم:

- ئەی سەعید..! سەرەتای ئەم ڕێبازە جۆراوجۆرانە و، سەرچاوەی ئەم هەموو جۆگەلانە و.. خۆری گشت ئەم ئەستێرە گەڕۆکانە.. تەنیا و تەنیا قورئانی پیرۆزە! کەواتە تاکە قیبلەی ڕاستەقینە هەر قورئانە و بەس، یەکخستنی قیبلە بەبێ ئەو نابێت!

ئەی ئایا قورئان بەرزترین ڕابەر و.. پیرۆزترین و پاکترین مامۆستا نییە بە ڕەهایی؟ ئەو ڕۆژە لە ژیانی مندا ڕۆژێکی مێژوویی بوو.. چونکە لەو ڕۆژەدا لە دوودڵی و سەرگەردانی هاتمە دەرەوە، زەردەخەنەی هیوام بینی و بووە لەدایکبوونێکی نوێ لە تەمەنمدا.. بووە خۆشی و شادییەك، هەرگیز لە ژیانمدا شتی وام بەخۆمەوە نەدیبوو!.. بەڵێ، بێگومان "سەعیدی نوێ"م بینی هاتە ناو ڕۆحم و، کەسایەتییەکەی کیانمی پڕکرد! قاچم خستە ناو "ئاوەکەی ئەیوب"ەوە، سارد و سازگار بوو بۆ خۆشتن و خواردنەوە، خۆم پێ شت و لێشم خواردەوە! بووە شیفا بۆدەردەکانم و ئاهەنگ و خۆشی لەدایکبوون!

قورئانەکەمم دۆزیەوە، بە دۆزینەوەی ئەو، "سەعیدی نوێ"شم دۆزیەوە!

لەو ڕۆژەوە ڕوومکردە قورئان، بەبێ پچڕان و دابڕان دەمخوێندەوە، بەبێ ماندووبوون و بێزاری لێی ورددەبوومەوە و لە واتاکانیم دەکۆڵیەوە! بەردەوام دەستم پێوە دەگرت، ڕاستییەکانی ئیمانم لێ وەردەگرت، حاڵەت و بارودۆخی زەمان و مەکانم بەهۆی ئەوەوە دەخوێندەوە، لە ڕێگەی دیمەنەکانی ئەوەوە چاودێری ئەنجام و کۆتایی گەردوون و ژیان و مرۆڤم دەکرد!..

بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا تێگەشتم کە بینینی ڕاستەقینە لەم جیهانە جوانەدا چۆن دەبێت! نازانم چۆن دەستمکرد بە نووسینەوەی ئەو ڕازانەی کە دەمبینین.. وشەکان بەزۆر خۆیان دەسەپاند بەسەرمدا! واتا بەهێزەکان کاتێك

تەقەیـان لـە دەرگای دڵـم دەدا ، مۆڵەتیـان وەرنەدەگـرت، چونکـە ڕاسـتەوخۆ دەچوونـە نـاو ڕێڕەوەکانـی ڕۆحمـەوە، بـە جۆرێـك هەسـتم بـە گەرمـا و تینـی شـەیدابوون و خۆشـییەکان دەکـرد، بەرگەگرتنـی لـە توانـادا نەبـوو! ئیتـر یـان بـە خەتـە لاوازەکـەی خـۆم دەمنووسـینەوە، یـان گڕەکەیـم بەسـەر هەندێـك لـە خۆشەویسـتاندا دەخوێنـدەوە..! بـەو جـۆرە خۆیشـم لـە بڵێسـەی گـڕ و تینەکـەی ڕزگارم دەبـوو و ماندوویەتیـم دەردەچـوو! بـەوە "وتـەکان" هاتنـە بـوون، ئـەوەش بـووە سـەرەتای "پەیامەکانـی نـوور."

***

لـەو سـاتەوە هـاودەم لەگـەڵ قورئانـدا مـەقامەکانـی سـلوك یـەك لـە دوای یـەك دەردەکەوتـن..! مـەقامـی یـەکـەم:

## مەقامی هیدایەت و ڕێنمایی (الهدی)

ئەو کاتە پەلەقاژێی ئەوەم بوو لە دۆخی "سەعیدی کۆن" دەربچم و بێمەدەرەوە، ژیریم هاتە لەرزە و دڵیشم پەشۆکا. هەردووکیان پێکەوە لەگەڵ ڕاستییە گل بووەوەکان لە ناوەندی زریان و گەردەلوولێکی ترسناکدا گلبوونەوە و لێم جیابوونەوە! چەندین گفتوگۆ و مشتومڕی دەروونیی دژوار و دژ بە یەك بە ناخمدا گوزەریان دەکرد! سەردەکەوتن بۆ سەرەوە و پاشان بەردەبوونەوە و دەکەوتنەخوارەوە.. لە سەرەوە بۆ خوارەوە، پاشان لە خوارەوە سەردەکەوتنەوە بۆ سەرەوە... لە ئەستێرەی ئاسمانەوە بۆ زەوی و، لە زەوییەوە بۆ ئەستێرەی ئاسمان! ئەوەش لەبەر نەبوونی پێشەوا و ڕابەر لە لایەك و، لەخۆباییبوونی دەروونی بەدخواز لە لایەکی دی!

بەڵام هەر کە چوومە ناو ڕێبازی قورئانی پیرۆزەوە، بینیم ئاماژەکانی سوننەتی بەرز و پیرۆزی پێغەمبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) تەنانەت لە سادەترین ئادابەکانیشیدا، لە حوکمی ئەو قیبلە نومایەدان کە ئاڕاستەی ڕۆشتنی کەشتییەکان دیاریدەکات، کاتێك شەپۆلی زەریاکان تەی دەکەن...یان لە حوکمی چرایەکی ڕۆشنکەرەوەدا بوون، کە ڕێگا تاریکە لە ژمارەبەدەرەکان ڕوون دەکاتەوە بۆ کەسانی سەرگەردانی وەکو من!

پێی وتم: ئێمە لە سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) ڕێگایەکمان

پیشاندایت و هۆکارێکمان پێبەخشیت، دەسا تۆیش دەست بەو هۆکارەوە بگرە و شوێن ئەو ڕێگایە بکەوە..!

منیش وتم: ئەوا گەورەم پێغەمبەری خوام (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە ئیمام و ڕابەری خۆم لە ڕێباز و ڕێڕەوی قورئاندا هەڵبژارد... جگە لەو هەرگیز بە هیچ ڕێگا و ڕێباز و هۆکارێکیتر ڕازی نابم!

پاشان پێی وتم: ئێستا بەڵێ، کوڕی خۆم مەقامی دووەمی تۆ ئاماژەیەکی نوێیە، فەرموو فێری ببە!

# مەقامی بێ وێنەیی (التفرد)

چاوێکم بەم سەردەمە نامۆ و تاریکە ترسناکەدا گێڕا.. بینیم ڕێبوارانی ڕێگای خوا هەریەکەیان بۆ خۆی ڕێگایەکی جیای گرتووەتەبەر، پرشنگی ڕووناکی هەموو مۆمەکانیان لەناو ڕەشایی تاریکییەکاندا دەڕەویەوە و بە فیڕۆ دەچوو! منیش بە تەنیا خۆم لەژێر ڕووناکیی قورئاندا ڕێگەم دەبڕی..!

بەڵێ، کوڕی خۆم، بینیم لە بەرزەخێك لەنێوان عەقڵ و دڵدا ڕێچکەیەکی وەهام گرتووەتەبەر، لەم ڕۆژگارەدا جگە لە من کەسێکیتر پێیدا نەڕۆیشتبوو..!

پێی وتم:

- وا مەزانە ئەوەی من دەینووسم شتێکە بیر و ژیرییەکان جویبێتیان و پێیان قووتدرابێت..نەخێر! بەڵکو ڕێژنەیەك بوو! ڕژا بەسەر ڕۆحێکی زامدار و دڵێکی بیماردا، ڕێژاوی نوورێك بوو هەستەکانم بە تاسە و شەوقەوە ڕاستەوخۆ لە قورئانی پیرۆزەوە وەریانگرت! وا مەزانە حاڵێکە و دڵ بۆ ماوەیەك تامی دەچێژێت و پاشان دەڕوات... نەخێر! بەڵکو بریتییە لە مەقامی چەندین نوور و ڕووناکیی بۆ هەمیشە درەوشاوە، هاوکات لەگەڵ ڕاستییەکانی ئیمانێکی جێگیری نەبڕاوە. ئەمانە هیچیان هی من نین...من بانگەشەی ئەوەم نەکردووە! بەڵکو تیشکی خۆری قورئانە و شکاوەتەوە بەسەر عەقڵێکی نەخۆش و، دڵێکی

دەردەدار و، دەروونێکی سەرگەرداندا! لە خۆڵەمێشی "سەعیدی کۆن"، "سەعیدی نوێ" هاتە دەرەوە و مژدەی نوور دەدا بە جیهان... ئەوە قەدەری منە، کوڕی خۆم، دەسا سەیرکە! ئەمە نیشانەی ڕێگاکەیە و ئاماژەی سێهەمیشە بۆ تۆ:

## مەقامی بینین (المشاهدة)

یەکەمیـن گرفتـی مـن بریتیبـوو لـە ژیریـم! چونکـە تەنهـا لەڕێـی کەناڵـی ژیرییەوە زانست و زانیارییەکانم وەردەگرت! ئەوەش هۆی لە خۆباییبوونەکەم بوو.. "سەعیدی کۆن" بەو جۆرە بوو. هۆکارەکەشی ئەوەبوو لە بیابانی سەرگەردانیدا لە لای سوڵتانی ژیری بە دوای ئارامی دەرووندا وێڵبووم! سەرگەرمی بنیاتنانی کۆشکی بەڵگەهێنانەوەی نەزەری بووم، هەتا کاتێك وەکو بەرزترین کۆشك بەرزبووەوە و ڕاوەستا، لاری و نارێکی و درز و کون و کەلەبەرەکانیم بۆدەرکەوت! لەبەر ئەوە هەر خۆم دەمڕوخاند و هەڵمدەوەشاندەوە و تێکمدەدا! بەدبەختی بۆ تۆ ئەی ژیری! ئەی ئایا تۆ نەبوویت ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە و مشتومڕەت بنیاتنا؟ لەبەرچی ئێستا کافر دەبیتەوە بەوەی پێشتر باوەڕت پێی هەبوو؟ لە ناخەوە هاوارم کرد و هانام بردە بەر خوا: ئاهـ ئەی پەروەردگارم..! بەزەییت پێمدابێتەوە! لەکوێ یان چۆن ئاسودەییم دەست بکەوێ بۆ بوونم..؟! پاشان بە فەرمانێکی سەیر "سەعیدی نوێ" هات بۆ لام!.. بەڕاستی نووری درەوشاوە و بینایی دیدەم بۆ هات!.. کاتێك بینیم چرایەکی پێ بوو بە نوور و ڕووناکی دەدرەوشایەوە، هەروەکو ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە ئاسۆی بەرزەوە شەوقی دەدایەوە... پاشان شۆڕبووەوە و لێم نزیك بووەوە، هەتا ماوەی نێوانمان ئەوەندەی نێوان دوو کەوان یان نزیکتر بوو..! شەپۆلەکانی نوور بە تەواوەتی دایانپۆشیم،

هەتا هیچ شتێکم بەدەرەوە نەما! پاشان بەسیرەت و بیناییەك بەدڵمدا خۆی هەڵواسی و نوورەکانی بۆ هەتاهەتایە بەسەر بەڵگەی ژیریدا شەوقیان دایەوە..!

پێی وتم:

قەدەری خوایی بەرەو ڕێگایەکی سەیر دامیەبەر، تیایدا ڕێم لە چۆڵەوانی و بیابانی بێ ئاو و شوێنی مەرگ و تیاچوون کەوت..! سەرگەردانی و شڵەژان ڕوی تێکردم، خێرا هانام بردە بەر پەروەردگاری خۆم و سکاڵای دەستەوسانیم لە لا کرد... چاودێری و کۆمەکی خوایی دەستی گرتم، چاوم بڕییە خۆری قورئان و، لە دوای کوێرییەکی نووتەك کە ڕۆژگارێك درێژەی کێشا، چاوەکانم کرانەوە..! پاشان بوومە کەسێکی چاوساغ و ڕزگارم بوو! ئیتر کوڕی خۆم، لە دوای ئەوە شتێکم نەنووسیوە نەمبینیبێت و بە چاو سەیرم نەکردبێت!.. لە سایەی خۆری قورئانەوە ڕاستییەکان بە ئاشکرا و دڵنیاییەوە لێم دەرکەوتن، بە جۆرێك هیچ ئەگەر و ئیمکانێکی وەهمی بۆ دژ و پێچەوانەکەی نەمایەوە! بەڵێ وەها بینیم..!

## مەقامی توڕەبوون (الغضب)

لـە گێـژاوی چاوپێکەوتـن و دیمەنـە نوێکانـدا، جارێکـی تـر دنیاویسـتان بانگیانکردمـەوە، ناوبەناو بانگێشتـەکانی ئەنقـەرە بۆ ڕێزلێنـان و بایەخپێدان نـوێ دەبوویـەوە، بـە گومانـی ئـەوان مـن هێشـتا "سـەعیدی کـۆن"م! بـەڵام هەیهـات!.. چونکـە لەگـەڵ سـەرەتای پیریـدا، مەسـتی و بـەزم و شـادی "سـەعیدی کـۆن" و، پێکەنیـن و زەردەخەنەکانـی لـە خۆشـی سـەرکەوتنە دنیاییـەکان، گـۆڕان و، گریانەکانـی "سـەعیدی نـوێ" جێگەیـان گرتـەوە، گریـان بۆئـەوەی لەدەسـتچوو و لەسـەر ئـەوەی لەمـەودوا دێـت..! مـن چیـم داوە لـە دونیـا؟.. پاشـان نامەکەیانم وەکـو پێشـینەکانی فەرامۆشـکرد وبانگێشـتەکەیانم ڕەتکـردەوە..!

سـەیر لـەوەدا بـوو ئـەم جارەیـان بانگێشـتکردنەکەیان یـەك لـە دوای یـەك بـەردەوام بـوو، بـەردەوام پەیـام لـە دوای پەیـام دەگەیشـتە دەسـتم! جـار لـە دوای جـار بـە شێوەیەکی سـەرنجڕاکێش پێداگرییـان دەکـرد و زۆریـان لـێ دەکـردم! ئەمـەش پاڵـی پێوەنـام زیاتـر و زیاتـر سـەرنج بدەم و بـە قووڵـی ئـەو نهێنیـە هەڵبێنـم کـە لەپشـت ئـەم پێداگرییەوەیـە. پاشـان بـە شێوەیەکیتر بیـرم لـە وەڵامدانـەوە کـردەوە! لـە دڵـی خۆمـدا وتـم: تـۆ چوزانـی؟ ڕەنگـە کارێکـی ژیرانـە بێـت بچـم بـۆ ئـەوێ تاکـو بـۆ خـۆم بزانـم لـەوێ چـی ڕوودەدات! پاشـان ئەمـە جەنگـە، جەنگیـش بـە فێـڵ

دەکرێت! ڕەنگە کارێکی ژیرانە و چاك بێت، گەر پەردە لەسەر فێڵ و هەڵخەڵەتاندن لاببرێت و ئاشکرا بکرێت!

پاشان بڕیارمدا بچم بۆ ئەویّ.. ئەنقەرە پایتەختی جادووگەرە مەزنەکان بوو!.. ئەو گەشتەی هەموو چەمکەکانی لە مێشکمدا هەڵگێڕایەوە!.. لە ساڵی ۱۹۲۲ی زایینیدا بوو، ئەژدیهاکانم بینی بە ئاشکرا لە خوێنی ئوممەتدا مەلەیان دەکرد، توانیم هەموو جۆرەکانیان لەیەك جیابکەمەوە و، سروشتی ژەهرەکەیان و، پلەی چەپەڵی و مەترسییەکەیان دیاریبکەم، ئەوە ڕووداوێکی زۆر گرنگ بوو لە ژیانمدا، چونکە لە ڕوونکردنەوە و دیاریکردنی هێما و ئاماژەکانی ڕێگا و، تەواوکردنی وێنەی کەسایەتیی "سەعیدی نویّ" لە ژیانمدا یارمەتیدام... سەیرە! ئەوان کارێکیان بە من هەبوو، خواش کارێکیتر!... بابزانن "للّٰه الأمر من قبل و من بعد!"

ئەنقەرە پایتەختی دووکەڵ و تەمومژ بوو..! دیاردە و دیمەنەکان ڕەنگاوڕەنگ و، ڕاستییەکانیش جۆراوجۆر بوون..! کونەکەش گەورە و فراوان و، ڕەشەباکەش زۆر بەهێز بوو..!

پێی وتم: بینیم ئیمانداران بە تێکشکانی یۆنان لە بەرامبەر لەشکری ئیسلامدا ئاهەنگ دەگێڕن و خۆشی و شادی دەردەبڕن.. بەڵام من لە ناوەندی ئەو دروشمکاری و خۆشی و شادییەدا زراوچوونێکی مەزنم بەدی دەکرد، بینیم ئەژدیهاکان بە فێڵ و تەڵەکەیەکی چەپەڵ و ترسناك بە ناو ئوممەتدا بەخشکەیی دێن و دەچن...! چەمکە ئیلحادییەکانی ئەو زەندەقەیەش دزە دەکەنە ناو بیر و مێشکی موسڵمانانەوە..! بۆیە لە قووڵایی ڕۆحمدا ئازارم چەشت، هاوارم کرد و پەنام بردە بەر خوای بەرز و بەتوانا..!

ئاه ئەی پەروەردگار! کێ بۆ ئەم دێوە ترسناکەی کە دەیەوێ پایەکانی ئیمان هەڵوەشێنێتەوە؟

پێشوازی لێکردنەکە زۆر ناوازە بوو! جوانی و ڕازاوەییەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی هەر ئەویندارێك خۆی نەگرێت و بکەوێتە داوی زرق و برقیەوە!.. تەواوی بەرپرسان ئامادەبوون، نوێنەرانی پەرلەمان و، پیاوماقوڵان و، جەماوەرێکی زۆریش گۆڕەپانەکەیان پڕکردبوو! ئەمە چییە؟ چییان لە من دەوێ؟

چوومە ناو پەرلەمان... دیاربوو پەرلەمان تەنیا گەمەیەك بوو بۆ خڵافاندنی ئوممەت! جگە لە شانۆیەك بۆ مشتومڕ و دەمەقاڵێی بێ کردەوە و، دۆڵێك بۆ خاڵیکردنەوەی تواناکان و سەرقاڵکردنی بەندەکان بەفووکردن لە خۆڵەمێش، هیچی تر نەبوو، ئەمە لەکاتێکدا ژەهر ب ەناو جەستەی ئوممەتدا هاتوچۆی دەکرد، داخی بەجەرگم! کوانێ خاوەن بەسیرەت و بەرچاو ڕوونەکان؟ کاتەکان یەك لە دوای یەك تێپەڕ دەبوون و، بانگەکانی نوێژ بە دوای یەکدا دەهاتن و کەسێك نەبوو وەڵامیان بداتەوە و بچێت بەدەمیانەوە!..سەیرە! ئایا ئێمە لە دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامیداین، یان من بەهەڵەدا چووم؟ ئەم دێوەزمە ترسناکە چییە ئەی خوایە؟

ئەوەم بە بیردا هات کە دەبێت کارێك بکرێت! دەبێت ئەو چەمکانە، کە ئەو دەمە بۆگەن و عەقڵە نەخۆشەکان لێرە و لەوێ فڕێیان دەدەن، ڕەت بکرێنەوە، دەبێت پەردە لەسەر ئەو زەندیقە فێڵبازە لابدرێ و تەبەرڕای لێ بکرێت! ئەو لە ئێمە نییە و ئێمەش لە ئەو نین! پاشان دەبێت ئەو پیاوچاکە سادە و ساویلکانەی کە بە نەزانی چوونەتە ناو ئەم مشتومڕە نەزۆکەوە، بەئاگابهێنرێنەوە، ئەوانەی کە لەگەڵ زەندیقەکاندا بانگەشە بۆ ڕوخاندنی

"قەڵای دێرین" دەکەن، لەڕاستیدا مەبەستی سەرەکی ڕوخاندنی ئەوانە، بەڵام ئەوان بە خۆیان نازانن و هەست بەوە ناکەن.

کەواتە دەبێ ڕیزەکان جیا بکرێنەوە و! گاڵتەجاڕییەکە ئاشکرابکرێت!

ئەزموونی ڕۆژێکی سەیر بوو! بە پەلە پەیامێکم نووسی و، تیایدا باسم لە مەزنی ئیسلام و گرنگی و بایەخی بەندایەتی کرد، بەتایبەت نوێژ! پاشان هەر لە هۆڵی پەرلەماندا هەستام بە دابەشکردنی بەسەر پەرلەمانتاران و بەرپرساندا! کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی هەبوو لەسەر هەردوو تاقمەکە! تاقمێکیان خۆشحاڵ و، تاقمەکەی تریشیان پەست و بێزار! تا ئێستاش لەبیرمناچێتەوە... سەرەتاکەی بەم جۆرە بوو: "یا أیها المبعوثون!.. إنکم لمبعوثن لیوم عظیم!".. "ئەی نوێنەران، ئێوە لەپاش مردن زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژێکی مەزندا، کە ڕۆژی قیامەتە!"...ئەم دەستپێکە بەس بوو بۆ بەخەبەرهێنانەوەی "من کان لە قلب أو ألقی السمع وهو شهید". کەسێك کە دڵێکی فامیدەی هەبێت یا گوێ شل بکات و ئامۆژگاری وەربگرێ و زەینی لای خۆی بێ و لە شت تێبگات.

لە پشت پەردەکانەوە... لەوێ لەپشت پەردەکانی تارکییدا، سوپاسالار "کازم قەرەبەکر" پەیامەکەی خوێندەوە بۆ سەرگەورەکەی، "مستەفا کەمال"..! تا ئەو وەختە ئاڕاستە و بیر و بۆچوونی ئەو پیاوە لای جەماوەر ڕوون نەبوو! ئەوەی ڕوویدا، ڕوویدا..! ئێوارە کۆڕێکی سەیر بوو.. چونکە تیایدا شەست پەرلەمانتار تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای خوا! سەرلەنوێ دەستیانکردەوە بە نوێژ! تەنانەت ئەو هۆڵەی تایبەت کرابوو بە نوێژکردن، جێی نوێژکەرە نوێکانی تێدا نەدەبووەوە! هۆڵێکی لەو فراوانتریان هەڵبژارد! تەوژمی ئاین لە پەرلەماندا کەوتە جموجووڵ!..

گورگە بۆرەکە بە بینینی ئەو دیمەنە ڕقی هەڵسا و! بە پەلە لە بەردەم پەرلەمانتارەکاندا لەسەر کورسییە گەورەکەی دانیشت و دەستی کرد بە قسەکردن و سەرۆکایەتی دانیشتنەکەی گرتەدەست!.. بڕۆ خۆڵمێشییەکانی گرژکرد و، نیگای چاوە تیژەکانی بڕیە من..! پاشان بە خۆپارێزییەکی وا کە سووکایەتیی لەخۆ گرتبوو، وتی:

- بێگومان ئێمە پێویستمان بە زانایەکی بەتوانا و بەڕێزی وەك تۆ هەیە..! ئێمە تۆمان بۆ ئێرە بانگهێشتکرد تا سوود لە بیر و بۆچوونە دانا و بەنرخەکانت وەربگرین... ئێوەش لە لایەن خۆتانەوە بەدەم بانگێشتەکەمانەوە هاتن... بەڵام سەیر لەوەدایە یەکەمین کارێك پێی هەڵسان بریتی بوو لە نووسینی چەند بابەتێك لەبارەی ئاین و نوێژەوە! ئەوەیش بووە هۆی نانەوەی دووبەرەکیی فکری لەنێوانماندا..!

جارێکی تر تارمایی "سەعیدی کۆن" لە ناخمدا جووڵا و ئاگری تووڕەبوون لە جگەرمەوە بەرزبووەوە..!

زۆر مۆڵەتم پێ نەدا..! دەبوو گوللە کوشندەکەم بتەقێنم! باشە ئەمە ئەو نییە...! بەڵێ ڕاستە، ئەوە خۆیەتی! دەی ئیتر چاوەڕێی چی دەکەیت؟ پێویستە لە پێشچاوی ئەوانەدا کە بێئاگان لە حەقیقەتەکەی، پەردە لەسەر ڕووی هەڵبماڵرێ و بە ئاشکرا بۆ هەموو لایەك دەربکەوێ. دەبێ مێژووی ئوممەت بە خوێنی حەقیقەتی ڕوون و ئاشکرا بنوسرێتەوە، وتەی حەق لەبەردەم سوڵتانێکی ستەمکاردا..! "و العاقبة للمتقین!".

سەرم بەرزکردەوە، لەبەردەم چاوەکانیدا هەردوو چاوم کردەوە و بە توندی تیشکی چاو سوورکردنەوە و تەحەدام لێیان بەردایەوە..! بینیم بینایی

چاوەکانی ڕیسوا بوو و بە سەرشۆڕی گەڕایەوە! هەتا کاتێك تەرمی مەعنەوییاتیم بینی لەبەردەستمدا کەوتبوو، بە پەنجەیەکی ڕێك، هاوشێوەی تیر بەرەو ڕووی ئەو ئاماژەم کرد و، بە وردییەکی وا ڕێك بیپێکم، پەنجەم لە نێوچاوانی گرت!..پاشان دەنگم هەڵبڕی و بە توندی لەگەڵیدا دوام:

- پاشا..! پاشا..! بزانە مەزنترین حەقیقەت لە ئیسلامدا لەدوای ئیمان نوێژە..! ئەو کەسەی نوێژناکات ناپاکە! ناپاك! حوکمی ناپاکیش وەرناگیرێت..!

گوللەکە لەوە بەهێزتر بوو کە خۆی و دەستوپێوەندەکەی پێشبینییان دەکرد! بێدەنگییەکی کوشندە باڵی کێشا بەسەر هۆڵەکەدا..!

زۆر سەخت و شلۆق و تەنگەتاو بوو..! چونکە ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئایندا ڕووبەڕووم کردەوە! نەك لەگەڵ سەعیدی نوورسیدا! دەبێ ئێستا دەربازبوونەکە چۆن بێت؟ چۆن ڕزگاری ببێت؟ دیارە لە زیرەکی و فێڵزانیدا هیچی کەم نەبوو، بە ئاشکرا دیاربوو بە شێوەیەکی ئاشتییانە، با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، کۆتایی بە جەنگەکە دێنێ، ئەوەبوو هاتە گۆ و وتی:

- ڕەنگە لە مەبەستی قسەکانی ئێمە تێنەگەیشتبن..!- مەبەستمان ئەوەبوو لەبارترین بوارێك خزمەتی نیشتیمانی تێدا بکەن ئەوەیە خەریکی ئیرشاد و ئامۆژگاری بن! هەربۆیە بە پلەی ئامۆژگاری گشتی (الواعظ العام) لە پارێزگاکانی خۆرهەڵات بە موچەی سێ سەد لیرە داتدەمەزرێنین!

هەرچۆنێ بێ توانی بە ئاشتییانە کۆتایی بە کۆبوونەوەکە بهێنێت..! و، لەبەر هۆکارێك کە نەخشەڕێژیی بۆ دەکرد، بە کەمێك شکست و سەرشۆڕشی ڕازیببێت!

دوای ئـەوە هەندێـك جـار دەچوومـە نـاو گۆشـەگیری و لەبەرچـاو ون دەبـووم و، هەندێك جاریـش لـەو گۆشـەگیریە دەهاتمـە دەرەوە و خـۆم دەردەخست...تێیدا بینیـم هەنـدێ لـەو حەقیقەتانـەی کـە لـە کلاورۆژنـەی فەرمـوودە پیرۆزەکانـی پێغەمبـەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سـەبارەت بـە دەججالـەکان و سـەرانی فیتنـە لـە ئاخرزەمانـدا لـە دەقـی بنەڕەتیـی پەیامـی "تیشـکی پێنجـەم" لێـم دەرکەوتبـوون، بە جۆرێك لە جۆرەکان بەسـەر ئەو کەسـە نامۆیـەدا دەچەسپان! بۆیـە ناچاربـووم دەستبەرداری ئـەو ئەرکـە گرنگـە ببـم، چونکـە گەیشـتمە ئـەو بڕوایـەی مەحاڵـە لەگەڵ ئـەو کابرایـەدا لێـك تێبگەیـن! ئەوجا کاروبـاری دونیـا و سیاسـەتم خستـە ئەولاوە و، هەمـوو وزەی خـۆم لـە فەرمانبەریـی رزگارکردنـی ئیمانـدا چڕکـردەوە!

لەڕاستیدا ئەمـە دیدارێـك بـوو بایەخـی کاتـی فێرکـردم! هەروەك چۆن خسـتمیە سـەر ئـەو رێگایـەی کـە دەبـوو سـەعیدی نـوێ بیگرێتەبەر.

پاشان کەوتمە دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە..!

## مەقامی غوربەت!

هەروەك ئەسپی تاوسەندوو بەرەو شارە خۆشەویستەکەی خۆم، شاری "وان، لە ئەوپەڕی خۆرهەڵاتی تورکیا" بۆی دەرچووم، وان لانکەی یەکەمین قوتابخانەم بوو، قوتابخانەی "خورخور"، لەوێ هەموو شتێك خۆشیدەویستم و خوشمدەویست، هەموو شتێك دەیناسیم و دەمناسی. تاسە و پەرۆشیم بۆی خەون و خولیای تێکشکاومی پڕکردبوو، تاریکییەکانی غوربەتی لەسەر دڵم ڕادەماڵی و دڵنەوایی پێ دەبەخشیم! ڕێڕەو و تولەڕێکانی ڕێگای هۆگری و هاودەمییەکانی بەلێشاو بوون، وێنەی خۆشەویستانم، لە هاوڕێیانی خوێندن و قوتابییە دڵسۆزەکانم لە ئەندێشەمدا هەڵدەقوڵان و جوانییەکی دلگیریان بە گەشتەکەم دەبەخشی!..

بەڵام هەرکە چاوم بە یەکەمین نیشانە و خاڵی جیاکەرەوەی شاری "وان" کەوت، ترس و لەرز کەوتە دڵم..!

خوای پەروەردگارم؟.. ئەمە چییە من دەیبینم؟ ئەی هاوار! دەڵێی ئەم شارە هیچ شوێنەوارێکی ژیانی پێوە دیارنییە؟ نە جموجولێك، نە دەنگ و ورتەیەك..!

ڕاستەوخۆ بەرەو قوتابخانەکەم لە قەراغ شار ڕۆیشتم، چی ببینم؟ نەرمەرنەکان هەروەك چۆن هەموو سیمایەکی ئاوەدانییان خاپوورکردبوو، ئاوەهاش

ئەو لانکەی زانستەیان سووتاندبوو..! جگە لە وێرانە و داروپەردوویەکی خەمناك کە بۆ ڕۆژانی ڕابردوو فرمێسکیان هەڵدەوەراند، هیچ شتێکیتر نەمابوو!

بەناو تولەڕێکاندا وەکو شێت بە هەڵەداوان دەهاتم و دەچووم و بە شوێن ڕوخسارێکی ئاشنادا دەگەڕام، بەڵام بێسوود بوو...! چەند کەسێکم بەرچاوکەوت وەك ئەوانەی بەبێ دەنگ شوێن جەنازە دەکەون، ئاوا کڕ و مات بە ڕێگا و بانەکاندا هەنگاویان دەنا! ئەمە نەوەیەکە جیاواز لە نەوەی من... نەوەیەکی تەواو جیاواز، ئەمە نەوەی تێکشکان و بەزینە..! داخۆ بە چ زمانێك دەدوێ؟

سەرەتا وا گومانم دەبرد کە بە گەڕانەوەم بۆ شارەکم ئیتر لە غەریبی ڕزگارم دەبێت، بەڵام داخی گرانم، لە خودی شارەکەی خۆمدا تەمی نامۆییەکی جەرگبڕ بەری ئاسمانی دەروونمی تەنی. ئاسان و سەرسام بوونەکە زۆر لەوە بەهێزتر بوو کە من بیرم لێ دەکردەوە، چونکە سەدان قوتابی خۆشەویستم لەوانەی کە پەیوەندیی ڕۆحیم هەبوو لەگەڵیان، لە وێنەی عبدورەحمان و برادەرەکانی، لەژێر گڵدان و، ڕۆڵەکانیشیان داروپەردووی خانووەکان ڕوخاوە بەسەریاندا! هەموویان ڕۆشتبوون تا لە گۆڕستانی شارە چۆڵەکەدا بەڕیز لەپاڵ یەکدا ڕابکشێن و ببنە شایەت لەسەر تاوانێکی دڵڕەقانەوە و، لە جیهانی بەرزەخدا بنواڕن بەسەر ئەم ڕۆژگارە گەوج و ئیفلیجەدا! وام هەستدەکرد چوومەتە ناو دەربەندێکی ترسناکەوە و لێی دەرباز نابم! وێڵ و سەرگەردان بەنێو ئاسەوارە ڕوخاو و سوتاوەکاندا ملی ڕێگام گرتەبەر..!

لەکاتێکدا کە ڕۆحم بە دوای خاڵێکدا دەگەڕا پاڵی پێوە بدات و پشتی پێ ببەستێت، لەپڕ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دڵی زیندووکردمەوە و، لە ئاسۆ

بەرزەکەیەوە تاڤگە و ڕێژاوێکی بەهێزی لە ژیان و بەزەیی بەسەرمدا ڕژاند!
نازانم چۆن وەکو دێوانە بە دەنگی بەرز دەستمکرد بەخوێندنەوەی:

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ يُحْيِي وَيُمِيتُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (الحديد: ١-٢)

**واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ستایشی خوا دەکەن، وە هەر ئەوە باڵادەستی کاربەجێی، هەر بۆ ئەوە دەسەڵات و خاوەنیەتی ئاسمانەکان و زەوی، دەژێنێ و دەمرێنێ، وە ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.**

وێنە زیندووەکانی بەڕوونی لەبەرچاومدا دەرکەوتن و، لەو دۆخە ترسناکە ئازارسبەخشە ڕزگاریان کردم و، لەئازاری مردن و جودایی دەریانهێنام و، بیناییمیان کردەوە بەسەر ژیانێکیتردا.. پاشان ئاوڕمدایەوە بە لای ئەو درەختانەدا کە لە نێوان خانووە ڕوخاوەکاندا بە لق و پۆپە چروپڕەکانیانەوە تەماشایان دەکردم... بەروبوومەکانی بە زەردەخەنەوە سەیریان دەکردم و بەسۆز و بەزەییەوە زامەکانیان تیماردەکردم، هێشووە ترێ و هەنجیرە تازە گەییوەکان بە خۆشەویستییەکی قووڵ و سەرزەنشتێکی میهرەبانانەوە چاویان تێ بڕیبووم... دڵ و دەروونمیان ژیاندەوە و هێز و وزەیان کردەوە بە بەرمدا، دوو لێوی هەنارێکی جوان و سەنج ڕاکێشم بینی دەجووڵان و دەیان وت "ئەی برادەر، بەسە خەم مەخۆ! بەسە..! خەم و پەژارە بەسە..! بۆچی تەنیا سەیری شوێنە ڕوخاوەکان دەکەیت؟.. ئەی بۆچی سەر هەڵنابڕی و سەیرێکی ئێمەش بکەیت! ئێمە گرۆی بەروبووم و گوڵ و هێشووە ترێ و باڵندەکانین، پێشەڵان و شەونم و سێبەر و جۆگەلە ئاو و ڕووناکییەکانین؟ ئایا لایەکیش بە لای ئێمەدا ناکەیتەوە؟ ئەی برادەر چاوێکیش بە ئێمەدا ناگێڕیت و سەرنجمان لێ نادەیت!؟"

بینیم حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە توندی دڵمی بەئاگاهێنایەوە و بیری خستمەوە: بۆچی لەناوچوونی پەیامی ئاوەدانکردنەوەیەك، کە بەدەستی مرۆڤ نوسراوەتەوە تا ئەم ڕادە نائومێدکەرە خەمبارت دەکات و بۆ داڕمانی لە لافاوی ڕاماڵەری قەدەری خوا خەفەت دەخۆی..؟ ئەو قەدەرە لە بەرگی "داگیرکاری روسی"دا دابەزی و شوێنەوارەکەی نەهێشت و نووسینەکەی سڕییەوە؟ خۆ ئەوە یەك لاپەڕەیە. نەمان و لەناوچوونی یەك لاپەڕە واتای نەمان و لەناوچوونی هەموو کتێبەکە ناگەیەنێت! ئەوەتا ئێمە لێرەین ئەی برادەر!.. چاوت هەڵبڕە بەرەو لای ئەو خوایەی (جَلَّ جَلاَلُهُ) کە هەموو شتێکی هێناوەتە بوون و، هەر دروستکراوێکی بەو جۆرە بەدیهێناوە کە خۆی ویستی لەسەرە، هەر ئەو کردگار و خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە، زاڵ و بەدەستەڵاتە و کاروباری تۆ لەدەست ئەودایە! سەرنج بدە و بیربکەرەوە! پاشان ببینە..! ئەوەتا ئەمانە نووسراوەکانی ئەون لەسەر لاپەڕەی "وان" بەوپەڕی گەشی و جوانییەوە بەردەوام دەنوسرێنەوە و نوێ دەبنەوە... ئەوە ژیانە و سەرلەنوێ لەدایکدەبێتەوە! بەڵام ئەو ئاوەدانییەی کە تۆ بینیت و ڕۆیشت، ئەو ژیانەی کە لەبەرچاو ونبوو شین و زاری بەشوێن خۆیدا هێنا، هۆکارەکەی بریتیبوو لە بێئاگایی لە بینینی خاوەنە ڕاستەقینەکەی، هەروەها بەهۆی ئەو گومانە کوشندەیەوە بوو کە مرۆڤ وای دەزانی خۆی خاوەنی ئەو شتانەیە! لەکاتێکدا مرۆڤ خاوەنی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو لەسەر ئەم زەویە میوانێکە، ڕێبواری ڕێگایە و هیچی تر!

کوڕی خۆم، ئەوەبوو لە دەرکەوتەکانی ئەو حاڵەتە گڕگرتووە بەهێزە، دەرگایەکم بەسەر حەقیقەتێکی مەزندا لێکرایەوە، دەروونیش لەژێر فشار و قورسایی ئازاردا ئامادەبوو بۆ وەرگرتنی، وەك چۆن ئاسن بە ئاگر نەرم دەبێت وشێوەی خوازراوی لێ بەدەستدێ، بەو جۆرە دەروونی خەمبارم نەرم بوو و

ملی بۆ قەدەرێکی مەزن کەچکرد. هەموو ئەمەش بە فەزڵ و بەرەکەتی تەنیا ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، ئەو ئایەتەی کە بەسەر دڵدا درەوشایەوە!

## مەقامی هیجران..!

**بەسەرهاتێک..**

ڕۆژێکیان پیاوێك کە ڕوخسار و سەروسیمای زانا و زانستی پێوە دیار بوو، بە دەمارگیرییەکی بەهێزەوە تانە و توانجی لە زانایەکیتر دەگرت، هەتا کارەکە گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە بە کافر لەقەڵەمی بدات! هەموو ئەمەش لەبەر چەند جیاوازییەك کە لە کۆمەڵە بابەتێکی سیاسی لە نێوانیاندا دروست ببوو! کەچی -لە هەمان کاتدا- دەمبینی ستایشی یەکێك لە دووڕووەکانی دەکرد و پێیدا هەڵدەدا، لەوانەی کە لەگەڵ ئاراستە و ڕێبازە سیاسییەکەی خۆیدا یەکیان دەگرتەوە! ئەم دیمەنە تەزووی بە جەستەمدا هێنا و هێز و پێزی لە ئەژنۆم بڕی، بۆیە لە کرۆکی دڵمەوە پەنام گرت بە خوا لەو سەرەنجامە نەگریسەی کە لەم ڕۆژگارەدا سیاسەتی پێ گەیشتووە! نازانم چۆن ئەم دوعایە لە دڵمدا سەری هەڵکرد:

"أعوذ باالله من الشيطان والسياسة!"

ئەم بڕگەیە بووە دوعا و پەندی سەر زوبانم، هەرکاتێك وێنەی ئەو دیمەنە ترسناکەم دەهاتەوە پێشچاو، لەبەر خۆمەوە ئەو دوعایەم دووبارە دەکردەوە! لەوە بەدواوە لە گۆڕەپانی ژیانی سیاسی کشامەوە و! خۆم بۆ خزمەتکردنی قورئانی

پیرۆز یەکلاکردەوە، ئیتر بەو شێوەیە لە فراوانترین دەرگاوە چوومە ناو ژیانەوە! لەڕاستیدا لە ژیانی گومان و دوودڵی هاتمە دەرەوە و چوومە ناو ژیانی دڵنیاییەوە، ئیتر ئەوەی مەبەستم بوو بێ کەموکورتی دەستمکەوت!

کوڕی خۆم، بێگومان دەمبینی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە ساڵا دەچم و، بمەوێ یان نا، وەڵامی بڵێسەی ئاگری پیری دەدەمەوە، نەمدەزانی دوای ئەو تەمەنە چەندی تر دەژیم! ئەگەر بڕیاربێت لەوە زیاتر بژیم! ئەوا خۆم یەکلادەکەمەوە بۆ ژیانی هەتاهەتایی!.. جا لەبەر ئەوە ئیمان هۆکاری بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتاییە و، کلیلی کردنەوەی دەرگای ماڵی بەختەوەریی نەبڕاوەیە، ئەوا منیش بڕیارمدا، کۆشش بکەم بۆ بەدەستهێنانی بەرزترین پلەکانی ئەو ژیانە!

من لێرەدا خۆم سەرقاڵناکەم بەگەمەی سیاسی و قوماركردنێكی دۆڕاوەوە، بەڵكو ئەو كارە جۆرێكە لە شێتی! من لەم ڕۆژگاری پیرییەمدا! ئامادەنیم قومار بە دواڕۆژی خۆم و سەرەنجامی هەتاهەتاییمەوە بکەم !

پێی وتم:

ئەگەر دەڵێی: چۆن خزمەتکردنی قورئان و ئیمان ڕێی سیاسەتت لێ دەگرن؟

- ئەوا دەڵێم: بێگومان ڕاستییەکانی ئیمان و نوورەکانی قورئان زۆر بەنرخن، هەروەك گەوهەر و مرواری و ئەڵماس گرانبەهان! خۆ ئەگەر هاتوو خۆم بە سیاسەتەوە سەقاڵکرد، ئەوا گشتینەی خەڵکی وا گومان دەبەن من دەمەوێ ڕایانبکێشم بۆ ناو تەوژمێکی سیاسی! ئەو کاتە دەڵێن: ئەو کارەی پێی هەڵدەستێ، بانگەشەیەکی سیاسییە و بەرژەوەندی خۆی تێدایە و دەیەوێ خەڵکی بخەڵەتێنێ و بیانخاتە شوێن خۆی.! ئیتر ئەوان بە ناهەق حوکم بەسەر ئەو

گەوهەرە گرانبەهایانەدا دەدەن و وەکو وردە شووشەی بێ نرخ سەیریان دەکەن! جا ئیتر ئەو کات من ستەمم لە ڕاستییەکانی قورئان کردووە و! لە نرخەکەیانم دابەزاندووە!

دەسا ئەی ئەهلی دنیا! بۆچی فشارم دەخەنەسەر و ئازارمدەدەن؟ بۆچی وازم لێناهێنن بەکاری خۆمەوە سەرقاڵبم؟! خۆ من لە ئێوە نیم و ئێوەش لە من نین، هەرگیز ڕکابەری ئێوە نیم! بەڵکو من ڕووی خۆم بەرەو ژیانی دواڕۆژ وەرگێڕاوە!

پێی وتم: "سەعیدی کۆن" نزیکەی دە ساڵ لە گێژاوی سیاسەتدا ڕۆچووبوو! ئەو کاتە سەعید دەیوت! بەڵکو بتوانم لە ڕێگەی سیاسەتەوە خزمەتی ئاین و زانست بکەم..! بەڵام هەیهات! لەڕاستیدا هەموو هەوڵەکانی بە بادا چوون..! چونکە درۆ و خەڵەتاندن هەرگیز نابنە کلیلی دەرگای خێر و چاکە..!

ئەوە ئاسانترین هۆکارە بۆئەوەی کەسانی خۆ هەڵقورتێن و ساویلکە بکەونە داوی شەترەنجەوە! مەبەستم ئەوەیە بابای سیاسی ببێتە داردەستی بیانییەکان و وەکو ئامێرێك بەکاریبهێنن و، بێئەوەی بە خۆی بزانێت گەل و نیشتمانی پێ وێران بکەن! ئەوەش دەرگایەکە بۆ چوونە ناو زۆنگاوی هەزاران تاوان وگوناە و خراپەکارییەوە! هەر لەبەر ئەوە بوو "سەعیدی کۆن" وەك چۆن وازی لە خووی خوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامە هێنا، وەهاش وازی لە مەیدانی سیاسەت و کۆڕ و کۆبوونەوە دنیاییەکان هێنا..!

دەسا بەرەو چیا بەڕێ بکەوە و لە ناڵەی ئاگر و چڕە دووکەڵی فیتنە و ئاشووب خۆت بەدوور بگرە!

................

لەوێ لە چیای "ئەرەك"ی سەرکەش لە دەوروبەری "وان" لەگەڵ سێ لە قوتابییە تایبەتەکانم خۆماندا بە تێڕامان و بیرکردنەوە لە بوون و ژیان... و لە باخچەی قورئاندا گوڵی نوورینمان دەچنی.. چالاکانە سەرقاڵی پەروەردە و فێرکردنی قوتابییەکانم بووم و، خۆمان بۆ بەهاری نوێ ئامادەدەکرد..

## بەسەرهاتێكی تر

"مەلا حەمید" یەكێكە لە قوتابییەكانی بەدیعوززەمان، لەسەر دەستی ئەو لە چیای "ئەرەك" پێگەیشت و بڕوانامەی بەدەستهێنا. ڕۆژێكیان خەمەكانی دەهێنایەوە یادی خۆی و دەگریا، پاشان هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشا و دەستیكرد بەگێڕانەوە:

كاتێك لەپشت سەری مامۆستاوە نوێژم دەكرد، دڵ و دەروونم دەكرایەوە و ئاسوودە دەبووم، نوێژكردنی مامۆستا ترس و سام و ملكەچیی لە دڵی مرۆڤدا زیاد دەكرد... ئامۆژگاری دەكردین و دەیوت زیكر و تەسبیحاتەكانی دوای نوێژ لە حوكمی ناوك و تۆوی نوێژدان، بە دەنگێكی ناسك و خەمناك تەسبیحاتی دەكرد، كاتێك دەیوت "سبحان اللّٰه... سبحان اللّٰه"، گومان لێ بوو لە قووڵترین قولاَییەكانی دڵیەوە دەهات..!!

هەرچەندە من چاوم بە شێخ و زانای زۆر كەوتووە، بەڵام كەسێكم نەبینیوە وەكو ئەو بە ترس وسام وملكەچییەوە نوێژبكات و تەسبیحاتی خوا بكات.

كاتێك دەیوت: "لااله الا اللّٰه" دەنگی ئەوەندە بەهێز بوو دەتوت گرمە و تەقینەوەی تۆپە. هەموو شەوێك هەڵدەستا بۆ شەونوێژ..

جارجار کە دەمبینی نوێژدەکات، خەو لە چاوم دەتۆرا و نەمدەتوانی بنووم، کە دەیبینی بەئاگام دەیوت:

- مادەم نەخەوتوویت، وەرە باپێکەوە دوعا بکەین..

بەڵام من هیچ دوعایەکم لەبەرنەبوو، بۆیە پێی دەوتم:

من دوعا دەکەم و تۆیش لەدوامەوە بڵێ: ئامین..

هەندێ جار لە کاتی دوعادا خەو دەیبردمەوە، ئەویش بە بەزەییەوە دەیوت:

- لە سەرەتادا منیش وەکو تۆ وابووم، ئارامبگرە لەمەودوا ڕادێیت..! بە ڕاستی ڕۆژەکانمان بەسەر ئەو چیا بەرزەوە قوتابخانەیەکی ئەرقەمییانە بوو، قەد لەبیرناچنەوە... ڕۆژەکانمان بە پەرستش و خوێندنەوە و، هەندێ جاریش بە گەشت و گەڕانی سەر چیا و نێو دەشت و دۆڵەکان بەسەردەبرد..!

لە پاڵ کانیاوی "زەرنەباد"ی سازگار و لەسەر یەکێك لە قەدپاڵە بڵندەکانی کێوی "ئەرەك"، لەناو چڕیی لق و پۆپی درەختە بەرزەکاندا، تەختێکی ڕوانین و تێڕامانمان لە دار بۆ مامۆستا دروستکرد. ئێمەش بۆ خۆمان لەژێر سێبەری درەختەکاندا دادەنیشتین..

تەختەکەی مامۆستا دەیڕوانی بەسەر دەریاچەی "وان"ی مەزندا، بە شێوەیەك چەندین دیمەنی جۆراوجۆری لەخۆدەگرت. چونکە ئەوەی لەوێوە سەیریکات، دیمەنی ئەو بەلەمانە دەبینێ کە بە هێواشی دەپەڕنەوە بۆ ئەو گوندانەی کە چۆکیان داوە بەسەر دوورگە و کەناراوەکاندا، هەروەها دەیڕوانی بەسەر ئاسۆی ئەو پێدەشتانەی کە لە دامێنی چیای سەرکەش و مەزنی "ئەرەك"دا درێژبوونەتەوە.. دیمەنی دەریاچەکە بە زۆری دڵ و سەنجی مامۆستای بۆ لای

خۆی ڕادەکێشا..چونکە مەزنترین دەریاچەیە لە تورکیادا، تەنانەت خەڵکی هەرێمی ڕۆژهەڵات بە "دەریا" ناوی دەبەن! بۆیە ئەو تەختە بە لای مامۆستاوە باشترین میحراب بوو بۆ بەجێهێنانی پاڕانەوە و زیکر و موناجاتەکانی. مامۆستا وەك چۆن لە نوێژدا دادەنیشت بۆ خوێندنی تەحیات، ئاوەها بەو جۆرە لەسەر تەختەکەی دادەنیشت، بەزۆری لەسەر ئەو شێوازە درێژەی بەدانیشتنەکەی دەدا، هەتا یەکێك لە پەنجەکانی قاچی برینداز بوو..!

"مەلا ڕەسووڵ" قوتابی مامۆستا کە بە تەمەن کەمێك لە مامۆستا گەورەتر بوو، ڕۆژێکیان سەرقاڵی ئاگرکردنەوە و چالێنان بوو... مامۆستا بانگی کرد تا بە مەرهەمێك کە لە لای بوو، تیماری پەنجەکەی بکات، ئەویش بە گورجی چووە خزمەتی. لەو کاتەدا کە خەریکی تیمارکردنی پەنجەی مامۆستا بوو، ڕووی تێکرد و وتی:

مامۆستای خۆشەویست! بە ڕاستی تۆ زۆر ئازاری خۆت دەدەیت! ئەوەتا ئێمەش شەرم لە خوا دەکەین و لێی دەترسین، بەڵام ترسی خوا لە دڵی تۆدا بە جۆرێکە خەریکە زراوت دەچێ..! خۆ ئەگەر جاروبار پشووتبدایە، پەنجەت برینداز نەدەبوو!

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:

- مەلا ڕەسووڵ! مەلا ڕەسووڵ! ئێمە هاتووین بۆ ئێرە، تاکو بەم تەمەنە کورت و لەم دنیا بڕاوەیەدا ژیانی نەمری و جاویدانی بەدەستبهێنین. لێرە چۆنم بوێ ئاوەها بژیم و دواتریش بەتەمای بەهەشت بم..؟ هەرگیز شتی وا نابێت..! من ناوێرم بە ئارەزووی خۆم بژیم!

مامۆستا کاتی خۆی بەفیڕۆنەدەدا، یان خەریکی نوێژکردن بوو، یان دوعای

دەکرد و لە خوا دەپاڕایەوە، یان زیکر و تەسبیحاتی دەکرد، یان لە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەوی وردده‌بوویەوە، کاتێکیش دۆست و خۆشەویستان سەردانیان دەکرد، لەگەڵیان دەکەوتە گفتوگۆ، یەکەمین پرسیارێك لێی دەکردن ئەمە بوو:

- ئایا لە گوندەکەتاندا مزگەوت هەیە؟ مامۆستای مزگەوتەکان چ وانەیەك دەڵێنەوە؟ ئەگەر میوانەکە لە وەڵامدا بیوتایە مزگەوتمان نییە و مامۆستاش نییە فێرمان بکات، زۆر خەمبار دەبوو! سەری لە کاریان سوڕدەما، چۆن لە شوێنێکدا دەژین کە نە مزگەوت و نە ڕابەری لێیە؟!

قەت ڕێگەی نەدەدا کەس لە لای ئەو لە پاشملە باسی کەسێکیتر بکات، بەوە زۆر تووڕە دەبوو..!

# مەقامی تیرۆرکردن

# خەلافەتی ئیسلامی و چیرۆکی کۆتایی..!

پێی وتم:

کاتێك سولّتان محەممەد ڕەشاد سالّی ١٩١٨ی زایینی کۆچی دوایی کرد، سولّتان محەممەد وەحیدەدین -برای سێیەمی سولّتان عەبدولحەمیدی دووەم- کاروباری خەلافەتی گرتەدەست و لە دوای داگیرکاریی ئینگلیزیش لە ئەستەمبووڵ مایەوە. ئەوەبوو لە سەرەتای تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا، حکومەتی ئەنقەرە بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال هەڵوەشاندنەوەی ڕژێمی سولّتانیی ڕاگەیاند! لەبەر ئەوە دەسەڵاتی وەحدەدین بە فەرمی کۆتایی پێهات، بەو هۆیەوە داوای لە سەرکردایەتی بەریتانیا کرد ڕێگەی بدەن وڵات بەجێبهێڵێت! لە ئەستەمبووڵەوە بەرەو "ماڵتا" دەرچوو، لەوێوە بەرەو حیجاز و پاشان بۆ "سان ڕیمۆ" لە ئیتالیا، ئیتر بۆ خۆی لەوێ مایەوە، تا بەرواری ٥ی مایسی ١٩٢٦ی زایینی لە تەمەنی -شەست و پێنج ساڵیدا- کۆچی دوایی کرد. وەسیەتی کرد لەپاش مردنی لە وڵاتەکی خۆی بنێژرێت، بەڵام لە لایەن حکومەتی ئەنقەرەوە یاساغێکی یاسایی خرایە سەر هەموو ئالی عوسمان. بۆیە داوای کرد بەلای کەمەوە لە وڵاتێکی ئیسلامیدا بنێژرێت! حەزی وابوو لە دیمەشق و لە گۆڕستانی سەلاحەدینی ئەیوبیدا بەخاك بسپێررێت. محەممەد وەحیدەدین،

لە مەنفا بە ئاوارەیی و تەنیایی و قەرزاربـاری ژیانی بردەسەر، پاش ئەوەی چاوەکانی لێکنا، لە لایەن خاوەن قەرزەکانەوە دەست بەسەر تەرمەکەیدا گیرا! کاتێك "ئەحمەد نامی بەگ" سەرۆکی سوریا بەوەیزانی، هەموو قەرزەکانی بۆ دایەوە. داوای هێنانەوەی تەرمەکەی کرد بۆ دیمەشق، بەڵام لە گۆڕستانی سەلاحەدیندا جێگە نەبوو بینێژن، بۆیە لە حەزیرەی تەکیەی سولەیمانیەدا بەخاك سپێررا.

کاتێك دەسەڵاتی پاشایەتی هەڵوەشایەوە و سوڵتان وەحیدەدین وڵاتی بەجێهێشت، ئەوکات وەلی عەهد، عەبدولحەمید ئەفەندی بوو، کە پشتیوانی لە خەباتی نیشتمانی دەکرد، بۆیە ئەنجومەنی گەلی تورکی -کە مستەفا کەمال لە ئەنقەرە دایمەزراندبوو- ناچار بوو لە ١٨ی تشرینی یەکەم ١٩٢٢ی زایینیدا خەلافەتی ئەو ڕابگەیێنێ، بەڵام خەلافەتی بێ دەسەڵات! واتە گەورەی وڵات بێ بەڵام فەرمانی بەدەست نەبێ!

هەتا ئەوەبوو ڕۆژی مەرگەساتی هەرە مەزن ٣ی ئازاری ١٩٢٤ی زایینی /١٣٤١ی کۆچی هاتە پێش، ئەو ڕۆژە لە مێژووی ئوممەتی ئیسلامدا ڕۆژی ماتەمینی و خەم بوو! چونکە ئەنجومەنی گەلی تورکی لەو ڕۆژەدا بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی! هێمای یەکبوونی ئوممەت و کۆکەرەوەی کەسایەتییە هەمەکییەکەی، بڕیارێکی مێژوویی ترسناکیان دەرکرد، هەروەها هەموو ئەندامانی ئالی عوسمان دوورخرانەوە بۆ دەرەوەی وڵات، عەبدولمەجید ئەفەندی دوایین خەلیفەی عوسمانی، ئاوارەی سویسرا کرا، پاشان بۆ پاریس، ئیتر بۆ خۆی لەوێ لە ١٩٤٤ی زایینیدا کۆچی دوایی کرد، وەسیەتی کرد دوای مردنی لە ئەستەمبووڵ بنێژرێ، هەرچەندە هەوڵی زۆر

درا، بەڵام وەسیەتەکەی نەهاتەدی، بۆیە لاشەکەی مۆمیا کراو لە حوجرەیەکی تایبەتدا لە مزگەوتی پاریس بۆ ماوەی دە ساڵی ڕەبەق هەڵگیرا! پاشان ساڵی ١٩٥٤، دوای چەندین هەوڵ و تکاکاری، تەرمەکەی گوازرایەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە و لەوێ ئەسپەردەی خاك کرا.

پێی وتم: وەختێ شورا مەزنەکەی خەلافەتی ئیسلامی ڕووخا، ئوممەتی ئیسلامی پارچەپارچە بوو، پاشاگەردانی باڵی کێشا بەسەر هەموو لایەکدا، گورگەکانی داگیرکەریش دەستیانکرد بە دابەشکردنی میراتی "پیاوە نەخۆشەکە". من ئەو کاتە هێشتا لە چیای "ئەرەك" لە گۆشەگیرییەکەمدا بووم، وام هەستدەکرد قاچەکانم بە ناو تاشە بەردە سەختەکانیدا ڕۆدەچن و لوتکە بەرزەکانیشی لە دەوروبەرمدا هاتوونەتە لەرزە..! ئازار دڵی بیمارمی دەگوشی... قوتابییەکانم سەیری ڕوخساری هەڵبزرکاویان دەکردم و سەرنجی لەرزینی دەست و پێیان دەدام، خێرا لێیان پرسیم، چیت لێ قەوماوە؟ جارێکی تر وتم: ئازاری ئوممەتە خەمبارەکەم منی هاڕی!

خەوەکەی چیای "ئەرارات" هاتەوەیادم.. ئەو خەوەی دە ساڵ لەوەوبەر بینیبووم! جارێکی تر هاوارە بەهێزەکەم بیست، کە گوێکانی کون دەکرد:

- ئەی سەعید..! ئیعجازی قورئان ڕوونبکەرەوە..!

"تەقینەوە مەزنەکە"ی ناو خەوەکە پێشتر بە تێکشکانی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا و، داگیرکردنی ئەستەمبووڵ لە لایەن ئینگلیزەوە لێکدرایەوە! خێرا وەڵامی بانگەوازەکەم دایەوە و پەیامی "شەش هەنگاوەکان"م نووسی، ئەوە بوو ئەو ڕۆڵەی بینی کە بینی! پاشان ئەوەتا جارێکیتر تەقینەوە مەزنەکە بە ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی و تێکچوونی یەکێتیی ئوممەت و

بڵاوبوونـەوەی بێبـاوەڕی لـە هەمـوو شـوێنێکدا، لێـك دەدرێتـەوە!... فەرمانەکـە ئەوەیـە، بەرگریکـردن لـە ڕاستییەکانی قورئانـی مـەزن بگرمـە ئەستۆ!.. وێنـەی کەسایەتیی "سـەعیدی نـوێ" لـە گیانمدا کامـڵ بـوو، ئیتـر زانیـم ئەمـە کاتـی هاتنـە دەرەوەمـە لـە گۆشـەگیری..! پاشـان پەنجـەی شـایەتومانم خسـتە نـاو خۆڵەکـەوە و نەخشـە و هێماکانـی ڕێـگام کێشـا..!

# مەقامی ئاگرتێبەربوون..!

لـە نێوەنـدی کشـوماتیی گۆشـەگیری و دوورەپەرێزیـی ژیانـی سیاسـیی -کێوی "ئـەرەك"دا- هەواڵێکی جەرگبڕی ترسـناکم پێگەیشت!.. لـە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتـدا بـە پێشـەوایەتی "شـێخ سـەعیدی پیـران" ئاگـری شـۆڕش هەڵگیرسـابوو! زۆری بەسـەردا نەڕۆیشـت، هەتـا نوێنـەری شـێخ سـەعید هـات بۆ لامـان و، داوای لێکردیـن سەنگ و، دەسەڵاتمان بخەینەگەڕ بۆ درێژەدان و پشـتیوانیکردن لـە شـۆڕش! پرسـیاریش لای مـن هەمیشـە ئەمـە بـوو: لەسـەر حیسـابی کـێ؟ هەروەهـا سـوودمەندی ڕاسـتەقینە لـە هەمـوو ئـەو کارانـەدا کێیـە؟ خـۆ -لـە هەمـوو حاڵەتێکـدا- ئەمـە خوێنـی موسـڵمانانە! لەبەرئـەوە بەشداریم نەکرد و داواکەیانـم ڕەتکردەوە! هـاوکات نامەیەکم بـۆ شـێخی پیـران نووسـی کـە تیایـدا هاتبـوو:

"لەڕاستیدا ئـەو شۆڕشـەی ئێوە پێیهەڵدەسـتن پـاڵ بـە بـراوە دەنـێ و هانیـدەدا بـۆ کوشـتنی براکـەی و هیـچ ئەنجامێکیـش ناهێنێتـە دی! خـۆ نەتـەوەی تـورك هەڵگـری ئـاڵای ئیسـلامە و، لەپێنـاو ئاینەکەیـدا سـەدان هـەزار، بەڵکـو ملیۆنەهـا شـەهیدی داوە، سـەرەڕای ئـەوەش ملیۆنەهـا پیاوچاکـی پێگەیانـدووە، لەبـەر ئـەوە هەرگیـز شمشـێر لـەڕووی نەوەکانـی نەتەوەیەکـی ئاوەهـا ڕاناکێشـرێت! هەروەهـا منیـش لـە بەرامبەریانـدا شمشـێر ڕاناکێشـم."

شوێنی مانەوەکەم لە چیای "ئەرەك" بریتیبوو لە خەڵوەتگایەکی کۆنی ڕووخاو، لەوێ لەگەڵ قوتابییەکانمدا خەریکی ڕێکخستنەوەی بیروبۆچوونەکانم بووم.. کاتێك ئێمە لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بووین، سێ سوارچاك بەسەر چەند ئەسپێکی ڕەسەنەوە سەردانیان کردین. پیاوێکی چوارشانەی بەسام و هەیبەت لە ناوەڕاستیاندا بوو..! ئەوە حسێن پاشایە، شێخی عەشیرەتی حەیدەران..! داخۆ دەبێ چی هێنابێتی بۆ ئێرە؟

پێی وتم: سوارەکان لەبەر دەرگای خەڵوەتگاکەدا ئەسپەکانیان بە درەختەکانەوە بەستەوە، پاشان هاتنە ژوورەوە و سڵاویان کرد و بە ئەدەبێکی زۆرەوە لێم نزیك بوونەوە، دەستیان ماچکردم و لەبەردەممدا دانیشتن... حسێن پاشا هەیئەتێکی بەهەیبەتی هەبوو، چەندین نیشانە و مەدالیای تایبەت بە سەرلەشکرەکانی ئەو وەختەی پێوەبوو... بوخچەیەکی دەرهێنا بڕی نیوکیلۆ زێڕی تێدابوو! خستیە سەر زەوی و لەبەر دەستمدا داینا..! پاشان وەکو کەسێك تکا بکات سەیری کردم..! سەرم سوڕما لەو ڕەفتارەی، زانیم لەپشت ئەو ڕەفتارەوە مەرامێك هەیە... خێرا بە جۆرێك لە زبری پرسیارم لێکرد، هەتا مەبەستە شاراوەکەی لێ دەربهێنم،

ئەمە چییە...؟

وتی:

ڕۆحم بە قوربانت بێ ئەوە زەکاتەکەمە، هێناومە بۆ تۆ، لە پاکترین ماڵ و سامانی خۆم دەرمکردووە!

وتم:

لە دەوروبەری خوتدا کەسێك نەبوو زەکاتی پێ بشێ؟ لە خزمەکانی خۆت، یان لە گوندنشینەکانت؟

وتی:

- گەورەم... خزمەکانم و ئەوانەی لە دەوروبەرمدان هەموویان دەوڵەمەندن، هەژاریان تێدا نییە، ئێوەم بە شایستەترین کەس زانی بەم زەکاتە!

وتم:

- دروست نییە زەکات لە شوێنی خۆیدا بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکیتر..! بۆچی هێناوتە بۆ ئێرە؟ لەوێوە تا ئێرە زۆر گوند و لادێت بەجێهێشتووە، ئەوانە پڕن لە کەسانی هەژار و نەدار!

وتی:

- قوربان! تکاتان لێ دەکەم! بەلای کەمەوە چەند پارچەیەکی لێ هەڵبگرن.. خەرجی بکەن بۆ ئەو قوتابییانەی لەگەڵتدان..!

وتم:

- نەخێر! نەخێر..! پێویستمان بە زەکات نییە..! پارەکانت هەڵبگرە، ئەی پاشا، سوپاست دەکەین..!

ڕوخساری حسێن پاشا لە ئارەقدا خوسا، سەرسوڕمانییش لە چاوەکانیدا سەوز بوو... وشەکان لە زاریدا پەشۆکان و گیریان خوارد! هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت بچەمێتەوە بۆ زەوی و پارچە زێڕەکان یەك لە دوای یەك کۆبکاتەوە.. هەتا کاتێك لێ بووەوە سەری هەڵبڕی و جارێکیتر بە تکاکردنەوە وتی:

- قوربان..! دەمەوێ سەبارەت بە کارێکی تایبەت پرسوڕاتان پێ بکەم، گەر بکرێت مۆڵەتی قوتابییەکانت بدەیت بچنە دەرەوە، دەمەوێ بەتەنیا سەبارەت بە مەسەلەیەکی تایبەت لەگەڵتدا بدوێم.

وتم:

- نابێ و ناکرێ... چونکە ئەو قوتابییانە بەشێکن لە من، لە هیچ حاڵەتێکدا لێم جیانابنەوە..! چیت پێیە ئاشکرای بکە... چیت ئەوێ بیڵێ!

وتی:

قوربان! تکا دەکەم ڕێمان بدە ڕاپەڕین لە دەسەڵات! دەمانەوێ لەگەڵ شێخ "سەعیدی پیران"دا شۆڕش ئەنجام بدەین! ئێمە خۆمان ئامادەکردووە!

سەرم هەڵبڕی و چاوم بڕییە ناوچەوانی:

- لەبەرچی هەڵدەگەڕێنەوە؟ ئەگەر زەید و عەمر تاوانبارن، خەڵکانی تر چ تاوانێکیان هەیە؟.. ڕشتنی خوێنی موسڵمانان پای چی؟

بە دەنگێك کە لە دەنگی گریان دەچوو وەڵامی دایەوە:

- قوربان، ڕوسەکان لەناویان بردین! شەڕیان لەگەڵدا کردین و خوێنیان ڕشتین، ماڵ و منداڵیان قەڵاچۆ کردین، لەگەڵ ئەوەشدا شەرەفمان پارێزراو بوو، کەس بە خراپە دەستی بۆ نەدەبردین..! بەڵام ئێستا هەڕەشە ڕووی لە ئاینمانە، شەرەفمان مەترسی ئەتککردنی لەسەرە..! لەسەر ئەم چارەنووسە ترسناکە ڕیسواکەرە چۆن ئارام بگرین؟ بۆیە تکا دەکەم مۆڵەتمان بدەن دەستبدەینە چەك و ڕاپەڕین..! جەنگاوەرەکانمان چ پیادە و چ سوارە، هەموویان ئامادەن..!

بە بایەخەوە گوێم لێ گرتبوو، سەرم داخستبوو، جووڵەم لە خۆم بڕیبوو.. هەر کە لە قسەکانی بووەوە، جارێکی تر سەرم هەڵبڕی و داخ و پەژارەش دڵمی لەتوپەت دەکرد، پاشان بە دەنگێك، کە میهرەبانی داپۆشی بوو، خەم و

خەفەتیش کۆڵی قورس کردبوو وتم:

- ئێوە کێ دەکوژن، ئەی پاشا؟

یەکسەر وەڵامی دایەوە:

- مستەفا کەمال!

خێرا ڕێم لێ گرت:

- سەربازەکانی مستەفا کەمال کێن؟

پاشا کەمێك شڵەژا...پاشان وتی:

- سوپای دەوڵەت، سەربازەکان...!

- ئەدی سەربازەکان کێن؟ ئایا ڕۆڵەی عەشیرەتەکەی من و عەشیرەتەکەی تۆ نین؟ ئایا موسڵمان نین؟

سەری داخست و هیچی نەوت... پاشان دەستم کردەوە بە قسەکردن و بە دەنگێکی هێواش و لەسەرخۆ پێم وت:

- ئەی پاشا..! شۆڕش شەڕە..! پێشتر نامەیەکم نووسی بۆ شێخ سەعیدی پیران و تیایدا هەڵوێستی خۆمم ڕوونکردەوە..! ئەوە چارەسەر نییە، بەڵکو درێژکردنەوەی تەمەنی تاریکییە ئەگەر تێدەگەن و دەزانن! پاشان ئەو سوپایەی ئێوە لەگەڵیدا دەجەنگن، سوپای دەوڵەتی عوسمانیە، تیایدا پیاوی چاك و موسڵمانی بێ ئاگا هەیە..! لە هەموو حاڵەتێکدا هەر ئوممەت زەرەر دەکات، چ ئێوە سەر بکەون چ ئەوان! بزانە ئەی پاشا، بە دڵنیاییەوە من نە لە ئێوەم، نە لە ئەوان..! من کارێکی ترم هەیە، ئەوە بە گرنگتر و بەسوودتر دەزانم!

وتی:

- ئەی مامۆستا، بە ڕاستی ساردتکردمەوە و چرای هیمەت و لێبڕانت کوژاندمەوە..! ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ لای عەشیرەتەکەم دەڵێن پاشا ترسا و وازی لە شۆڕش هێنا..!

بە جۆرێك لە دڵدانەوە پێم وت:

- بەڵێ، با ئەمڕۆ بڵێن "ترسا و زەندەقی چوو"، ئەوە باشترە لەوەی سبەینێ بڵێن "خوێنی بە ناهەق ڕشت و بێ تاوانانی کوشت..!"

پاشا بە کوڵێکی گرانەوە هەڵسا و نەیدەزانی چی بکات! ماڵئاوایی کرد و بە شپرزەیی چووە دەرەوە... بە دەنگێکی بەرز بانگم کرد و هێنامەوە هۆش خۆی:

- خوێن مەڕێژە، ئەی پاشا..! خوێن مەڕێژە..! خوێن مەڕێژە..!

* * *

حسێن پاشا گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی و هێزەکانی خۆی بڵاوەپێکرد، لەناوچەی "وان" هیچ ڕووداوێك ڕووی نەدا و خوای گەورەش، عەشیرەتەکەی لە شەڕی براکوژی پاراست!

بەڵام لە دوای هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕش لە پارێزگاکانی ڕۆژهەڵاتدا ڕەشەبای فیتنە و ئاشوب، هەڵیکرد بەسەر گەل و نیشتیماندا! سوپای دەوڵەت هێرشی هێنا و ئابلوقەی هۆزە شۆڕشگێڕ و ڕاپەریوەکانیدا و تەڕ و وشکی پێکەوە سوتاند..! لەپاش شکستهێنانی شۆڕشیش، شێخ "سەعیدی پیران"ی سەرکردەی شۆڕش -بەڕەحمەت بێت- لەسێدارە درا..! پاشان دەستکرا بە

هەڵمەتی دەستگیرکردن لەناو ڕیزەکانی هەموو ئەوانەدا کە گومان دەکرا تەنیا بە ئاماژەیەکیش پشتیوانییان لە شۆڕش کردبێت.. ئەگەرچی مامۆستا سەعیدی نوورسی هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرای لەمەڕ شۆڕشەکە هەبوو، کەچی لە پێشەکیی ئەوانەوە بوو کە دەستگیرکرا..! حکومەت ئەویشی لەگەڵ سەرۆك عەشیرەت و شێخ و کەسایەتییە دەسەڵاتدار و ناودارەکانی پارێزگا ڕاپەڕیوەکانی خۆرهەڵات کۆکردەوە و نەفی کرد بۆ خۆرئاوای ئەنادۆڵ!..

ئیتر بەم جۆرە گەل و وڵات ئاگریان تێبەربوو..!

## مەقامی دوکەڵ

هەمـوو دارسـتانەکان گڕیـان گرتبـوو..! کارەسـات قەومابـوو.. جەسـتەی بچووکی باڵندەکان لەنێوان پشکۆ گڕگرتووەکاندا، کە ئاگر تیایدا بە مەبەستی خۆی گەیشتبوو و کاری خۆی تێدا ئەنجامدابوو، وەکو پوشکە بەدەم ڕەشەباوە دەهاتن و دەچوون. بەدەم ڕەشەباوە..! ئەی خوایە! ئەم ڕۆژگارە چەندە سەخت و خەمناکە! نە جریوە جریوی چۆلەکەکان هەیە، نە باڵندە دەنگ خۆشەکان دەخوێنن، هەر ناڵە و نرکە و کڵپەی ئاگرە ژیان قووت دەدات..! ئەوەتا هەموو شتێك دەمرێت.. ئەوەیشی بە ئاگری مەینەتی نەسووتێ، بە دوکەڵی فیتنە و ئاشوب دەخنکێ..!

دوکەڵی ئەم زەمانە، بەڕێزان گەردەلوولێکی ترسناکە.. بەسەر خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتدا هەڵیکرد و هەموو شتێکی لەبن هێنا.. ڕاستییەکانی ئیمانی تێکوپێکدا، پایەکانی ئیسلامی لەبنەوە هەڵکەند.. تارماییەکانی تاریکی چەندین یاسای دەستکردیان دانا و، چەندین بڕیاریان دەرکرد، ئەمەش بە مەبەستی دەرهێنانی ئاین لە ڕەگ و ڕیشەوە و، کوژانەوی پشکۆی ئیمان لە دڵی نەتەوەی تورکدا، ئەو نەتەوەیەی، کە بەدرێژای شەش سەدە ئاڵای ئیسلامی لە جیهاندا بەرزکردبووەوە!.. خوێندنی ئاین لە هەموو قوتابخانەکاندا قەدەغە کرا، ژمارە و پیتە عەرەبییەکان لە نووسیندا گۆڕان و کران بە پیتی لاتینی! بانگدان و

نوێژکردن بە زمانی عەرەبی قەدەغەکرا! هەوڵێکی ترسناك خرایەگەڕ وەرگێرانی تورکیی قورئانی پیرۆز بسەپێندرێ.

عەلمانیەتی دەوڵەت ڕاگەیەنرا، عەلمانیەتێکی ڕووگرژی نکۆڵیکار! عەلمانیەتێك چەوساوەکانی لە ئاو و هەوا و تەنانەت لە مافی گریانیش بێبەشکرد..! دەرگای خۆشی و حەزە جوانەکانی داخست و، دوانگەی نووری ڕووخاند و، هۆنراوە و هەڵبەستی لەگۆڕنا! بە زەبر و زەنگ لە ژێر سەقفێك لە ئاسن چاوەکانی بەسەر تاریکییەکی سەختدا داخست، ڕوانینە ئاسمانی لێ قەدەغەکرد..! ئەژدیهاکانی عەلمانیەت، هەموو ئاوی دەریاکەیان هەڵلووشی، ئالا ڕەشەکانیشی بەریان لە هەڵهاتنی خۆر گرت! پاشان...

پاشان یاسا لەدوای یاسا دەردەچوو کە بەندایەتیکردنی خوای تاك و تەنیای لەسەر زەمیندا بە یاساغ دادەنا! ڕێ لە هەموو چالاکییەکی ئیسلامی گیرا، پاشان کۆت و بەند خرایە سەر چاپە ئیسلامی و عەرەبییەکان، گەل ناچارکرا جلوبەرگی ئیسلامی وازلێبێنێ و بەرگی ئەورووپی لەبەر بکات.. پیاوان دەبوو، تەنیا شەبقەی غەربی و پاڵتۆی ڕۆمی و پانتۆڵ لەبەربکەن! لە گشت کوچە و کۆڵان و شەقامەکاندا مێزەرەکان بەسەریانەوە دروێنەکران، ئیمانیش لە خوێنی خۆیدا گەوزا و بە هاوار و ناڵەوە گل بووەوە، تاکو ئەمڕۆش بۆسفۆڕ بە هاوارە خەماوییەکانی ئەو دەنگدەداتەوە! دوای ئەوە ژنانیش جگە سفوری هیچی تریان بۆ نەمایەوە.. دەبا سفوری و ڕووتی لە هەموو شوێنێك و بەگشت لایەکدا بۆ خۆی ڕابکات..! دەبا ڕەوشتی شەرم و ئابڕو بۆ خۆی بچێتە ناو مۆزەخانەکانی گەل و نەتەوە لەناوچووەکانەوە!

پاشان دادگاکان دانران، بەدرێژی و پانی وڵاتدا تۆوی ترس و تۆقاندنیان

وەشاند! قەنارە لە هەموو شوێنێك دانرا، هەزاران زانای بەسەرەوە هەڵواسرا! تەنانەت زانای وا هەبوو، لەسەر ستوونی کارەبا لە شەقامی گشتیدا ملی کرا بە پەتدا و لەسێدارە درا.. زۆرێك لە ئەدیب و زاناکان ڕۆشتن بۆ میسر و شام، ژیانی مەنفایان بەلاوە باشتر بوو، لەوەی شەبقە لەسەر بنێن..! کەشێکی سامناك باڵی کێشا بەسەر هەموو لایەکی وڵاتدا.. تەنانەت خەڵکی لە ترساندا "موصحەفەکان"یان لەبەرچاوی کارمەندانی دەوڵەت دەشاردەوە..! ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیش چالاکانە دەستیانکرد، بە بڵاوکردنەوەی خراپەکاری و ڕەوشتە نزمەکان و، دژایەتیکردن و سوکایەتیکردن بە ئاین و، گاڵتەکردنیان بە ڕاستییەکانی ئیمان ڕاگەیاند! کتێبی زەندەقە و ئیلحاد بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە..!

تابوری پێنجەمیش لە فێرکار و مامۆستایان -کە لە پەیمانگا نوێکاندا دەرچووبوون و بۆ ئەو مەبەستە پێگەیەنرابوون- هەوڵی دەدا شوێنەواری ئیمان لە دڵی نەوەی لاودا بسڕێتەوە.. جگە لە فەلسەفەی ماددی و سەفسەتەی ئینکاری و نکۆڵیکردن لە بوونی بەدیهێنەر (جَلَّ جَلَالُهُ) و پێغەمبەرایەتی و زیندووبوونەوەی دوای مردن و هەموو ڕاستییەکانی ڕۆژی دوایی، هیچ وانەیەکی تر نەبوو بۆ تەفسیرکردنی ژیان و بوون..!

هەموو شتێك قەدەغە بوو، قەدەغە.. تەنانەت بۆت نەبوو ئاهێکیش هەڵبکێشی!

## بەسەرهاتێک

"قەرە عەلی" پیاوێکی بێ مێشك و ناحاڵی بوو.. یەکێك بوو لە زەبانیەکانی ستەمکاران.. ڕۆژێکیان بەسەرخۆشی لەسەر سفرە و خوانی کەسانی نامەرد و ڕەزیل و هیچ نەدیودا، ڕشایەوە و شەرابەکەی هێنایەوە، بووە وێنەیەك لە ئابڕوچوونی شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی، وتی:

لە دوانزە ساڵی ڕابردوودا، بەدەستی خۆم ملی پازدە هەزار و دووسەد و شانزە کەسم کردووە بە پەتی سێدارەدا، وەسفی دوایین ڕووداوەکانی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ دەکات و دەڵێ: نزیکەی هەزار و پێنج سەد "بەدبەخت" پەنایان بردە ئەشکەوتەکانی چیای ئارارات، فڕۆکەکانمان بە خەستی کەوتنە بۆردومانکردنیان هەتاوەکو ئەو ناوچەیە لە "یاخیبووەکان" پاککرایەوە، هەموو ئەو لادێیانەش سوتێنران کە "بەدبەختەکان" پەنایان بۆ بردبوون، دۆڵی زیلان سەرڕێژ ببوو بە لاشەی قەڵاچۆکراوەکان...

دنیاش لە ئاست تاوانەکانیاندا بێ دەنگ بوو.. بەڵام؛

کوڕی خۆم ،سەرت بۆ سەرەوە بەرەو ئاسمان هەڵبڕە، هەتا کاتێك گوێکانت پەردەکانی دەنگی مرۆڤیان بڕی، ئیتر بێدەنگ ببە و گوێ ڕادێرە.

دەنگی شیوەن و گریانی ڕەشەباش لەنێو لوتکەی چیاکاندا بەرزبووەوە

و، شیوەن و ڕۆڕۆی بۆ بەدبەختی ئەم زەمانە خەمبارە دەکرد و، باڵندە و درەختەکانیش لەبەر ناهەمواریيەکەی لەرزیان لێ هاتبوو، نەورەسەکانیش بەدەم داخ و حەسرەتەوە کەناراوەکانیان داپۆشیبوو، ماتەم و تازیەباریش خەم و پەژارەی دەهێنایە جۆش... بارانیش بە پرمەی گریان و هەنسکە قووڵەکانی جەزبە و سۆزی دەروێشانی دەوتەوە، بروسکە و هەورەگرمەش دەمیدا لە دڵی دەریا، شەپۆلەکانیش لە کەناراوەکاندا ڕەنگی خوێنیان لێ نیشتبوو!

بەڕێزان، شیوەن و لاواندنەوە لە نێوان "نوورس" و "بارلا"، و "ئیزمیر" و "ئەستەمبووڵ"دا، هەنسك لە دوای هەنسك، هەڵبەستە خامناکەکەی دەخوێندەوە و، گەرووی منارەکانیش بەردەوام هاوار و داد و فریادیان دەکرد، گومەزەکانیش گریانەکەیان دووبارەدەکردەوە و، دەنگەکانی لە ناخیدا هەڵدەگرت و، چاوەڕێی لاوەکەیان دەکرد هەتا مەتەڵەکە هەڵبێنی و، لە شەونوێژدا نهێنییەکەی بخوێنێتەوە، پاشان ئەسپەکان لە مۆڵگەکەیاندا بەرەڵڵا بکات.. حیلەی ئەسپەکانیش دەستپێبکات!

گوێت لێیە کوڕی خۆم؟

ئەم دڵە دەست بەدەستنوێژانە، ئەمڕۆ هەموو شتێك دەبیستن.. تەنیا ئەوانە نابیستن کە گوێیان کەڕە!

***

چاوم هەڵبڕی و سەرم بەرزکردەوە، بینیم توێشووە بچووکەکەی خستووەتە سەر شانی و، بەدارە کۆنەکەی دەستیەوە بەنێو بەردەڵانەکاندا کەوتووەتە ڕێ، پیریش هاتبوو بەپیریەوە، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو چیاکە دەڕۆیشت و سەیری سەرەوەی دەکرد!

بە دەنگی بەرز بانگم کرد:گەورەم ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

بێ ئەوەی لابکاتەوە بە لای مندا، وەڵامی دامەوە و وتی:

ئەمە ڕۆژگاری بێدەنگییە کوڕی خۆم.. دەچم بۆ "بارلا"، مەنفای ڕۆحە خەمبار و تارماییە بریندارەکان! بۆ بارلا، بەڵکو لە درەختەکانیەوە فێری زمانی بێدەنگی ببم، و لە پەپوسولەیمانەکانیەوە لە گوفتاری پەلەوەران تێبگەم!

بەرێزان لە شوێنی خۆمدا ڕاچڵەکیم و ترسم لێ نیشت، هاوارمکرد و لێی پاڕامەوە:

گەورەم..! ئایا چاوەڕێی منیش ناکەیت؟ لەگەڵ خۆتدا نامبەی؟

کتوپڕ شەو پەردەی تارکیدا بەسەر چیاکاندا و، نەمزانی ئایا ئەوی داپۆشی و لە منی شاردەوە یان منی لەو شاردەوە!

"بارلا" بەرێزان، گوندێکی شاخاوی خنجیلانەیە، لە ژاوەژاوی جیهان دابڕاوە، لەوەوپێش بەردەوام لە بەرگە جوان و تازەکەیدا نادیار و نەزانراو بوو، لەنێو گوند و لادێکانی پارێزگای "ئیسپارتە"دا لە باشووری خۆرئاوای وڵاتی ئەنادۆڵ خۆی شاردووەتەوە... چیاکانی "تۆرۆس" کە بە دارستانی چڕوپڕ داپۆشراون، بوونەتە قەڵایەکی مەحکەم و لەئامێزیان گرتووە، دەڕوانێ بەسەر دەریاچەی "ئەگریدەر"ی سازگار پڕ لە ماسی بلوورینی جواندا.. بارلا ئەم بووکە ڕازاوە و خاوەن جوانییە دەراسایە، لەنێو وەرزەکانی ساڵدا چەندین بەرگ و بارودۆخی جوان و پرشنگدار لەبەردەکات.. بە سەیرکردنی چاو شیلەی شەیدابوون نۆش دەکات و تیایدا درەوشانەوەی ڕۆح دەبینێ! لە زستاندا تارای بەفرین دادەبەزێتە سەر لوتکە بەرزەکان و نەخش و نیگارە قەشەنگەکانی لەسەر سنگی دارستانی سنەوبەر و باخ و بێستانەکان دەنەخشێنێ!

کزەی هەوا ساردەکەی بەسەر ئاوی دەریاچەکەدا هەڵدەکات و، ڕوومەتە بێگەردەکەی دەگۆڕێت، بۆ بەستەڵەکی جوان، هەر کاتێك خۆری بەسەردا هەڵدێت هەزاران خۆر و تیشك تیایدا پرشنگ دەدەنەوە، ئاسمانیش دەبێتە کەرنەڤاڵێك بۆ ڕووناکیە درەوشاوەکانی شەبەنگ بە هەموو ڕەنگەکانیەوە! کاتێکیش بای بەهار دەستیکرد بە ژەنینی ئاوازی خۆشی شمشاڵەکەی، ئەسرینەکانی بەفرەکەش دەخرۆشێن و دێن بەدەم تاسە و حەزەکانیەوە و، باڵەکانیشی دەست

دەکەن بە توانەوە و دەڕژێنە ناو جۆگەلە و گۆمەکانەوە! لافاوەکانیشی لێرە و لەوێ پرژوبڵاودەبنەوە، لەئەنجامدا هەر هەموویان خۆیان هەڵدەدەن بۆ سەر سنگی دەریاچە بەرینەکە و، بەیەك دەگەن و بۆ هەتاهەتایە بەیەك شاد دەبنەوە و، جوانترین چیرۆکی خۆشەویستی پاك تۆمار دەکەن! بەفراوە نوێکەش، کە هەناسە و تاسەی گەرمی بەهاری لەگەڵ خۆیدا هێناوە، پاشماوەی ئەو پارچە بەستەڵەکانە، کە بەسەر ڕووی ئاوەکەوە دەسووڕێنە، دەتوێنێتەوە... ماسییەکانیش جارێکیتر بە پەلە لە ناخی گەرمی دەریاچەکە دێنەدەرەوە، جارێك بە کلکیان و جارێکیش بە سەریان لەگەڵ ڕووی ئاوەکەدا دەستدەکەن بە یاریکردن، تا وێنەی چەند بریسکە و تیشکێك لە پەیامەکانی نوور بکێشن. ئەوجا بەرەو قووڵایی دەریاچەکە ڕێ دەکەن.. شەپۆلە بچووکەکانیش بە ئارامی و ڕێکوپێکی دەجووڵێن و، لەگەڵ دوورگە جوان و سەرنجڕاکێشەکانی "جان" و "نیس"دا میهرەبانی دەنوێنن، درەختەکان ئاوپرژێن دەکەن و گەڵاو پەل و پۆپەکانیان دەشۆن و بە تەڕ و پاراوی دەیانهێڵنەوە، و ئامادەیان دەکەن بۆ زەماوەندی ئەو باڵندە و پەلەوەرانەی کە لە هەموو لایەکەوە بۆی دێن... باڵندەکان دەگەڕێنەوە و لە ئامێزی باخ و بێستانە پرژوبڵاوەکاندا لێرە و لەوێ هێلانەی خۆشەویستی بنیات دەنێن.. شایی و زەماوەند دەستپێدەکات.. جریوەجریو و ئاوازی خۆش دەشت و دەر پڕدەکات و درەختەکانیش لە خۆشیدا دێنە سەما! ناوازەترین سەمفۆنیای مرۆڤ بەزەویدەدا و پارچە پارچەی دەکات و مۆسیقا و، مەقامەکان ناتوانن سەرلەنوێ ڕێکیبخەنەوە!

کاتێکیش میوەی هاوین پێدەگات و هێشووەکان بە درەختە بەرزەکانەوە شۆڕدەبنەوە و، لە کانیاوی ئاوی دەمی حۆرییەکان هەڵدەمژن و، پۆلی هەنگەکانیش لەنێو بووکی هەنجیر و قۆخ و قەیسی و هەناردا بڵاودەبنەوە،

ڕێنادەن کەس بە فزولی لە هیچ دەرگا و پەنجەرەیەکەوە پەنجەی بۆ ڕابکێشێ..
سەرچاوە و کانیاوە ساردەکانیش لەنێو تاشەبەردەکاندا دێنەدەرەوە و، پێکەوە لافاوێکی خاوێن و بێگەرد پێکدەهێنن و لە قەدپاڵی چیاکانەوە دێنەخوارەوە و، هاژەکەی بە شەوق و تاسەوە ئاوازی خۆش بۆ دەریاچەی ئەگریدەر دەچڕێت..!

بەڵام تابلۆی پایز شتێکی ترە..! کاتێك ئەسپ و گاوگۆڵی جوتیارەکان بەرەو دەشت و باخ و بێستانەکان دەردەپەڕن، کە بە لێواری دەریا مەزنەکدا درێژبوونەتەوە، لەگەڵ ئاوازی دەنگی تەقەی ناڵی ئەسپەکان و سمی گاجووتەکاندا کاتێك گاسن و هەوجاڕەکان، یان عەرەبانە و گالیسکەکان ڕادەکێشن، دەنگی سروود و گۆرانی میللی بەرزدەبێتەوە. ناوبەناو هەوا بەنێو قاچی وڵاخەکاندا هەڵدەکات و گەڵای وشکی درەختەکان لەگەڵ خۆیدا دەبات و، خشە خشێکی ناسك و خۆشدروست دەکات و بەدرێژایی ئەو ڕێگا بەردەڵانەی کە بەرەو دەشتەکان لێژدەبێتەوە، دەنگدەداتەوە..

"بارلا" ئەم گوندە جوان و بووکە ڕازاوەیە، بەردەوام جوانیە دەراسا و لەڕادەبەدەرەکەی نهێنییەکی پشتگوێخراوبوو، هەتا چاوی بەدیعوززەمان ئەو جوانیەی ئاشکراکرد، لەبەرئەوە ئەو گوندە شەرەفی لەئامێزگرتنی سوارچاکی نووری بەدەستهێنا، دوای ئەوە دەنگوباسێکی تری هەبوو... باگوێبگرین لە بەسەرهاتەکە!

"شەوکەت دەمیر ئای" -بەرێزان- ژەندرمەیەکە لە سەربازەکانی دەوڵەت، قەدەری وابوو گواستنەوەی بەدیعوززەمان بۆ ناحیەی "بارلا"بخرێتە ئەستۆی..
ئەو یادەوەریە بەسەرهاتێك بوو هەرگیز لە بیری نەدەچووەوە!

## بەسەرهاتێک..

"شەوکەت دەمیر ئای" بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە شاری "ئەگریدەر" بووم، بەیانی یەکەم ڕۆژی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٢٧ی زایینی بانگیان کردم بۆ بنکەی شارەوانی.. کاتێك ڕۆشتم بینیم قایمقام و سەرۆکی ژەندرمە و ئەندامانی دەستەی شارەوانی لەوێن، کەسێکی نەناسراویش لەوێ بوو، مێزەری بەسەرەوە بوو، جبەیەکی سادەی لەبەردابوو، هەیئەتێکی سەنگین و شکۆداری هەبوو.

سەرۆکی ژەندرمە ڕووی قسەکانی کردە من و وتی:

- گوێ بگرە کوڕی خۆم..! پێویستە لەسەرت ئەم شێخەمان "بەدیعوززەمان" بۆ ببەی بۆ گوندی "بارلا".. بێگومان ئەرکەکەت زۆر گرنگە، وریابە! کاتێك لەوێ ڕادەستی پاسگەکەی دەکەیت، داوا بکە نووسراوەکانی ڕادەستکردنەکە بە فەرمی واژوو بکرێن، پاشان هەواڵی ئەوەمان لێ بگێڕەوە.

منیش ترسێکم لێ نیشت، بە تەواوەتی نەمدەزانی حەقیقەتەکەی چییە، خۆ من پێشتر چەندین جار هەڵسابووم بە پاسەوانیکردنی کەسانی داواکراو، یان بەدەستگیرکردنیان، بەڵام دیمەنی ئەم پیاوە تووشی شڵەژانی کردم..! سەرنج و نیگا بەهێزەکانی نهێنییەکیان لێ هەڵدەقولا و، ڕوخساری هێمنی گوزارشتی لە

شتێك دەكرد، من نەمدەزانی چییە، بەڵام هەستم بە قووڵایی مەزنایەتییەكەی دەكرد! خێرا هەستمكرد، تاوانێك ویژدانم بریندارەدەكات، بیرم لەوە دەكردەوە، من ئەم پیاوە بە دیلی دەدەمە پێش خۆم، دەروونم جۆشاو لە ناخمەوە هاوارم كرد:

- ئەمە چ كارەساتێك بوو ئەمڕۆ بەسەر من داهات؟ بەڵام دانم بەخۆمدا گرت و زمانی خۆمم بەست و هیچ شتێكم لەو بارەوە نەدركاند! وەڵامی سەرۆكی ژەندرمەم دایەوە و وتم:

بەڵێ گەورەم!

پاشان لەگەڵ شێخدا هاتینە دەرەوە و بێدەنگییش هەنگاوەكانمانی قورس كردبوو و، لە ڕێگادا زۆری پێ نەچوو، هەتا وەكو كەسێك داوای لێخۆش بوون بكات، وتم:

- جەنابی شێخ، تۆ وەكو باوكم وایت، وەك دەزانی ئەمە ئەركێكە خراوەتە ئەستۆم، بۆیە لێم مەگرە..! خێرا بە سەرنجێكی قووڵ وەڵامیدامەوە، كە پڕبوو لە شەفەقەت و، خۆشەویستی لێدەچۆڕا، و دڵی پڕكردم لە ئارامی!

... وەرزەكە زستان بوو، سەرماكەش سەخت بوو كاریدەكردە سەر هەموو شتێك.. ئاوی دەریاچەكەش، كە ئێمەی لە "بارلا" جیادەكردەوە لێرە و لەوێ بەستبووی، ڕێگەی سەرەكی پەڕینەوەشمان بۆ گوندەكە ئەو دەریاچەیە بوو، یەكێك لە سەوڵ لێدەری بەلەمەكە لەپێشەوە بە دارێكی درێژ سەهۆڵەكەی دەشكاند و ڕێگای بۆ بەلەمەكە دەكردەوە تا بە ئاسانی بەسەر ئاوەكەدا بجوولێت.. ئەویتریان لە دواوە سەوڵی لێدەدا و بە توندی پاڵی بە بەلەمەكەوە دەنا.. من و شێخیش لە ناوەڕاستدا دانیشتبووین.. پاش كەمێك هەندێك مێوژ و چەند پارچەیەك شیرینی بەسەرماندا دابەشكرد.. منیش بەبوردی سەرنجی

شێخم دەدا و بەبێ سوود هەوڵمدەدا نهێنییەکانی بخوێنمەوە، بێگومان ئەو لەوە قووڵتربوو ڕوخسار و سەرنجەکانی بخوێنرێنەوە! بە هێمنی لە دەریاچەکە و چیاکانی دەوروبەرمان ڕادەما، دەمێك سەیری ئاسۆی دەکرد و دەمێکیش سەیری ئاوەکە.. پاشان کەمێك سەری دادەخست وەکو بڵێی لەناو کتێبێکدا شت دەخوێنێتەوە.. منیش لە دڵی خۆمدا پرسیارم دەکرد: داخۆ ئەمە چ پیاوێك بێت؟

پاشان نەمانزانی چۆن کاتی عەسر هاتە پێش؟ لە ڕۆژێکی زستانی کورتدا بە پەلە خۆر پوکایەوە و سیس بوو.. بەردەوام بەلەمەکە بەنێو پارچە سەهۆڵەکاندا بە هەناسەبڕکێ مەلەی دەکرد، جارێك لەگەڵ ئەم پارچەیەدا بەریەك دەکەوتین جارێکیش لەگەڵ ئەوەدا.. کتوپڕ بەدیعوززەمان لە ناوەڕاستماندا ڕاوەستا و لەبەرخۆیەوە بەدەنگێکی نزم کەوتە قسەکردن، تێگەشتم کە خۆی بۆ نوێژکردن ئامادە دەکات.. خێرا بەلەمەکەمان ڕووکردە قیبلە.. بینیم لە خۆشیدا ڕوخساری گەشایەوە، پاشان هەردوو دەستی تا ئاستی شانی بەرزکردەوە. ئەوەندەی پێنەچوو دەنگێکی ترسناك و بەهێزم بیست لە زاری هاتەدەر:

اللّٰه أكبر!..

لە هەموو ژیانمدا تەکبیرەی ئەوەها بە سام و هەیبەتم نەبیستبوو! سەدای دەنگەکەی تەزوویەکی کارەبای بە هەموو جەستە و بوونمدا هێنا، مووەکانی لەشم وەکو بزماری ورد ڕاستبوونەوە! پاشان دەستیکرد بە نوێژ و سوجدە و ڕکوعی دەبرد! هەر کاتێك لە سوجدە و ڕکوعەکەی بەرز دەبووەوە، سەیری ڕوخساری نوورینیم دەکرد، وەك بڵێی لە چەندین جیهانی تردا مەلە دەکات، چووەتە ناو چەند بارودۆخێکی ترەوە.. نوێژێك بوو، هەرگیز لە

ژیانمدا نوێژکردنی وام نەدیبوو.. هەڵسان و دانیشتنەکەی لە هی ئەو شێخانە نەدەچوو، کە ئێمە پێشتر دەماننناسین.. سەیرە..! دەبێ ئەمە چ پیاوێك بێت؟

ئێمەش هەموومان هەوڵمان دەدا بەلەمەکە نەجووڵێ و لەسەر هێڵێکی ڕاست بە ئاڕاستەی قیبلە لەنگەر بگرێت.. کاتێکیش شێخ لە نوێژەکەی بووەوە، بە هێمنی لای کرد بەلاماندا و وتی: سوپاستان دەکەم براکانم، بە ڕاستی ماندوومکردن!

***

ماوەیەکی زۆر بوو سەرچاوەی لێدەرکەوتن و درەوشانەوەکانم لێ بڕابوو..! بۆیە تووشی بێتاقەتی و بێزارییەکی دژوار ببووم، ئەو کاتە لە ئەستەمبووڵ بووم، لەبەرئەوە بڕیارمدا بۆ دیتنی شوێنەواری دۆست و خۆشەویستان گەشتێك بەناو شار و لادێکانی تورکیادا بکەم، بە تایبەتی ئەو ناوچانەی بەدیعوززەمان بە بەندکراوی و دەستبەسەری، یان ڕەهەندی و نەفیکراوی تیایدا ژیابوو، بەڵکو وێنەی ئەو دەردەسەری و مەینەتییانەی کە دڵیان گوشی بوو، یان ئەو نەهامەتییانەی کە جگەریان لەت لەت و زامدار کردبوو، بهێنمەوە یادی خۆم! یەکەم جار ڕوومکردە "قەستەمۆنی" لە باکووری ئەنادۆڵ، تا دواتر لەوێوە بە ناوەڕاستی وڵاتدا بەرەو شارەکانی باشووری خۆرئاوا سەرەولێژ ببمەوە، بە "ئەنقەرە"دا تێپەڕببم، هەتا دەگەمە "ئەسکی شەهر" ئینجا "ئەمیرداغ"، پاشان "ئافیون" پاشتر "بارلا"، دوای ئەو "ئیسپارتە" و، ئینجا "دەنیزلی"، دوای ئەوە باروبنەم دەپێچمەوە بەرەو "ئورفە" لە خۆرهەڵاتی جوان، لەوێ لەنێوان "ئورفە" و "ماردین" و "سەعرەد" و "بەدلیس" و "نوورس" پاشان شاری "وان"دا، سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی خۆرهەڵات دەکەم، ڕەنگە لەوێوە بپەڕێمەوە بەرەو عێراق یان شام...

* * *

ئوتومبیلەکە بەسەر زنجیرەی چیا مەزن و سەرکەشەکانی "تۆرۆس"دا سەردەکەوت، ئەو چیایانەی کە لەنێوان ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی تورکیادا چۆکیان دادابوو و مۆڵگەیان بەستبوو! هێشتا پەڵە بەفرەکانیش -لە گەرمەی هاویندا- لێرەو لەوێ لوتکە بەرزەکانیان ڕازاندبووەوە و، وەکو بلوری بێگەرد و بریقەی ئەڵماس تیشکی خۆریان دەدایەوە، پێشەڵان و دارستانە سەوزەکانیش بۆ هەتا هەتایە دەست لەملانیان بوون، گوزارشتیان لە هیوا و وەفای ئەویندارانی بۆ ئەم نیشتیمانە ڕەسەنە دەکرد..! کانیاوە سروشتییەکانیش لە بەرزاییەکانەوە بە بەفراوی سارد فیچقەیان دەکرد، دامێنی چیا و نزمایییەکانیش بە ئاوی گڕکانی گەرم دەتەقینەوە..! لەنێوان ئەمە و ئەوەشدا، چەندین مەقامی جۆراوجۆر لە تاڤگە و ڕێژاوی شیفابەخش و سارێژکەر هەبوون. لەبارەی ئەوەی لەنێوان ئەم دووانەدا چی بۆ من دەشێ.. لە پزیشکەکەمم پرسی؟ خێرا لە وەڵامدا وتی:

- دەرمانی تۆ، -کوڕی خۆم- لە ڕێژاوی حەوت حەزەکەدایە!

وتم:

- ئایا بەم وەسف و ناونیشانە ڕێژاوێك هەیە؟

وتی:

- هەرکەس لە ڕێی خۆشەویستیدا ڕەنجبدات و زەحمەت بکێشێ دەیدۆزێتەوە!

من و هەردوو هاوڕێکەم، لە نزیك ئاوێکی سارددا، کە لەبەردێکی سەوزەوە هەڵدەقوڵا وەستاین، یەکسەر چیرۆکەکەی "خدر"م بیرکەوتەوە -سڵاوی خوای لێ بێت- خێرا وتم: دۆستەکانم ئێوە لێرەدا چاوەڕێ بن.. بە تەنیا ڕۆیشتم و بەرەو لوتکەی چیاکە سەرکەوتم، شوانێکم بینی مەڕەکانی بەنێو دار و بەردەکاندا دابوویە بەر، لێم پرسی:

- ئایا لەم ناوچانەدا شتێك هەیە ناوی "ڕێژاوی حەوت حەزەکان" بێت..؟!

زەردەخەنەیەکی بە ڕوومدا کرد و بە گۆچانەکەی ئاماژەیەکی کرد بۆ سەرەوە، پاشان پشتی لە من کرد و ڕۆیشت و لە مەڕەکانی دەخوڕی!

تووشی سەرسامی بووم، پرسیارم لە خۆم کرد: ئایا زەردەخەنەکەی بۆ خۆشحاڵبوونی و بەخێرهاتنی من بوو، یان بۆ گاڵتەپێکردنم؟ پاشان نازانم، ئایا لەڕاستیدا بە گۆچانەکەی ڕێگەی پیشاندام؛ یان بۆ مەڕەکانی بەرزکردەوە و لێیان خوڕین..؟ نازانم! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرەو بەرزاییەکان ملی ڕێم گرتەبەر، یەك لەدوای یەك هەورازەکانم بڕی، هەتا لە لوتکەکە بەرزەکە نزیك بوومەوە.. هاژەی ئاوەکە وەکو دەنگی تەپڵ بە توندی دەیدا لە دڵم، ترسم لێ نیشت! سەرم هەڵبڕی بۆ سەرەوە، تاشەبەردێکی مەزنم بینی لەسەر پەرچەمی چیاکە چوارمەشقی دادابوو و، لە حەوت ئەشکەوتەوە دەیڕوانی بەسەرمدا و بە توندی ئاوی فڕێدەدا بەسەر دار و بەردەکاندا..! نازانم بۆچی هەستم دەکرد، وەك ئەوەی کە لەم شوێنە نامۆیەدا گەمارۆ دراوم، سەیری دواوەی خۆمم کرد و ویستم هەڵبێم، لەپڕ دەنگێکم بیست هاواری لێکردم:

- هاوار بۆ تۆ ئەی برادەر..! کەسێك بە مەقامە بەرزەکاندا سەرکەوتبێت نابێ پشت هەڵبکا!

لەپڕ بینیم لە یەکێك لە ئەشکەوتەکانەوە هاتە دەرەوە و، ئاویش لە هەموو جەستەیەوە دەچۆڕا! لە دەموچاوی وردبوومەوە بینیم بەدیعوززەمانە!

بە دڵخۆشیەوە لەگەڵیدا کەوتمە قسەکردن:

- گەورەم ئەگەر کەمێك بێیتە خوار هەتا گوێم لێت بێ، چونکە هاژەی ئاوەکە دەنگەکان ون دەکات!

پێی وتم:

- مـن ناتوانـم بـۆ لای تـۆ دابـەزم، بەڵکـو تـۆ سـەربکەوە بـۆ لای مـن! ئایا پێشتر بـۆم نەنووسیت "مـن لـە مەقامـی خۆمـەوە قسـەدەکەم، نـەك لـە مەقامی ئـەو کەسـەوە کـە گوێـم لـێ دەگرێت -بـە پێچەوانـەی کەسانی تـرەوە کاتێك قسـەدەکەن خۆیـان لـە جێـی گوێگرەکانیانـدا دادەنێـن- گوێگـر لەبـەردەم کتێبەکەمـدا دەبێت بەجۆرێك ڕووەکـەی لەمنـەوە و پشـتەکەی لـەوەوە بێت، وەك ئـەوەی لـە ئاوێنەیەکدا سـەیری کتێبەکـە بـکات، ئـەو کاتـە خوێندنەوەکـەی بـەلاوە زەحمـەت دەبێـت! کەواتـە مـن دانابـەزم بـۆ مەقامـی خوێنـەر، بەڵکـو بـا ئـەو ئەندێشـەی خۆی بنێرێ بۆ لای مـن، تـا بیخەمـە سـەر چاوەکانم ، بەڵکو ئـەوەی مـن دەبینـم ئەویـش بیبینێت!"

سەرمداخست و، وتم:

- قوربان، ئەوە مەقامێکە لە سەرووی توانا و لێهاتنی منەوەیە!

وتی:

کەواتـە تـۆ تەنیـا لـە پەناوە بۆت هەیـە قسـەی ئێمە ببیستی..! ئەمـە گـەرمـەی ڕۆژگاری تاقیکردنـەوەی ئێمەیـە کـوڕی خـۆم.. ئەگـەر دڵـت بـە ئاشـکرا توانـای بینینـی ڕەشـەبای گـڕگرتـووی نییـە، مشتیشـت بەناچاریـش ناتوانـێ پشـکۆی ئازارەکانمـان بگرێـت، ئـەوا بـۆ خـۆت بچـۆرە نـاو گـۆزە شـکاوەکەتەوە و دەسـت بـە کلاوەکەتـەوە بگـرە و! بـە جێنـاوی کەسـی سـێیەم و بـە نهێنـی لـە پەنـادا لەبـارەی ئێمـەوە بخوێنـەرەوە، چونکـە تارماییەکانـی شـەو، هـەردوو بینـەر و بینـراو ڕاوەدوودەنێـن..!

پاشان وێنەکە دیارنەما، منیش هاتمە خوارەوەو و بەناو ئاو و قوڕاوەکەدا گل بوومەوە!.. بە چڵك وچەپەڵییەکەمەوە سواری ئوتومبێلەکەم بووم، ئیتر کەوتینە ڕێ.. شۆفێرەکە بە بەرزاییەکانی بارلادا سەریدەخستین و لە ئاوێنەی سەیارەکەدا وێنەکەیم بە جێناوی کەسی سێیەم دەخوێندەوە:

ئا ئەوەتا بەدیعوززەمان گەیشتە مەنفاکەی لە گوندی "بارلا".. یەکەم شەوی لە پاسگەی پۆلیسدا بردەسەر، پاشان لە ناوەڕاستی گوندەکەدا خانوویەکی بۆ دابین کرا، کە لە دوو ژوورپێك هاتبوو و دەیڕوانی بەسەر باخ و بێستانەکانی "بارلا".. درەختەکانی کە هەتا دەریاچەی "ئەگریدەر"ی شیرین درێژببوونەوە، لەبەرچاوی ئەودا جوانییە سەرنجڕاکێشەکەیان بڵاوکردبووەوە و وەك بووکی ڕووخۆش پەلوپۆیان هاویشتبوو.. سووره چنارێکی مەزن لە بەردەم خانووە خنجیلانەکەدا قنج ڕاوەستابوو -ئەو خانووەی کە بۆ مانەوەی زۆرەملێی ئەو ئامادە کرابوو- چنارەکە لق و پۆپە چڕوپڕەکانی بە ئاسماندا بڵاوکردبووەوە و شان و شکۆی بەو دەوروبەرە بەخشیبوو..!

لەبەر هەر هۆکارێك بێت بەدیعوززەمان دڵی بەو درەختەوە بەستبوو، لەبەر ئەوە کردبوویە شوێنی خەڵوەت و میحرابی موناجاتەکانی، وەك دێوانەی شەیدا سەردەکەوتە سەر دارەکە و یەك لەدوای یەك دەستی دەکردە ملی لقەکانی هەتا لەنێوان پەلوپۆکانیدا ون دەبوو، جارجار بێدەنگ دەبوو، پاشان دەستی دەکردەوە بە خوێندنەوەی زیکر و ویردەکانی، دەنگی ویردەکانی، کە ئاوێتەی خشوع و ملکەچی بوو، لەگەڵ سروودی باڵندەکاندا دەچوو بە ئاسماندا و هەڵبەستێکی جوان و دڵگیریان دەچڕی.

پاشان یەکێك لە دۆستەکانی، کە دارتاش بوو، لەناو لەپی لقە مەزنەکاندا

خۆبەخشانە سەکۆیەکی خنجیلانەی لە تەختە بۆ دروستکرد، مامۆستا زۆربەی کاتەکانی لە هەردوو وەرزی بەهار و هاویندا لەوێدا دەبردەسەر، تیایدا خواپەرستی دەکرد و بیری لە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەوی دەکردەوە.. جاری وا هەبوو شەوی شەق دەکرد و هەتا شەبەقی بەیان بەو شێوەیە دەمایەوە، تەنانەت خەڵکی "بارلا" نەیاندەزانی کەی دەخەوێت و کەی لە خەو هەڵدەستێ! چونکە هەریەکێك لەوان، لە هەر دەمێکی شەوی خامۆشدا بە نزیك درەختەکەدا تێپەڕ ببوونایە، گوێیان لە ورتەورتی زانای خواپەرست و شەوبێدار دەبوو..!.

جەستەی مامۆستا بەزۆری بیمار بوو.. کەمتر بایەخی بە خواردن و خۆراك دەدا.. چونکە لە ڕۆژێکدا تەنیا قاپێکی بچووکی خۆراك و کەمێك نانی بەس بوو. لە ماڵی یەکێك لە دراوسێکانەوە خواردنی بۆ دەهات، ئەویش هەمیشە پێداگری دەکرد لەسەر پێدانی نرخەکەی..! چونکە دروشمی ئەو لە ژیاندا کە هەرگیز دەستبەرداری نەبووە، بریتیبوو لە: هیچ شتێك بێ بەرامبەر لە کەس وەرنەگرێت! ئینجا لەبەرئەوەی خەسڵەتی زوهد و دەست پێوەگرتنی لەسەر خۆی پێویست کردبوو، خوای گەورەش بە بەرەکەت خستنە ناو ڕزق و ڕۆزییەکەیەوە ڕێزی لێنابوو، هیچ شتێکی لە کەس وەرنەدەگرت و خۆی بە موحتاجی کەس نەدەزانی!

سیخوڕەکانی دەسەڵات لە هەموو لایەکەوە بۆسەیان بۆ دانابوو، چاودێری جموجووڵ و هەڵسوکەوتەکانییان دەکرد.. لەبەرئەوەی خەڵکەکەش خۆیان بەدوور دەگرت لەوەی لەگەڵیدا بدوێن یان لێی نزیك بکەونەوە، زۆربەی کاتەکانی لەناو ماڵ یان لەنێو تولە ڕێگاکانی چیای "چام" و درەختە چڕوپڕەکانیدا دەبردە سەر، بەتایبەتی لە هەردوو وەرزی بەهار و هاویندا.. لەوێ لەسەر لوتکەی چیاکە

دەچووە خەڵوەتەوە و، لەنێو درەختەکاندا خەریکی تێڕامان و خواپەرستی دەبوو..

هەتا ئەو ڕۆژە هاتە پێش، ڕۆژی دەرکەوتنی نوور! وەکو نەریتی هەمیشەیی خۆی لە ڕۆژێکی هاویندا لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە و بەرەو چیاکە کەوتە ڕێ.. کەشوهەوا خاوێن و ئاسمانیش ساماڵ بوو، خۆریش تیشکی زێرینی پەخش دەکرد، بەڵام هەر کە گەیشتە سەر لوتکەی چیاکە، هەوری ڕەش بەری ئاسمانی گرت و، هەڕەشەی نزیکبوونەوەی گەردەلوول و زریانێکی دەکرد..! دوای چەند ساتێکی کەم ئاسمان دەستیکرد بە داباریـن..! نوورسی بەتەنیا لەسەر لوتکەی چیاکە بوو و هیچ پەنا و لانەیەکی نەبوو لە لێزمەی بارانەکە بیپارێزێت، درەختەکان بەس نەبوون بۆئەوەی لەم گەردەلوولی بارانە بیپارێزن! چونکە ئەوەندە بەهێزبوو لقوپۆپی درەختەکانیش دەفڕین بە هەوادا..! ئەوەندەی نەبرد جلوبەرگەکەی بووە جۆگەلەی ئاوە ڕاماڵەرەکە و لە تەوقی سەریەوە هەتا پاژنەی پێی، ئاو سەری هەڵکرد! قاچەکانیشی لە قوڕ و چڵپاودا نوقم بوون، دۆخێکی نالەباری بەسەردا هات، لەژێر لقوپۆپی دارەکاندا لەسەر ئەو حاڵەتە مایەوە، هەتا باوبۆرانەکە کەمێك خۆشیکردەوە، ئەوجا بەرەو خوار بووەوە و بەرەو گوند گەڕایەوە، پاش کەمێك ڕۆیشتن پێڵاوەکەشی دڕا، کاتێ بەناو گوندەکەدا تێدەپەڕی پێڵاوە دڕاوەکانی گرتبوو بەدەستیەوە و، گۆرەویە سپییەکانیشی کە لە خوری دروستکرابوون لەتاو قوڕ و چڵپاو ڕەنگیان گۆڕابوو بۆ ڕەنگێك لەنێوان ڕەش و سووردا!

لەوێ.. لە نزیك کانیاوەکە هەندێك لە خەڵکی "بارلا" بە کۆمەڵ وەستابوون و لەنێو خۆیاندا گفتوگۆیان دەکرد، ئەم دیمەنە هەست بزوێن و کاریگەرەیان بینی، دیمەنی زانای خاوەن شکۆی دوورخراوە لە نیشتیمانی خۆی و تاك

و تەنیا لە غەریبی و دابڕاو لە هەمووان، بە تەنیا ملی ڕێی گرتووە و پێڵاوە دڕاوەکەی گرتووە بەدەستیەوە و، بە جلوبەرگە شڕەکەیەوە بەناو قوڕ و لیتاودا دەڕوات! بێدەنگییەکی سامناك باڵی کێشا بەسەریاندا.. دڵەکان لەنێوان دوو هەستی جیاوازدا گیریان خواردبوو، هەستی بە هاناوەچوون و درێژکردنی دەستی یارمەتی، لەگەڵ هەستی ترس لە سیخوڕەکانی دەسەڵات کە چاودێریی هەموو جموجووڵێکیان دەکرد!.. لەکۆتاییدا کەسێك بەناوی "سولەیمان" لەناویاندا دەرپەڕی.. خێرا پێڵاوەکەی لە دەست وەرگرت و لەناو حەوزەکەدا شۆردی. پاشان بەوپەڕی ئەدەبەوە هەتاوەکو ماڵەوە یاوەریی کرد،. ئەو پیاوەش "سولەیمان کاروانچی" بووە، یەکەمین دۆست و هاوڕێی نوورسی لە مەنفاکەیدا و، یەکەم قوتابی لە قۆناغی بڵاوکردنەوەی "پەیامەکانی نوور"دا، لەو ساتە بەدواوە کاروانچی بوو بە خزمەتکارێکی دڵسۆزی مامۆستا. ئیتر ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ترس لە نزیکبوونەوەی مامۆستا نەما، هەتا کۆمەڵێك لاو لە دەوری کۆبوونەوە، ئەو کۆمەڵە لاوە چاونەترسە دەچوونە خزمەتی و لە چۆڵەوانییەکانی شەو و ڕۆژدا. "پەیامەکانی نوور"یان لێ دەبیست و، گەردیلە بە گەردیلە، تیشك لە دوای تیشك دەیان نووسینەوە.. بەم جۆرە جارێکی تر خۆر لە "بارلا"وە بەسەر تورکیادا هەڵهات!

پیتەکانی زمانی عەرەبی قەدەغەکران و بە فەرمی ڕێی بەکارهێنانیان لێ گیرا، پیتە لاتینییەکان خرانە جێگەیان، پاشان هەموو چاپخانە عەرەبییەکان داخران، لەبەرگرتنەوە و نووسینەوەی دەستیی لە پەنهاندا تاکە ڕێگە بوو بۆ بڵاوکردنەوەی نووسراو و دانراوەکانی پیاوێکی دەستبەسەر، کە پێداگری لەسەر بەکارهێنانی پیتە عەرەبییەکان دەکرد! نزیکەی بیست ساڵ "پەیامەکانی نوور" بەم ڕێگایە بڵاوکرانەوە!

## بەسەرهاتێکی تر..

"عەبدوڵڵا چاووش" پیاوێکی نەخوێندەوار بوو، یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی قافڵەی یەکەمی خزمەتگوزارانی بانگەوازی نوورخوازی. ڕۆژێکیان باسی لە یادەوەریی خەمەکانی خۆی دەکرد و دەیوت:

"ڕۆژێکیان هاتم بۆ لای مامۆستا، بینیم "حافظ علی" و چەند قوتابییەکی تری لەلایە، مامۆستا دەستیکرد بە دابەشکردنی چەند جوزئێکی قورئانی پیرۆز بەسەریاندا تا بینووسنەوە، هەروەها شێوازی نووسینەوەکەشی فێرکردن، جا لەبەرئەوەی من خوێندنەوە و نووسینەوەم نەدەزانی، بۆیە هەستام چام بۆ ئامادەکردن..! بەڵکو منیش لە ئەجر و پاداشتدا بەشدارییان بکەم: بەڵام هەر کە چایەکەم هێنا خێرا مامۆستا هەڵستا و لێی وەرگرتم و خۆی دەستیکرد بە دابەشکردنی، ئەمەش بۆ خۆی مایەی تەریقی بوو بۆ من! ئاخر چۆن دەبوایە مامۆستا چا دابنێ بۆ قوتابییەکانی؟ پاشان ئەی من کارم چییە؟ وەختێکیش چایەکەی بۆ دادەنان، بە قوتابییەکانی دەوت:

"خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز و نووسینەوەی لەم بارودۆخەدا، کارێکە لای خوای گەورە وەرگیراوە، ئەو دەتانبینێ و، مەلائیکەتە بەڕێزەکانیش وێنەتان دەگرن، منیش لەبەرئەوەی کە خزمەتگوزاری قورئانم پێویستە خزمەتی ئێوە

بکەم..!“ مامۆستا چایەکەی دابەشدەکرد بەسەر قوتابییەکانیدا و ئەوانیش بە گرِوتینێکی بێوێنەوە سەرقاڵی نووسینەوە دەبوون.

دوای چەند ساتێکی کەم مامۆستا کارێکی بۆ منیش دۆزییەوە و لەوگێژاوە دەریهێنام! وەکو بڵێی زانی من لە چ شلۆقییەکدا دەژیم... داوای لێکردم ئەو نوسخانەی قورئان و ئەو "پەیامانەش" کە نووسرابوونەوە بە نهێنی بگەیەنمە گوند و لادێکانی دەوروبەر.. ئەمەش بۆ خۆی یەکەم هەنگاوی چوونە ناو سەیرترین تۆڕەوە بوو لە تۆڕەکانی دابەشکردن لە مێژوودا..!

دوای خۆرئاوابوون لە گوندی "ئیسلام" دەردەچووم و لەجانتاکەمدا ئەو پەیامانەم هەڵدەگرت کە"حافظ علی" نووسیبوونیەوە، بەدرێژایی شەو بە پێ بەناو چیا و دۆڵەکاندا دەڕۆیشتم و لەگەڵ بەرەبەیاندا دەگەیشتمە "بارلا"، دەمبینی مامۆستا چاوەڕێم دەکات، بەگەرمی پێشوازی لێدەکردم و پێکەوە نوێژی بەیانیمان دەکرد.. پاشان دەخەوتم.. بەم شێوەیە بۆ ڕۆژی دواتر ڕەشنووسەکانم لە مامۆستا وەردەگرت و بەشەو لە "بارلا" دەردەچووم و بەرەو گوندی "ئیسلام" دەکەوتمەوە ڕێ هەتا ڕەشنووسەکانم دەگەیاندە دەستی "حافظ علی".

ئەو دووڕیانە بەلای منەوە گەشت و سەیرانێکی سەیر بوون، مەترسییەکانی ڕێگاش خۆشییەك بوو چێژم لێ دەبینین..! گوێم لەوە نەبوو لەسەر چی قاچ دادەنێم.. لەسەر بەرد، یان لەسەر دڕك و دار. جارێکیان دەچوومە سەر تەپۆڵکەکان و سێبەرەکەم لە شەوانی -مانگە شەودا- بە وێنەی درەختی قەد باڵەکان درێژ دەبووەوە، جارێکیش لەنێو دارستان و پێشەڵانەکاندا ون دەبووم و چاودێر نەیدەزانی لەکوێوە چوومەتە ناوەوە و لەکوێوە هاتوومەتە دەرەوە..!

پاشان خۆم هەڵدەدایە ناوجەرگەی ڕێگاکان و قووڵایی دۆڵ و دەشتەکانم شەق دەکرد و نەمدەزانی چۆن خۆمم لەوسەری دۆڵەکەدا دەبینیەوە.. وەکو ئەسپی کێوی کە لە دەستگیرکردن و ماڵیکردن هەڵبێت ڕام دەکرد! سەگە دڕندەکانیش ناوبەناو دەهاتنە سەر ڕێگاکەم و منیش بە هیچ شێوەیەك گوێم نەدەدانێ.. بە شێوەیەك دەوەڕین زیاتر لە نەڕەی شێر دەچوو..! سەیر لەوەدا بوو من زۆر دڵم بەوە دەکرایەوە! و هەستم بە چێژێك دەکرد بەڵام سەرچاوەکەیم نەدەزانی، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت زیاتر هەستم دەکرد پارێزگاریم لێ دەکەن، تاکو هەست بەوە بکەم هێرشم دەکەنە سەر! لەڕاستیشدا هەر وابوو پاش چەند ساتێك دەمبینی شان بەشانی من بێ دەنگ دەڕۆن و وەك بڵێی دۆستێکی خۆشەویست بەڕێ بکەن، پاسەوانییان لێدەکردم هەتا دۆڵەکەی ئەوانم بەجێدەهێشت و لەناو ڕێگاکانیتردا لەبەرچاویان ون دەبووم..!

❊❊❊

ئەڵقەی قوتابییەکان دەستیان بە فراوانبوون کرد، پاشان پەیامەکان دەگەیشتنە گوند و ناحیە نزیکەکانی دەوروبەری "بارلا" و، دەستە دڵسۆزەکانیش بە نهێنی دەیانگەیاندنە شارە دوورەکان و لەوێ دڵانی نوێ و چەندەها ڕۆحی تینوویان بۆ هیدایەت و نوور بەدەستدەهێنا. دەیان بەڵکو سەدان بەڵکو هەزاران کەس لە قوتابییانی نوور بە پیاو و ژنەوە دەستیانکرد بە نووسینەوەی پەیامەکانی نوور و خۆیان بۆ ئەو کارە یەکلاکردەوە، چەندین کاتژمێر بە شەو و بە ڕۆژ خەریکی نووسینەوە بوون، تەنانەت هی وایان هەبوو، لەبەر ئەو کارە حەوتساڵی تەواو بەندی ماڵەکەی خۆی بوو، هەرگیز نەدەچووە دەرەوە و سەرقاڵی ئەو ئەرکە گرنگ و ناوازەیە بوو! دوور لە ئاشووبی زەمانە خەڵکەکەی گۆشەگیری دەکرد!

تەنیا لە گوندی "ساو"ی نزیك شاری "ئیسپارتە" هەزار نووسەری پەیامەکان هەبوون!

ئافرەتانیش ڕۆڵێکی سەرنجڕاکێشیان دەبینی... چونکە ئەوانیش چالاکانە لەو هەڵمەتەدا بەشدارییان دەکرد... ئەو کچانەی نووسینیان دەزانی هەڵدەستان بە نووسینەوە، ئەوانەشیان کە نووسینیان نەدەزانی لاسایی شکڵ و شێوەی پیتەکانیان دەکردەوە و، لەسەر شێوازی نەخش و وێنەکێشان لەسەر قوماش، پیتەکان و وشەکانیان لەسەر کاغەزەکە نەخش دەکرد، بەو شێوازە نووسینەوەکەیان ئەنجامدەدا!

گوندی "بارلا" باوەشی کردەوە بۆ خزمەتی نوور.. ژن و پیاوی، پیر و لاوی.. هەر هەموویان سەرگەرمی گەیاندنی هێڵی نوور بوون بە هەموو شوێنێك، دەستخەتەکان و نووسینەوە دەستییەکان و وشە ڕوون و پرشنگدارەکان و پەڕە بلووریەکانیان، بە نهێنی لێرەوە بۆ ئەوێ دەگوازرانەوە، بەڵام بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر.. تەنانەت بووە دەنگوباسی هەموو ماڵێك! ئەوەش نیشانەی ئەوەبوو خوا فەرمانی بە شتێك دابوو! گوندێك هەر هەمووی بووە قوتابخانەیەك بۆ بەرزڕاگرتنی پەیامی خوا و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیمان.. نوور پرشنگی هاویشت بۆ گوندەکانی دەوروبەر، پاشان بۆ هەموو کونج و شارێکی تورکیا..!

مامۆستا بە بەسیرەتی نوورینی خۆی دەیبینی ئەو قوتابخانەیەی کە ئومێدی لێدەکرێ بۆ ئەم سەردەمە لەڕاستیدا دامەزراوە، کەواتە دەبێ بناغەیەك بۆ پەروەردەکردنی نەوەکان دابنرێ.. دەبێ حیکمەتێك هەبێ دەست بەسەر کارەکەدا بگرێت و لە هەڵە و لادان بیپارێزێت.. بۆی دەرکەوت کە مەترسیدارترین ڕێگر کە ئەگەری هەیە ڕێ لە هەڵقوڵانی نوور و ڕژانی بەسەر جیهاندا بگرێت

بریتییە لە دەروونی خۆی..! بریتییە لە "أنا"، دەبێ چۆن مەشرەبەکە پاڵفتە و خاوێن بکرێتەوە لە خودێك لەکاتێکدا ئەو خودە خۆی کانیاوی بەخوڕی ئەو مەشرەبە بێت؟ یان چۆن ڕۆح بۆنی قوڕی ترشاو "الحمأ المسنون"ی لێ دابڕنرێ؟ ئاە، ئەی گۆزەکەم کاتی ئەوە نەهاتووە، ئاوێکت لێ بچۆڕێ بۆنی زێر و "علق"ی تێکەڵ نەبووبێت؟

پێی وتم: مانەوەی چراکە بە درەوشاوەیی -لەگەڵ بوونی گەردەلوولەکانی ئەم ڕۆژگارە سەختە- دەستگرتن بە مەقامی لەتکردنی سنگ لە دڵی نبووەتی لەبەردەمدایە! ئیتر کێ بەرگەی ئەم ئازارە دەگرێت؟ کوڕی خۆم، ئەوە چیرۆکی تەحەدی و سنگ دەربەڕاندنە. دەسا سنگت دەربخە بۆ چەقۆکان ئەگەر یەکێکیت لە ڕاستگۆیان، ئەگینا خواحافیزی لە حەز و ئاواتە درۆینەکانت بکە!

## مەقامی بناغەڕێژی

ڕۆژێکیان لە گەرمەی سەرقاڵبوون بە نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی پەیامەکان، مامۆستا لە ناوەندی قوتابییەکانیدا هەستایە سەرپێ و بە دڵگەرمی و پەرۆشی کەسێك، کە بۆ ئاینده بڕوانێ حیکمەت و وتە بەجێکەی پێشکەش کرد.. وتەکان بە جۆرێك لە دەمی دەردەچوون دڵی بیسەرانی ئاوددا و بە نوور ڕووناکی دەکردنەوە..

"برا قەدر بەرز و دڵسۆزەکانم!

بێگومان مامۆستاکەتان پارێزراو نییە لە هەڵە، بەڵکو هەڵە لەوەدایە وابزانرێ ئەو هەڵە ناکات! بەڵام دەبێ بزانین بوونی سێوێکی گەنیو لە باخێکدا زیان بە باخەکە ناگەیێنێت، هەروەها بوونی دراوێکی ساختە لە گەنجینەیەکدا لە نرخی گەنجینەکە کەم ناکاتەوە. لەکاتێکدا خراپە بە یەك دانە هەژمار دەکرێت کەچی چاکە بە دەچەندان، دەی هەربۆیە ویژدان ئەوە دەخوازێ لەبەر بوونی خراپەیەك نابێ دڵ بەرامبەر چاکەکان گەرد بگرێت..!

بزانن ئەی براکانم و، ئەی هاوڕێکانم لە خوێندنی وانەدا! من زۆر دڵخۆش دەبم، ئەگەر هەر هەڵەیەکتان لە مندا بینی ڕاشکاوانە ئاگادارمبکەنەوە لێی.. بەڵکو دەڵێم، دەك خوا لێتان ڕازی بێت، ئەگەر بە توندی و زبری هەڵەکەم پێ بڵێن!

چونکە لە پاڵ حەقدا سەیری هیچ شتێکیتر ناکرێت.. بە دڵنیاییەوە من ئامادەم بۆ وەرگرتنی هەر حەقیقەتێك کە، حەق پێویستی بکات لەسەرم، ئەو حەقیقەتەی من پێی نازانم و کەسێك پێم دەڵێ وەری دەگرم و دەیخەمە سەرچاو و سەرسەرم، هەرگیز ڕەتی ناکەمەوە هەرچەندە پێچەوانەی خۆپەرستیی دەروونی بەدخوازیشم بێت!

بزانن ئەم ئەرکە ئیمانیە بەتایبەت لەمکاتەدا زۆر گەورە و گرنگە! ئێوە نابێ ئەم کۆڵە قورسە بخەنە سەرشانی کەسێکی لاوازی وەك من، کە بیری پەرتەوازە بووە! بەڵکو لەسەرتان پێویستە بەپێی توانا یارمەتی بدەن..!“

بێدەنگی و خامۆشیی شەو فەرمانیدا جرجانەوەر و مێرووەکانی دۆڵەکە بە دەنگ و ئاوازە تایبەتەکەیان قسەکانی مامۆستا بڕازێننەوە.. ئەڵقەی وانەکە جمەی دەهات لە قوتابییان، نووری وتەکانی دەکردە چەترێك و دەیدا بەسەر خۆیدا، مامۆستاش لە ناوەڕاستیدا ئارەق لەنێو چەوانیدا دەهاتەخوارەوە، دوای چەند ساتێکی کەم هەڵسایە سەرپێ و ڕاوەستا، پاشان پشتەملی سێبەرە لاوازەکەی خۆی گرت، وەك بڵێی زۆران لەگەڵ خۆیدا دەگرێت، یەکسەر دەموچاوی بە نوورێکی سەیر ڕووناك بووەوە، تەنانەت وەك بڵێی لە ناوەندی هەمووانداا بوو بە چرایەکی درەوشاوە! کتوپڕ شتێکی وەك ڕۆح بە دزە لە جەستەیدا هاتە دەرەوە و بەرەو سەرەوە هەڵکشا.. ئەوە وێنەکەی بوو لە سێبەرێکی ڕووندا دەرکەوت و بە جوانییەکی بلووری تیشکی دایەوە، دوای ئەوە جەستەی بیماریشی کەم کەم پوکایەوە، هەتا وەك درەختێکی وشکی لێهات! ئێمەش شوێنی دیمەنی ڕۆحەکە کەوتین کاتێك بەرەو سەرەوە سەردەکەوت..

تا دەهات چراکە بەرەو بەرزی دەچوو.. هەتا بەرزتریش ببوایەتەوە جوانی

و درەوشانەوەکەی زیاتر دەبوو! هەتا کاتێك گەیشتە لوتکەی چیاکانی دەوروبەر دەتوت ئەستێرەی سورەییایە، پاشان لە ئاسمانی شەوی تاریکدا بانگی کرد:

''ئەی سەعید..! "صەعید" بە، واتە خاك بە، وەکو خاك خۆنەویست بە، هەتا ڕوونی پەیامەکانی نوور لێڵ نەکەیت..!''

سەدای دەنگەکە هاوشێوەی بروسکە ڕۆیشت و بە توندی لەنێو تولەڕێ و بەردەڵانەکاندا دەنگی دایەوە، سورەییاش تیشك و بریسکانەوەکانی بڵاودەکردەوە، ئاسمانی هەموو چەم و دۆڵێك بووە، نوورێکی گڕگرتووی گەشاوەی دەرخەر! پاشان... پاشان شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی ترسیان لێ نیشت!

## فتوحاتی بەندیخانەکان و تەجەللیاتی مەنفاکان...

.. بایەقوشەکان لە هەموو شوێنێك وەلوەلەیان بوو، شەمشەمەکوێرەکانیش گریان و شین و زاریان بوو.. شەوکوێری بینایی هەمووانی کوژاندبووەوە، لە تیشکی خۆر هەڵدەهاتن و خۆیان دەکێشا بە دار و دیواردا..

جارێکی تر، پیلان دادەڕێژرێتەوە.. شەمشەمەکوێرە تێکشکێنەرەکان هێرش دەکەنە سەر چرای سەر کوچە و کۆلانەکان هەتا بە دەنووکە بڕندە و تیژەکانیان بیانشکێنن! بەلام قەدەر پێش بلێسەکە دەکەوت! بۆیە هەر ئەوە دەبوو کە خوا دەیویست و بڕیاری لەسەر دەدا.. ناهەق خوازانیش نائومێد بوون..! چونکە مەنفای "بارلا" بە پێی قەدەرێکی حەکیمانە هاتبوو..! ئەو گوندە دابڕاوەی نێو چیاکان و ئاوارەی دوور لە جیهان، جگە لە ئاوازی خوێندن و دەنگی گیانلەبەر و پەلەوەران هیچی تری تیادا نەدەبیستra.. کەمترین دەنگ و گرمە و جوڵەی سەیارە و ماتۆڕ نەبوو! یان بارەی مەڕ و بۆڕەی مانگا و وەڕەی سەگەکان بوو، یان دەنگ و ئاوازی شوانێك بوو، لێرە و لەوێ لەناو دارستان و تولە ڕێگاکاندا دەڕۆیشت..! ئیتر دەبێ چۆن لێرەوە نوور و ڕووناکی هەڵبێت؟ یان دەبێ وتەکان چۆن کلپە بخەنە دڵی ئەو جەماوەرە سەرگەردانەی کە لە شارە قەرەباڵغەکاندا کۆبووەتەوە و لە ژاوەژاوی مەدەنیەتدا نوقم بوون و، بەدوای دەستکەوت و بەکاربردندا ڕادەکەن و، پێناچێ گوێ لە هاواری فیترەت بگرن،

مەگەر بە دەگمەن نەبێ..! لە ڕۆژگارێکی گیرۆدەدا کەم ڕێدەکەوێ مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە، کە مرۆڤە!

بەڵام بانگەوازی خوا، بانگەوازی خوایە! ئەوەیە کێشەکە بە تەواوی و بە کورتی، کوڕی خۆم تۆیش بۆ خۆت بیری لێبکەرەوە..!

بێگومان بڕیاری پەروەردگار و خاوەنی بانگەوازەکە وابوو، ئەو شوێنەی نەفی کرابوو بۆی، ئەو شوێنەی کە دێوەزمەکانی تاریکی هەڵیانبژاردبوو بۆ خنکاندنی -پرشنگی نوور- هەر هەمان ئەو شوێنە بێت کە تیایدا لەدایک دەبووەوە و بەسەر جیهاندا هەڵدەهات! ئەوەبوو خامە و پێی دانیشتوانەکەی هەموو بەجارێ کەوتنە بزوان بۆ بڵاوکردنەوەی وتەکان بە هەموو لایەکدا.. بۆیە پاش ماوەیەکی کەم پسپۆڕانی شەڕەنگێزی جاڕی مایەپووچیی مەنفاکەیاندا! گوندی دوورەدەست و کەنارخراویش بووە پایتەخت و ئاوەدانی! جا ئیتر کاتی ئەوەیە بەرەیەکی نوێی جەنگ بکرێتەوە و، بانگەوازیش بچێتە قۆناغێکی ترەوە..!

***

بەڵام تاقیکردنەوەی نوێ ئەوەبوو تاماوەیەك نوور بەندبکرێت... کەچی بەندیخانە بووە دەروازەیەکی نوێ بۆ درەوشانەوەی تیشکەکان، تارماییەکانیش سەرسام بوون لە کاری ئەم پیاوە و بانگەوازەکەی، چونکە لەبەردەم دادوەرەکاندا دەبووە پشکۆ یان تیری گڕگرتوو، هەریەکەیان هەوڵیدەدا دۆسیەی ئەم زانایە بخاتە ئەستۆی ئەوی تریانەوە سا بەڵکو بتوانێ بڕیاری کوشتن یاخود لەسێدارەدانی کەسێکی ئاوها لەکۆڵ خۆی بکاتەوە. بەوە خوای گەورە لە هەموو شوێنێك چەندین قوتابخانەی بۆ نوور ئامادەکرد، لە مەنفایەکەوە بۆ

مەنفایەکیتر، لە بەندیخانەیەکەوە بۆ بەندیخانەیەکیتر، هەتا لە چەندین شوێنی جیاجیاوە نوور هەڵهات..! ئەو نوورەی لە "بارلا"وە هەڵهاتبوو، وا ئێستا لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"ەوە هەڵدێت، پاشان لە مەنفای "قەستەمۆنی"یەوە و دواتر لە بەندیخانەی "دەنیزلی"یەوە، هەتا مەنفای "ئەمیرداغ" و پاشان بەندیخانەی "ئافیوون" و.. جارێکی تر لە "ئەمیرداغ"، بەم جۆرە هەتا خۆر گەیشتە جەرگەی ئاسمان و گەرمەی نیوەڕۆ..!

بەندیخانەکان بوونە قوتابخانەی یوسفی بۆ پەروەردە و پێگەیاندنی قوتابییانی نوور و، شوێنی پاڵفتەبوونی پاکترین و دڵسۆزترین پیاو و خەڵوەتگەیەکی خوایی بۆ دانانی پەیامەکان. هەریەك لە مەنفاکانیش بوونە مەنزڵی دەرکەوتنی حیکمەتی نوور و چنینەوەی مرواریە مەرجانی و نهێنیە شاراوەکانی. ئیتر ئەمە چ گەمژەییەك بوو، دوژمنانی پەلکێش کرد و هانیدان کینەیان برێژن بەسەر پیاوێکدا کە لە ئاسمانەوە پارێزگاری لێ دەکرا...؟!

## فتوحاتی یوسفی له بەندیخانەی "ئەسكی شەهر"

سەردەمی "بارلا" ڕۆژگارێك بوو بۆ دەردەسەریە جوانەكان و بەشێك بوو لە ئازارە خۆش و بەتامەكان..! تارماییەكانی تاریكیش لە مەلاسدا بوون بۆ هەر جوولەیەك كە ئیمان تازەبكاتەوە، یان خزمەتی قورئان بكات.. بەلام خوای گەورە لە شوێنێكەوە بۆی دەهات ئەوان بە هیچ شێوەیەك حیسابیان بۆ نەكردبوو..! هەر كە ستەمكاران هەستیان بەوە دەكرد پەیامەكانی نوور بە شێوەیەكی بەرفراوان بلاودەبنەوە و، ئیمانیش لە دلی خەلكیدا ڕەگ و ڕیشە دادەكوتێ، خێرا بۆ دەرچوون لەو قەیران و شلەژانەی تێی كەوتبوون و پینەكردنی ئەو شكستە مەزنەی بەسەریاندا هاتبوو بیریان لە ڕێگەچارەیەكیتر كردەوە... ئەوەبوو بە مەبەستی دەستگیركردنی مامۆستا و قوتابییانی نوور كەوتنە پیلانگێڕان. سەرەتا تۆمەتی ئەوەیان بۆ هەلبەستن كە گوایە كۆمەلەیەكی نهێنییان پێكهێناوە و هەول بۆ ڕووخاندنی پایەكانی دەولەت دەدەن. دەستیشیان نەگێڕایەوە لەوەی.. لیستێك تۆمەتی پێشوەخت و ئامادەكراو بدەنە پالیان! مامۆستا لەگەل سەد و بیست لە قوتابییەكانیدا دەستگیركران! پاشان لە ڕۆژی ٢٥ی مارسی سالی ١٩٣٥ی زایینیدا بەقۆلبەستكراوی بەرەو شاری "ئەسكی شەهر" درانەبەر.. هەر هەموویان توندی بەندیخانەی تاكەكەسی كران و، جۆرەها سزا و ئازاریان دەرخوارد درا! پاشان ڕۆژی دادگایكردن هاتە پێش!

دوای ئەوەی نوورسی لەڕێی وتارێکی بەهێزەوە بەرگری لە خۆی ، بانگەوازەکەی و قوتابییەکانی کرد، وتارێك کە هەموو کون و قوژبنێکی دادگای هێنایە لەرزە و، دادوەرانی تووشی پەشۆکاویی کرد، سەرۆکی دانیشتنەکە هەستی بە شلۆقی دۆخەکە کرد. چونکە لە بەڵگەنامەی تۆمەتەکاندا شتێك نەما ئەو پاڵی پێوەبدات و پشتی پێ ببەستێ..! بەڵام دەبێ تارماییەکانی تاریکی تۆمەتێك بدۆزنەوە و نووری پێ تاوانباربکەن! ئەگەرچی لە ماڵی قوتابییاندا دەست بەسەر چەندین بەرگی پەیامەکاندا گیرا و پشکنینێکی ورد لە ناوەڕۆکەکانیاندا ئەنجامدرا، کەچی دادگا تاکە بڕگەیەکی نەدۆزیەوە دەستبدات بۆ تۆمەتبارکردنیان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دادوەر بڕیاری پازدە مانگ بەندکردنی بۆ مامۆستا و شەش مانگیش بۆ پازدە لە قوتابیتانی دەرکرد، ئەوانی تریش ئازادکران.

پێی وتم:

کوڕی خۆم، بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" بۆ قوتابییە بەوەفاکانم یەکەمین قوتابخانەی یوسفی بوو، تەنگانە و تاقیکردنەوەکانی زیندان پیاوی چەشنی چیا دامەزراوەکانی لێ دروستکردن! سەبارەت بە منیش بەندیخانە وەرزێکی بەپیت بوو، بۆ چنینەوەی بەرهەمەکان... چونکە تێیدا فتوحاتی وامان دەستکەوت، بۆمان بوونە چەندین "تیشك" و "بریسکە" و چەخماخەیان بە پەیامەکانی نووردا و، ڕۆحمانیان تێرکرد و کڵپەیان لە هەست و نەستمان بەردا، هەروەك چۆن چەندین بەرگریی وامان نواند کە وەك گرمەی هەور داباریین بەسەر ستەمکاراندا، پاشان بوونە چەندین شورای مەزن بۆ قوتابیانی نوور کە بە فەرمانی خوا تاکو ئەمڕۆش ئاڵاکەیان بەرزدەکاتەوە!

ئێستاش لە منەوە -کوڕی خۆم- بەسەرهاتێکی خامناك ببیستە، لەو بەسەرهاتە خامناکانەی کە خۆم لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" بینیم، ئەو بەسەرهاتە چەندین پەند و ڕووناکی لێ دەتکێ..!

## بەسەرهاتێک

ڕۆژێکیان لەبەردەم پەنجەرەی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"دا دانیشتبووم، کە دەیڕوانی بەسەر قوتابخانەی ئامادەیی کچاندا.. قوتابییە لاو و تازە پێگەیشتووەکان لەناو گۆڕەپانی قوتابخانەکەدا بە خۆشی و شادیەوە یاری و سەمایان دەکردو، بە بۆنەی "جەژنی کۆماری"یەوە سروودی نیشتیمانییان دەوت، کتوپڕ شاشەیەکی مەزنی پڕ بە گۆڕەپانی قوتابخانەکە لەبەرچاومدا دەرکەوت و، حاڵی پاش پەنجا ساڵی ئەو قوتابییانەم هاتە پێشچاو، لەپڕ بینیم جەستەی نەونەمامیان بە خێرایی گەورە دەبوو، پاشان بە ساڵا دەچوو و پیر دەبوو..! و بینیم نزیکەی پەنجا لە شەستی ئەو قوتابییانە لەناو گۆڕەکانیاندا بوونەتەوە بە خاك، ئەوەتا گۆڕەکانیان شوێنەکەی پڕکردووە! پاشان بینیم لەناو گۆڕکانیاندا سزا دەدرێن..! هەروەها بینیم دە دانەکەی تریشیان بوون بە چەند پیرەژنێکی ناشیرینی تەمەن حەفتا هەشتا ساڵە و جوانییەکەیان نەماوە و دەموچاویان چرچ و لۆچ بووە و، بەدەست دەوروبەرەکەیانەوە ئازار دەچێژن و بەقێز و بێز و سوکیەوە سەیریان دەکرێت! لەبەرئەوەی لە ڕۆژانی لاوییاندا پاکی خۆیان نەپاراستبوو.. بەڵێ بەدڵنیایی و بێ هیچ گومانێك ئەم ڕووداوەم بینی، بۆیە لەبەر ئاخ و پەژارەی حاڵی بەئازاری ئەو قوتابییانە بەکوڵ دامە پڕمەی گریان، ئەمەش سەرنجی هەندێ لە هاوڕێکانی ناو بەندیخانەی ڕاکێشا و بەپەلە هاتن بۆ لام.. منیش پێموتن: ئێستا وازم لێبێنن و بڕۆن لێم دووربکەونەوە..!

کاتێك لـه پەنجـەرەی بەندیخانەکـەوە، پێکەنینـە گەوجانەکانـی مرۆڤەکانـم دەبیست، کـە لـە ئاهەنـگ و شـادی و خۆشـییەکانی شـەوانەدا دەنگیـان دەهات، شـریتی وێنـە زینـدووەکان لەبەرچـاوی ئەندێشـەمدا بەخێرایـی بـەرەو داهاتـوو تێپەڕدەبوون و، چەند وێنەیەکی ترسناکم لـە ماتەمـە خەماوییـەکان دەبینـی: لەوانە تەرمـە چارەڕەشـەکانم دەبینـی بـە هێواشـی دەڕۆشـتن و، دارتەرمـە پەسـتەکانیش ئـەو کەسـانەیان هەڵگرتـووە کە لـە داهاتوویەکی نزیکدا دەبنـە میوانی گۆڕەکان..! گریـام بەسـەر ئـەو بێئاگایانـەدا کـە ئێسـتا پێدەکەنـن، خێـرا هەسـتم بـە ئـازار و دڵتەنگـی و تەنیایـی کـرد..! پاشـان گەڕامـەوە بـۆ لای ژیریـم و، پرسـیارم لـە حەقیقـەت کـرد و وتـم: ئـەم ئەندێشـە و بیـرە ترسـناکە چیـە ئـازارم دەدا..؟ لەپڕ ئـەم وەڵامـە هاتـە نـاو دڵـم:

- بێگومـان لـە هـەر پەنجـا کەسـێك، لـەو چـارە ڕەشـانەی کـە ئێسـتا پـڕ بەدەمیـان پێدەکەنـن و لـە مەسـتیی بێئاگاییـدا ڕادەبوێـرن، پێنـج کەسـیان دوای پەنجـا سـاڵی تـر پیربـوون و، ئێسـکەکانیان لاواز بـووە و، پشـتیان چەماوەتـەوە و، تەمەنیـان گەیشـتووەتە حەفتـا سـاڵ! چـل و پێنـج دانەکـەی تریشـیان، لەنـاو گۆڕەکانیانـدا بوونەتـەوە بـە خـۆڵ..!

ئـەو ڕوخسـارە جوان و شیرینانەی ئەوسا و، هەمـوو ئـەو پێکەنیـن و خۆشـییانە دەگۆڕێن بۆ دژەکانیان. ئینجا لەبەرئەوەی "کل آت قریب" واتە: "هەموو هاتوویەك نزیکە" ئەوا ئەوەی من بینیم حەقیقەت بوو نەك خەیاڵ! بۆیە لە ناخمەوە هاوارمکرد:

﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾

(یس: ٣٠)

**واتـە: ئـای پەشـیمانی داخـی سـەخت بـۆ ئـەو بەندانـەی کـە (بـێ بـاوەڕن)**

هەر پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە تەنیا گاڵتەیان پێ دەکرد و هیچی تر.

پاشان هێز و تواناکانم ڕووخان!

* * *

ساڵێك جگە لە مانگێك، بریتی بوو، لەو ماوەیەی نوورسی لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"دا بردیە سەر..! پاشان نۆرەی دەرچوون لە بەندیخانە و سەرهەڵدانی کێشە هات..! نوورسی لەکوێ دابنێن؟ چۆن ڕزگاریان ببێت لە کەسێك کە تەنها بوونی بەس بوو بۆ ئەوەی بیروبۆچوونەکانی بڵاوبکاتەوە بێ ئەوەی گوفتارێك لە زاری بێتەدەر!؟ کارگێڕی ناحیە و پارێزگاکان بیریان لەوە دەکردەوە چۆن و بە چ ڕێگایەك خۆیانی لێ ڕزگاربکەن؟ کەواتە بابڕوات بۆ مەنفایەکی نوێ..! دەبا ئەم جارەیان لە "قەستەمۆنی" بێت..!

## دەرکەوتنی کۆمەکی خوایی لە مەنفای "قەستەمۆنی"

پێی وتم:

هەرچەندە پیرێکی بەساڵاچوو و نەخۆش بووم، کەچی بەدەستبەسەری و ڕەهەندی ڕاپێچیان کردم بۆ شاری قەستەمۆنی، نزیکەی سێ مانگ لە بنکەی پۆلیس بە بەندکراوی مامەوە! لەکاتێکدا کە لە هەموو لایەکەوە نائومێدی دەوری دابووم، کۆمەکی و بەدەمەوەهاتنی خوایی فریای پیریم کەوت، ئەوەبوو خۆشەویستی خودی ئەندامانی پۆلیس و بەرپرسانی بنکەی پۆلیس درەوشایەوە بەسەرمدا و گۆڕان بۆ موریدی بەوەفا و دڵسۆز! پاسەوانەکانی زیندانم بوونە خزمەتکارم!.. هەر کاتێك دەمویست دەیانهێنامە دەرەوە بۆ پشوودان و، لەگەڵمدا دەهاتن بۆ گەشت و گەڕان بە دەوروبەری شارەکەدا.. بە باشترین شێوە خزمەتیان دەکردم، هەرگیز زۆریان لێنەدەکردم شەبقە بکەمەسەرم، یان مێزەرەکەم دابگرم، بەڵکو ڕێگەیان دەدام هاتوچۆی قوتابخانەی نوور بکەم کە لە بەرامبەر پاسگەکەوە بوو و، بەشداری لە خوێندنی وانەکانیدا بکەم.. تا ئەو کاتەی نەهامەتی و تاقیکردنەوەی قوتابییەکانم هاتە پێش و منیش پێم نایە وەرزێکی تری ڕەنج و مەینەتییەکانمەوە!

## بەسەرهاتێک: پەخشاندنی پەند و حیکمەت بەسەر لاواندا

لە قەستەمۆنی دەستەیەك قوتابیی قۆناغی دواناوەندی هاتن بۆ لام وتیان: خوای بەدیهێنەرمان پێ بناسێنە، چونکە مامۆستاکانمان باسی خوامان بۆ ناکەن!

منیش خەمباربووم بەوەی ئەم گوڵ زەمەقە بچکۆلانانە لەژێر بەردی کەڕوکاسدا دەم بکەنەوە و کەسێکی واش نەبێ بۆنەخۆشەکەیان هەڵمژێ.. بۆیە لە دڵی بریندارمەوە هەست و نەست و تاسەی خۆشەویستم بۆ ئەو گوڵانە هەڵڕشت و وتم:

"ڕۆڵەکانم، هەر زانستێك لەو زانستانەی ئێوە دەیانخوێنن خوای بەدیهێنەری بەخشندەتان(جل جلاله) پێ دەناسێنن! بەڵام بە زمانی تایبەتی خۆیان.. دەسا ئێوەش لەبری نەزانیی ئەو مامۆستایانە گوێ لە گوتارە پاراو و کاریگەرەکانی ئەو زانستانە بگرن..!"

پەنجە بچکۆلانەکان دەربەڕین و هەوڵیان دەدا تاڵە دەزووی تیشکە پرژوبڵاوەکان لێرە و لەوێ بگرن، لەپڕ وەکو ماسیە جوانەکان چەندین ڕەنگی زێڕینیان پۆشی.. قەستەمۆنیش چەندین هەڵهاتنی نوێی بەخۆوە بینی... جارێکی تر کێشەکان لەبەردەم ملهوڕاندا ڕاستبوونەوە: لەکوێ نوورسی دابنێن؟

لەکوێ ئەم پیاوە دانێن؟ ئەو پیاوەی هەروەکو چۆن زەوی تینوو دڵۆپەکانی باران هەڵدەمژێت، خەڵکی وتەکانی وەردەگرن!؟

کەواتە دەبێ دایببڕین لە خەڵکی..! دەسا با جارێکیتر بچێتەوە ناو بەندیخانە..!

## گرمە و ناڵەی هەورئاسای بەرگرییەکانی نوور لە دادگای "دەنیزلی"

بەکرێگیراوەکان دەستیانکرد بە هاندانی هەندێك بەرپرس لە دژی بەدیعوززەمان، هەروەها هەندێك زانای لەخۆبایی و ژمارەیەك نەزان و بێئاگاش لە شێخانی تەریقەت، ئەمانە هەرهەموویان بوونە تۆڕێك و دوژمنان بەکاریاندەهێنان بۆئەوەی جارێکیتر بەدیعوززەمان لە کونجی زیندان توندبکەنەوە و هەڵمەتێکی بەرفراوانی دەستگیرکردنی قوتابییەکانیشی لە چەند پارێزگایەکدا دەست پێبکەن. ٢٠ی سێبتەمبەری ١٩٤٣ی زایینیدا بەرواری کردنەوەی دەرگای ئەم قوتابخانە یوسفیە بوو لە دەنیزلی.

پێی وتم: ڕۆژانی دەنیزلی ڕۆژانێکن لەبیرناچنەوە.. بەندکردن پێش هیچ دادگاییکردنێك! بیرمە منیان خستە هۆڵێکی تەڕ و شێدارەوە کە بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەبوو، چرنووکەکانی سەرماش بەنێو دیوارەکانیدا دەهاتنە ژوورەوە و جەستەی نەخۆش و دەردەدارمیان لەتوپەت دەکرد! بیرم لەو نارەحەتییانە دەکردەوە کە برا بێتاوانەکانم بەهۆی منەوە تووشی هاتوون، ئاخۆ لە زیندانەکانیتردا تووشی چ ئازار و سزایەك ببن و چیان بەسەربێت؟ ئیتر خەم و پەژارەیەکی مەزن دایگرتم! پاشان بیرم لەوە کردەوە کە هاتە ڕێی بڵاوبوونەوەی "پەیامەکانی نوور"و چۆن دەستیان بەسەردا گیرا! ئەمە جگە لەو پیری و نەخۆشیەی کە

بەدەستیەوە دەمنالاند.. لە بێزاری و نائومێدیدا دەتلامەوە.. بەڵام زۆری پێنەچوو جارێکیتر کۆمەکی خوایی هات بەهانامەوە و، بەندینخانەکەمی گۆڕی بۆ قوتابخانەیەکی یوسفی نوێ و چەندین فەتحی تری بۆ ڕەخساندین! چونکە پەیامەکانی نوور بە شێوەیەکی زۆر بەرفراوان لەناو کۆمەڵگادا دەستیانکرد بە بڵاوبوونەوە، چونکە پاڵەوانانی قوتابخانەکانی نوور بە خامە ئەڵماسیەکانیان دەستیان دایە نووسینەوەیان، تەنانەت یەکێکیان سەرەڕای ئەو بارودۆخە ناهەموارەی دەوری دابووین، لە ماوەی کەمتر لە چوار مانگدا زیاتر لە بیست نوسخەی لە هەردوو پەیامی "الثمرە" و "الدفاع"ی نووسیەوە. هەرئەو نوسخانە بوونە هۆکاری سەرکەوتنەکان لە ناوەوە و دەرەوەی بەندینخانەدا. ئا بەو شێوەیە خەمەکانمان گۆڕان بۆ چەندین خۆشی و شادی.. جارێکیتر نهێنییەك لە نهێنییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەمان بینی، کە دەفەرموێ:

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾

(البقرة: ٢١٦)

**واتە: جەنگتان لەسەر پێویستکرا کەلاتان ناخۆشە وە ئەگونجێت شتێکتان پێ ناخۆش بێت و باشبێت بۆتان وە ئەگونجێت شتێکتان پێ خۆش بێت و خراپبێت بۆتان، وەخوا(چاك و خراپی ئێوە) ئەزانێت و ئێوە نایزانن.**

قوتابییانی نوور دەستیانکرد بە داگیرساندنی مۆم لەناو بەندیخانەدا و، چرا بچکۆلەکانیان لەناو گۆشە و قوژبنە تاریکەکانیدا هەڵدەواسی و، بە پەیامی "الثمرە" زەیتیان تێدەکردن، ئەو پەیامەی بەتایبەت بۆ بەندکراوەکان نووسرابوو، بۆیە زیاتر لە دوو سەد بەندکراو تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای خوا!

کەسانی ڕێگر و چەتە و تاوانکار، گۆڕان بۆ کەسانی چاك و لەخواترس، تەنانەت پیاوکوژێك لەوانە چەند کەسێکی کوشتبوو، کەچی دوای گەڕانەوەی سڵی دەکردەوە و دەترسا لەوەی مێشوولەیەکیش بکوژێت!

پاشان دانیشتنی دادگاییکردنەکە بەسترا..! تۆمەتەکان وەکو دەستە خوشکەکانی پێشووتریان یەك لەدوای یەك ریزکران: پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنی، هاندانی گەل دژی حکومەتی عەلمانی، هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕژێمی دەسەڵات! پاشان ناوهێنانی مستەفا کەمال بە "دەجال"!

لەناو قەفەزی تۆمەتدا ڕاوەستام، سەیری لای ڕاست و چەپی خۆم کرد.. هۆڵی دادگا جمەی دەهات لە جەماوەر.. دادوەرەکان -بە جلوبەرگە ڕازاوەکانیانەوە بە چەندین ناونیشان- لە دوانگە بەرزەکانیانەوە بە ئەوپەڕی خۆبەزلزانین و لوتبەرزیەوە دەیانڕوانی بەسەرمدا.. خوێن لە دڵمدا -کوڕی خۆم- وەکو گڕکان سەری کرد، وەك ئەسپەکانی سەرکەوتن لەناو خوێنبەرەکانمدا ڕایدەکرد..! مەقامی قوتابیی پیاوە ڕاهیبەکەی بەردەم جادوگەرەکە و شای چاڵە ئاگرینەکان "ملك الأخدود"م بەسەردا درەوشایەوە، بووە لاوێتییەك پیریمی پڕکرد لە چالاکی و هێز، بە جۆرێك لەسەردەمی لاویشمدا شتی وەهام بەخۆمەوە نەبینیبوو.. کەواتە ئەمە ڕۆژی ئاشکراکردنی ئەو فەرمانەیە کە داوام لێکراوە، ڕۆژی پشتهەڵکردنە لەوانەی هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەدەن!

جارێکیتر سەیری دەستەی دادگام کردەوە، بینیم تارماییەکانی تاریکی لەژێر پاڵتۆکانیاندا خۆیان حەشارداوە.. دەنگی هەناسە و ئاهێکی قووڵم بیست لە قووڵاییەکانی دڵمەوە دەهاتە دەرەوە، سەدای دەنگدانەوەکەی هۆڵی دادگا و

تەواوی شاریشی تێپەڕاند..! لوتکەی چیاکانم بینی جارێکی تر پڕببوونەوە لە ئەسپی ڕزگارکاران..! ئیتر زانیم کاتی خۆی هاتووەتە پێش!

دەربڕینەکە لەوە بەهێزتر بوو مەنگی و ئارامیی جارانم بەرگەی بگرێت، هاواره بێدەنگەکەم ڕۆیشت و بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە:

ئەی سوارچاکانی ڕێگەی خوا بەڕێبکەون..!

چاوەڕێمکرد هەتا ئەوکاتەی داواکاری گشتی لە خوێندنەوەی لیستی تۆمەتەکان بووەوە. ئەوەبوو ئاماژەیەکم لە سەرۆکی داگاوە وەرگرت، هاوکات بوارم نەدا پارێزەری بەرگری بێتە قسە، بەڵکو جڵەوم شلکرد بۆ ختوورەکانی دڵی لاوی چاڵە ئاگرینەکان "الأخـدود":

- ..بەڕێز سەرۆکی دادگا!

وەك دەبینین سێ تۆمەتمان دراوەتە پاڵ:

بڕگەی یەکەم: پێکهێنانی "کۆمەڵە":

بە دڵنیاییەوە دەڵێم، من و هەموو ئەو قوتابییانەی نوور کە ئێستا لێرەن و، هەموو ئەو کەسانەش کە چاویان بە من کەوتووە و قسەیان لەگەڵدا کردووم، و هەموو ئەوانەش کە پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە، یان پەیامەکانیان نووسیوەتەوە دەکەم بە شایەت -ئێوەش دەتوانن بۆ خۆتان پرسیاریان لێ بکەن- لەسەر ئەوەی کە من بە هیچ کەسێکم نەوتووە ئێمە کۆمەڵەیەکی سیاسی یان تەریقەتێکی سۆفیانە دادەمەزرێنین! بەڵکو هەمیشە وتوومە ئێمە هەوڵدەدەین ئیمانمان ڕزگاربکەین. لەنێوانماندا قسەیەك نەڕۆیشتووە لە تێکڕای ئەهلی ئیمان و چەمکی پیرۆزی "ئوممەتی ئیسلام" بەدەربێت، ئەوجا ئێمە لە دەرەوەی

قورئانی پیرۆز، کە سەرجەمی ئەهلی ئیمان لە سایەیدا کۆدەبنەوە شوێنێك بۆ خۆمان شك نابەین. هەربۆیە هەموو هەوڵێکمان تەنها بۆ خزمەتکردنی قورئانە، بەم پێیە ئێمە لە "حیزبی قورئانین". خۆ ئەگەر ئەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵمان ئاماژە بۆ ئەم واتایە بکات، ئەوا بە هەموو هەست و سۆزێکمانەوە و پڕ بە ڕۆحمان و، بەوپەڕی فەخر و شانازیەوە دانی پێدادەنێین! خۆ ئەگەر واتاگەلێکی دیکە مەبەست بێ، ئەوا ئێمە بەرین لەو واتایانە.

بڕگەی دووەم: خودی بڕیارنامەی تۆمەتەکە -بە پشت بەستن بە شایەتیدان و ڕاپۆرتەکانی پۆلیسی "قەستەمۆنی" دان بەوەدا دەنێ، کە هەریەکە لە "پەیامی حیجاب" و "پەیامی شەش هێرشەکان و پاشکۆکەی" لەناو سندوقێکی داخراو و بزمارڕێژکراودا و، لەژێر کۆمایەك دار و خەڵوزدا دۆزراونەتەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو پەیامانە بە هیچ شێوەیەك بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەنەکراون. سەرەڕای ئەمە، پێشتر لە لایەن دادگای "ئەسکی شەهر"ەوە وردبینی بۆ ئەو پەیامانە ئەنجامدراوە و شتێکی ئەوتۆیان تێدا بەدی نەکرد ببێتە تۆمەت لە دژمان.کەچی سەرەڕای ئەوەش سزایەکی سوکەڵەیان بەسەردا سەپاندم. بەڵام دەبینین ئەمڕۆ داواکاری گشتی چەند بڕگە و دەستەواژەیەکی ئەو پەیامانەی گرتووە بەدەستەوە و هەندێ چەمك و واتای نادروستی داونەتە پاڵ و دەیەوێ نۆ ساڵ بمانگێڕێتەوە بۆ دواوە و، لەسەر تۆمەتێك کە پێشتر لەسەری سزادراوین بەرپرسیاریەتییەکی نوێمان بخاتە ئەستۆ!

بڕگەی سێیەم: لە چەند شوێنێکی بڕیاری تۆمەتبارکردنەکەدا، چەند دەستەواژەیەکی وەك "دەگونجێ ئاسایشی دەوڵەت تێکبدات!" هاتوون، واتە ئەگەر و گریمانەکان لە شوێنی ڕووداوە جێگیر و چەسپاوەکاندا دانراون! منیش

دەڵێم: دەگونجێ و ئەگەری ئەوە لە ئارادایە، هەموو کەسێك هەڵسێ بە ئەنجامدانی تاوانی کوشتن، بەڵام ئایا دەکرێ و ڕەوایە هەموو کەسێك لەسەر بناغەی ئەو گریمانەیە تاوانبار بکرێت و سزا بدرێت؟

بەڕێزان!.. ئێمە تەنها وەکو مۆڵەتنامەی دەستهەڵگرتن لە ئەرك و فرمان و پسوولەی سەفەر بەرەو جیهانی ڕووناکی سەیری قورسترین سزاکانی ئێوە دەکەین.. بۆیە بەوپەڕی دامەزراویەوە چاوەڕوانی ئەو پسوولە و مۆڵەتنامەیە دەکەین.. بەڵام بە دڵنیاییەوە دەزانین ئەو کەسانەی لە دژمان وەستاون و بڕیارەکانیان لەسەرمان دەرکردووە، بەم نزیکانە ڕووبەڕووی ئیعدامی ئەبەدی دەبنەوە و! دەخرێنە بەندیخانەی تاکەکەسیی ڕاستەقینە و بە سزای خۆیان دەگەن، کە لەڕاستیدا سزایەکی تۆقێنەر و ترسناکە!.. ئێمە دڵنیاین لەوە، وەك چۆن ئێستا ئێوە دەبینین لەم دانیشتنەدا، بەو شێوەیە ئەوانیش دەبینین لەناو سزاکەیاندا دەتلێنەوە! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەڕووی مرۆییەوە، لەبەر ئەوان ئازارێکی زۆر دەچێژین و بەزەییمان بە حاڵیاندا دێتەوە و خەفەتیان بۆ دەخۆین!

بێگومان ئێوە تەنها دوو ڕێگەتان لەبەردەمدایە: یان ئەوەتا ئازادییەکی تەواو بدەن بە پەیامەکانی نوور، یان ئەوەتا -ئەگەر دەتوانن- هەوڵبدەن ئەو ڕاستییانەی کە لەناو ئەو پەیامانەدا هاتوون لەناوبەرن و بەسەریاندا سەربکەون..!

بە کورتی: لەبەرئەوەی ئێمە دەستناخەینە کاروباری دنیای ئێوەوە، پێویستە لەسەر ئێوەش دەستنەهێننە ڕێی کاروباری دواڕۆژی ئێمە!

بەڕێزان! لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا، بیست هەزار کەس بیست هەزار دانە لە پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە و، بەو پەیامانە قایل بوون و پەسەندیانکردوون و وەریانگرتوون. لەگەڵ ئەوەشدا لە لایەن قوتابییانی

نوورەوە، یەك ڕووداو ڕووی نەداوە ببێتە هۆی تێکدانی ئاسایش، دەزگا و سەرچاوە فەرمییەکانیش هیچ ڕووداوێکی لەو جۆرەیان لەسەر قوتابییانی نوور تۆمارنەکردووە، هەروەها نە دادگای پێشوو و نە دادگای ئێستاش نەیانتوانیوە هیچ حاڵەتێکی لەو چەشنە بدۆزنەوە، بەڵکو -ئەگەر ئەم تۆمەتانە ڕاستبوونایە- دەبوو لەژێر کاریگەری ئەم پڕوپاگەندە بەهێز و بەربڵاوانەدا، کە لە دژی ئێمە بڵاودەبنەوە تەنها لە ماوەی بیست ڕۆژدا چەندین ڕووداو و بەسەرهاتی لەو شێوەیە ئاشکرا ببوونایە!

بێگومان حاڵی ئێمە لە دەرەوەی بەندیخانەدا —لەم بارودۆخە بەدبەخت و تاریکەدا سەد جار لە حاڵی ناو بەندیخانەمان خراپترە! ئیتر دوای ئەم ستەم و زۆرداریە ڕەهایەی کە بەرامبەر ئێمە دەکرێ هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی ئازادی و سەربەستی لە وڵاتدا نەماوە!.. نە ئازادی زانستی، نە ئازادی ویژدانی، نە ئازادی ئاینی!.. کەواتە جگە لە مردن، یان چوونە ناو بەندیخانە هیچ ڕێگایەکیتر لەبەردەم ئەهلی شەهامەت و غیرەت و ئەهلی چاکەدا نەماوەتەوە! بەڵام ئێمە هیچ چارەیەکمان نیە ئەوە نەبێ دەست بە میهری پەروەردگاری خۆمانەوە بگرین و پەنای بۆ بەرین و بڵێین: "إنا لله وإنا إليه راجعون!".

کەواتە مادەم حەقیقەتەکە ئەمەیە، ئەوا ئێمە بە هەموو هێزێکمانەوە هاوار دەکەین و دەڵێین:

ئەی ئەو بەدبەختانەی کەوتوونەتە ناو چاڵی کوفری ڕەها و ئاشکراوە!.. ئەی ئەوانەی دینەکەتان فرۆشتووە و دنیاتان پێ کڕیوە!.. چیتان لەدەستدێت دریغی مەکەن! دەبا دنیاکەتان ببێ بە بەڵاو نەگبەتی و بڕژێ بەسەتاندا! هەروەکو دەشبێ!.. بەڵام ئێمە سەری خۆمان بەخشیوە بە حەقیقەتی پاك و

پیرۆز، ئەو حەقیقەتەی سەدان ملیۆن پاڵەوان سەری خۆیان لەپێناویدا دادەنێن!..
ئێمە ئامادەین بۆ پێشوازیکردن لە هەموو جۆرە سزایەکی ئێوە.. ئەگەر بڕیاری لەسێدارەدانیش بێت!

وتەکانی بەدیعوززەمان دەتوت داسن دەخرێنە گەردنی گژوگیای وشکهەڵاتوو! دەستەی دادگا لەتاو سەرسامی دەتوت لەهۆش خۆیان چوون! ژیانیش وەکو ڕێژاو دەڕژا بەسەر ئامادەبووانی ناو هۆڵی دادگادا، جوانییەکی سەوزیش ئاسمانی ئەو شوێنەی پڕکردبوو، خۆریش جارێکیتر بەسەر شەونمی گوڵەکاندا هەڵهات، تیشکی زێڕینی پەخش دەکرد و زەردەخەنەی بەهاری لەسەر ڕوخساری لاوەکاندا نەخش دەکرد.. ئەوە تەنها پرژێك بوو لە تیشکەکانی نوور، شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی بۆ جەماوەر ئاشکرا کرد، لە ڕۆژی جوانییەکەیدا فیرعەونی تووشی شڵەژان و دڵەڕاوکێ کرد! شێتیی ملهوڕ و زۆرداری چاڵە "أخدود" ئاگرینەکانی وروژاند، هەتا خراپترین تاوان لە مێژوودا ئەنجامبدات!
پەیامەکانی نووریش لە گۆڕەپانەکەدا بێنەدەرەوە و ئاڵای سەرکەوتن هەڵبکەن!..
ئەوەبوو بە توندی تیشك خرایە سەر دەستەی دادگا و، سەرۆکی دادگاش هیچی بۆ نەمایەوە ئەوەنەبێ بڕیاری بێتاوانی بۆ بەدیعوززەمان دەربکات! چونکە دەیویست ڕزگاری ببێت لەو بەرپرسیارێتیە و بیخاتە ئەستۆی لایەنێکیتر، دواجار بەدیعوززەمان نەفی کرا بۆ "ئەمیرداغ"!.

## مەنفای ئەمیرداغ

## لەنێوان مەینەتیی مانەوەی زۆرەملێ و تاوانی ژەهراوی کردن!

"ئەمیرداغ" مەنفایەك بوو، لە جۆرێكی تر.. لە ١٩٤٤ بەتەنیا هەڵیاندام بۆ ئەوێ و، نزیکەی سێ ساڵ خرامە ژوورێكی بچووك و ناچاری مانەوەی زۆرەملێ کرام.. سیخوڕی شەمشەمەکوێرەکان چاودێرییان دەکردم و شەو و ڕۆژ بەدوامەوە بوون، هیچ کەس نەیدەوێرا سەردانم بکات، یان لەگەڵم دابنیشێ و چاوی پێم بکەوێ! کەسێك نەبوو، پشکۆیەك لەو نوورەی تێبگرم، کە لە دڵمدا گڕی گرتبوو! کەواتە چۆن پەیامەکانی نوور بنووسمەوە؟! وامدەزانی بەتەواوەتی لە ژیان بێبەشکراوم، لەبەر ئەوە سەختترین ئازارم دەچەشت، تەنانەت لە ژیان بێزار بووم، ئاواتم دەخواستەوە بە بەندیخانەکەی "دەنیزلی" و بەدەرچوونم لەو بەندینخانەیە خەمبار دەبووم! پاشان نووسراوێکم نووسی بۆ بەرپرسانی ئەنقەرە کە ئەمە ناونیشانەکەی بوو: "ئەگەر دادوەر و داواکار یەکێك بێت، ئیتر شکات و سکاڵا بۆ لای کێ بەرزبکرێتەوە؟".. کەچی لە بەرامبەردا بە هەوڵی کوشتنم وەڵامیان دامەوە!

ئەوەش لە شەوێکی بێ فەڕ و نەزۆکدا بوو.. نە مانگی چواردەی تێدا دیار بوو نە ئەستێرەکان! ئەوەبوو یەکێك لە ناحەزان ژەهرێکی کوشندەی کردبووە ناو خواردنەکەمەوە، ئەوە ژەمی ئێوارەی ئەو شەوە ترسناکەم بوو! ئازار بەجارێك لە

هەموو جەستەمدا گڕی گرت، بەڵام خوای باڵادەست بە لوتف و میهرەبانی خۆی لە مەرگی ڕاستەقینەی بێگومان ڕزگاری کردم، چەندین ڕۆژ کەوتمە ناو جێگا و بەدەست ئازاری سەختەوە دەتلامەوە! سات دوای سات چاوەڕێی مەرگم دەکرد و زیکر و ئەوراد میوانی بەردەوامی سەر زوبانم بوو... هەتا بە فەرمانی خوا شیفام بۆ هات و ژیانم بۆ گەڕایەوە! جارێکی تر بینیم من موڵکی خۆم نیم و، زانیم کۆمەکی خوایی خزمەتی قورئانی مەزن لە کەسی دەستەوسان و لاوازی مندا دەپارێزێت.

لە دوای ئەوە هەواڵێکی سەرنجڕاکێشم پێگەیشت، بە نهێنی پێم ڕاگەیەنرا، کە قوتابیانی نوور، ئامێری "رۆنیۆ"یان -ئەو کاتە تازە داهاتبوو- دەستکەوتووە، تەنها لەیەك دانە پەیام، پێنج سەد دانە دەردەکات. فتوحاتی خوایی بەشوێن یەکدا بەسەرماندا دەباری، سەرلەنوێ ئومێد داباری بەسەر دڵمدا و، وای لێکردم ئەو ژیانە پڕ لە ئازار و ناجێگیرەی مەنفام خۆشبووێت. جارێکی تر دەنگم هەڵبڕی و لوتکەی چیاکان دەنگیاندایەوە:

- "ئەی سەعید..! "صەعید" بە واتە: خاك بە، وەکو خاك خۆنەویست بە، هەتا ڕوونیی پەیامەکانی نوور لێڵ نەکەیت..!" تینی گەرمای خۆر لە "ئەمیرداغ" تاوی سەند، کاربەدەستانی شارەکە پێی سەغڵەت بوون و دنیایان لێهاتەوە یەك، پاش ئەوەی هەموو شتێکیان بۆدەرکەوت بڕیاریاندا تاماوەیەکی دیاریکراو، ئەو گەرمای خۆرە تونـدی بەندینخانە بکەن، تا خەڵك وا بزانن تاوانبارە!

## ڕاگوێزران بۆ بەندیخانەی "ئافیۆن"

هەمان تۆمەتەکانی پێشتر جارێکیتر ورووژێنرانەوە.. مامۆستا و پازدە لە قوتابییانی ڕەوانەی داگای "تاوانە گەورەکان"ی ئافیۆن کران، لە چەند پارێزگایەکی تریشدا ژمارەیەکی بەرچاو لە شاگردانی نوور ڕاپێچی دادگاکان کران بۆ لێکۆڵینەوە. پاشان هەموویان لە ٢٨ی کانونی دووەم ١٩٤٨دا خرانە بەندیخانەی ئیحتیاتییەوە. ئەم جارەیان خۆری خۆشەویستی لە هەلاَتگەیەکی ترەوە بەسەر ولاَتدا هەڵهات.. بە میهرەبانیەوە تیشکی زێڕینی بەسەر هەموو شتێکدا پەخشان دەبوو. تەنانەت توانی دڵی سەربازەکان و خودی پیاوانی ئاسایشیش بە لای خۆیدا ڕابکێشێ!

## بەسەرهاتێک

کاك "ئیبراهیـم" پۆلیسێکی دڵسۆز بـوو لـە کارەکەیدا، بـەڵام دڵـی وابەستەی خۆشەویسـتی بەدیعوززەمـان ببـوو! تاقیکردنەوەکـەی هـەروا ئاسـان نەبـوو..! جارێکیـان ئازارەکانـی دڵـی برینـداری ئاشـکرا کـرد و وتـی:

ڕۆژێکیـان لـە بەندیخانـەوە مامۆسـتایان دەبـرد بـەرەو دادگای "ئافیـۆن".. پیاوانـی پۆلیـس لـە لای ڕاست و چەپیـەوە پاسـەوانییان دەکرد، سـەدان کـەس لـە قوتابییەکانـی بەدوایـەوە دەڕۆیشتن..! لـە هەمـوو لایەکـەوە جەماوەرێکـی زۆر ڕووی لـە شـاری "ئافیۆن" کردبوو، بۆئـەوەی ئامـادەی دادگایـی کردنەکـەی مامۆسـتابن و چاویـان پێـی بکەوێـت.. مـن ئـەو کاتـە هێشـتا لـە خزمەتـی سـەربازیدا بـووم. قـەدەرم وابـوو ئـەو ڕۆژە ئەرکەکـەم لەسـەر ئـەو شـەقامە بێـت، کـە دەچـووەوە سـەر دادگا، کتوپـڕ ڕووبـەڕوو خـۆم لەبـەردەم بەدیعوززەمانـدا بینیـەوە، "نازانـم" چـۆن لەبەردەمیدا وەك ڕێوشـوێنی سـەربازی وەستام و خێرا سـڵاوی سـەربازیم لێکـرد..! ڕوخسـاری بەسـام و هەیبەتـی، گـەورەیـی و شـکۆی دەگـەیانـد، هەرکـەس چـاوی پێدەکـەوت دەبـوو لەبـەر ڕێـز و مەزنیـی ئـەو ڕابوەستێت.. چاوەکانـی چەندیـن واتـای ڕۆحـی و ڕاسـتی ئیمانییـان لێـدەڕژا و دڵانیـان کـون دەکـرد و کـۆت و بەندیـان دەکـردن! ئـای چەنـد پیاوێکـی مـەزن بـوو!

پۆلیسـەکانی دەوروبـەرم لـەم کارەی مـن سـەریان سوڕما، بەڵام وایـان پیشـاندا

کە چاویان لە هیچ نەبووە! لەو کاتەدا یاریدەدەری هێزی سواری لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازدا بەوناوەدا تێپەڕدەبوون.. هەرکە چاوی لێ بوو من سڵاو دەکەم لە بەدیعوززەمان، خێرا هاواری کرد:

- ئەی سەربازەکان.. ئەو پۆلیسە دەستگیربکەن..!

دەستگیریان کردم و بەقۆڵبەستراوی دامیانەبەر بۆ ژووری فەرماندەی سەربازی.. هەر کە فەرماندە منی بە قۆڵبەستراوی بینی، هەستایە سەرپێ و، وتی:

- ئەمە چیە؟

یاریدەدەرەکەش خێرا وەڵامی دایەوە، وتی:

- ئەم پۆلیسە سڵاوی سەربازیی لە بەدیعوززەمان کردووە..!

فەرماندەکە زۆر لەیاریدەدەرەکە خراپتر بوو، شەڕ و خراپەی لەو زیاتر بوو..!

هەر کە گوێی لە برادەرەکەی بوو، ڕقی هەستا و گۆڕا بۆ جۆرێك لە شێتی! لەکاتێکدا خەریك بوو قژی خۆی دەربێنێ، پێی وتم:

- ئایا ڕاستە تۆ سڵاوت لە بەدیعوززەمان کردووە؟

من ناتوانم شتێك بەدرۆبخەمەوە کە دەیان کەس چاویان لێ بووە.. نەمدەزانی چۆن و بەچی وەڵامی بدەمەوە، بۆیە بە سادەییەوە وتم:

- ئایا من کەسێکی بێباوەڕم؟ من موسڵمانم..!

فەرماندەکە زیاتر هەڵچوو و وەکو شێت هاواری کرد:

- هەڵیواسن بۆ دارکاری..!

بە پەت بە دارەوە هەڵیانواسیم لە هەوادا! لێدان یەك لە دواییەك بەسەر جەستەمدا دەباری! سەرەتا لێدانەکان سەخت و بەئازار بوون، دواتر کەمێك نەبێت هەستم بە ئازار نەدەکرد! بۆیە هاوارم کرد بەسەریاندا و وتم:

- من سڵاوی خۆم کرد لە بەدیعوززەمان ئیتر ئێوە چیتان پێخۆشە بیکەن..!

یەکێکیان کە خەریکی دارکاری قاچەکانم بوو، قیڕاندی بەسەرمدا و وتی:

- هاوار بۆ تۆ ئەی بەدبەخت! دروست نییە پۆلیس سڵاو بکات لەو شێخە..!

خێرا وتم:

- بەڵکو دروستە..! باشە پۆلیس چیە؟ ئایا موسڵمان نیە..؟

لێدانەکە زیاتر و زیاتر تاوی سەند هەتا خەریك بوو لەهۆش خۆم بچم!

پاشان بۆ ماوەی هەفتەیەك توند کونجی بەندیخانەیان کردم.. لەو ماوەیەدا بەردەوام خەریکی تیمارکردنی زامەکانم بووم..! سوپاسی خوام دەکرد، لەسەر خزمەتکردنی مامۆستا بەدیعوززەمان!

***

بەدیعوززەمان لەگەڵ هاوڕێ تۆمەتبارەکانیدا بەوێنەی چیای سەرکەش لە بەندیخانەی ئافیۆندا ڕاوەستابوون.. لێکۆڵینەوە فەرمییەکان -ئەگەرچی سەخت بوون- بڕگەیەکی یاساییان نەدۆزیەوە ببێتە مایەی تاوانبارکردنیان.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دادگا بڕیاری بیست مانگ زیندانی بۆ مامۆستا دەرکرد..! قوتابییەکانیشی هەریەکە و بە چەند ماوەیەکی جیاواز سزادران، هەندێکیشیان ئازادکران.

"بیـرام یوکسـەل" قوتابییەکـی نـووره و، یەکێکـە لەوانـەی لـە بەندینخانـەی ئافیۆنـدا بەندکـراوە، ڕۆژێکیـان خەمەکانـی خـۆی دەگێڕایـەوە و دەیـوت:

کاری سـەرەکی و هەمیشـەییمان لـە بەندینخانـەی ئافیۆنـدا نووسـینەوەی پەیامەکانـی نـوور بـوو. هەرکاتێـك لـە زیندانەکـەی مامۆسـتا نزیـك دەبووینـەوە دەنگێکی وەك دەنگـی نـاو پـوورەی هەنگمـان دەبیسـت، شەو و ڕۆژ نوێژ و دوعـا و زیکری دەخوێند. ئێمەش لە نزیکەوە چاودێریی کارەکانی مامۆستامان دەکرد، لـە کاتـە درەنگەکانـی شـەودا چراکـەی داگیرسـابوو، سـەرگەرمی زیکـر و دوعـا بـوو. تیشـکی پێنجەمـی پەیامەکانـی لـەوێ دانـا، کـە نـاوی "الحجـة الزهـراء"ە. ناوبەنـاو بـە بـەردەم پەنجـەرە بچووکەکـەی زیندانەکەیـدا تێپەڕدەبوویـن، هـەر کـە چاوی پێمـان دەکـەوت ئـەو پاکەتـە شقارتانەی بـۆ فـڕێ دەدایـن کـە ڕەشنووسـی تیشـکی پێنجەمـی تێـدا شـاردبووەوە. ئێمـەش بـە پەرۆشـەوە هەڵماندەگرتـەوە و دەسـتماندەکرد بـە نووسـینەوەی و چەندین دانەمـان لەبەر دەگرتـەوە.. بـەو شـێوەیە بـەردەوام بوویـن، هەتـا پەیامـی "الحجـة الزهـراء" تەواوبـوو!

*** 

وردە وردە زەوی بـەرەو هاویـن دەخولایـەوە، تیشـکی زێڕینـی خۆریـش بەروبوومەکانی لە هەمـوو بـاخ و بێستانەکاندا پێ دەگەیاند و، چەندیـن جۆر لـە جوانـی پێ دەبەخشـین، بـۆن و بەرامـە خۆشـەکەیان هەمـوو شـوێنێکی پڕدەکرد.. ئەمـڕۆ پەیامەکانـی نـوور لـە هەمـوو ماڵێکـدا هـەن! هەمـوو ڕۆژێـك لەگـەڵ خۆری خۆشەویستیدا بەسـەر هەمـوو دڵێکدا هەڵدێن! ڕووناکییەکانـی ڕۆژ لەکوێ بە شەمشـەمەکوێرەکان دەکوژێنـەوە؟ دەوڵـەت خـۆی ئامادەدەکـرد بـۆ پێشـوازیکردن لـە سـەردەمێکی سیاسـی نـوێ.. ئیتـر ئـەو سـەردەمە ڕۆیشـت تاریکـی خـۆی بـە

تەنیا بتوانیێ دەستبەسەر دونیادا بگرێت، لەکویێ ئەوەی بۆ دەکرێ لە کاتێکدا زەوی بەردەوام دەخولێتەوە؟!

بەڵام تارماییەکانی تاریکی هێشتا چەکیان دانەناوە، هێشتا دڕندانە زۆران دەگرن و لە دژایەتیکردنی نووردا تواناکانیان دەخەنە گەڕ.. بەڵام بەندیخانەی ئافیوون لەوە زیاتر نەیتوانی پرشنگی هەتاوی بەدیعوززەمان لەخۆبگرێت. لەبەرئەوە تارماییەکان بڕیاریاندا جارێکیتر نەفی بکەن بۆ ئەمیرداغ! ئەوەش لە کۆتا مانگی ساڵی ١٩٤٩ی زایینیدابوو، دوای ئەوەی دوو ساڵی ڕەبەقی لە مانەوەی دەستبەسەریدا بردەسەر.

تامەزرۆی بیستنی قسە خۆش و جوانەکانی بووم، بەڵکو لێیانەوە پرژی زانست و حیکمەتەکەی بچنمەوە. دڵنیابووم لەوەی جارێکیتر دەیبینمەوە، ئوتومبێلەکەش بەردەوام لە نێوان خۆرئاوا و خۆرهەڵاتی ولاتدا، لە "ئیسپارتە"وە بۆ "ئورفە" ڕێگەی دەبڕی، منیش بە سەرسامیەوە لەنێوان ڕۆح و قوڕدا ئەمسەر و ئەوسەرم دەکرد! سەیرە، بەدیعوززەمان لە "ئورفە" کۆچی دوایی کرد و کەچی تەرمەکەی لە "ئیسپارتە" لەنێو درەختەکاندا خۆی شاردەوە..! نازانم کامیان لە مەقامی درەوشانەوە و دەرکەوتنەوە نزیکترە؟

هەستمکرد، سێبەری شتێك بەسەر ناوچاوانمدا تێپەڕدەبێت.. سەرم هەڵبڕی و، لەپشت شووشەی ئوتومبێلەکەوە سەیرمکرد، بینیم شتێکی وەك قەرەوێڵە لە ئاسۆوە کشا! کەمێك سەرنجمدا و لێی وردبوومەوە، بینیم دارتەرمێکە و کەسێکی تێدا خەوتووە! ئەوەندەی پێنەچوو لەناو دارتەرمەکەدا هاتە جووڵە و -بەڕێزانم- کفەنەکەی لەسەر دەموچاوی لادا و سەیری کردم و، وتی:

- ئایا نامناسی؟

نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە، بەڵام ڕوخساری لە ڕوخساری بەدیعوززەمان دەچوو؟ ئەدی بۆچی لەناو کفن و دارتەرمدا دەردەکەوێ؟

لێم پرسی:

- ئایا تۆ بەدیعوززەمان، نوورسی نیت؟

وتی:

- کەواتە دەبێ کێ بم؟ ئایا ئەو کەسە نیم کە تەرمەکەی لەناو گۆڕەکەیدا دیار نەما؟

خێرا وەڵامم دایەوە:

- ئەدی بۆچی ئەمڕۆ بە دارتەرم و کفەنەکەتەوە هاتوویت؟

- ئەمە مەقامی جیابوونەوە و لەیەك دابڕانە کوڕی خۆم، پێویستە ماوەیەك ڕۆمانەکەت کۆتایی پێ بێنی! لەمەولا میراتگری نهێنیەکە گێڕانەوەی پاشماوەی چیرۆکی نوور دەگرێتە ئەستۆ!.. من ئێستا هەر ئەوەندەم بۆ هەیە، لەناو کفنەکەمەوە لەگەڵت بدوێم، بۆیە جارێکی تر لەبری ناوەکەم جێناوی نادیار لەناو ڕۆمانەکەتدا بەکاربهێنە! ئەمە -لەم ڕۆژگاری فیتنە و ئاشووبەدا- کاتی ئامادەبوون و دیارنەمانە! کوڕی خۆم.. تۆ تەنها ئەوەت بۆ هەیە، بە ڕێڕەوەکانیدا بڕۆیت!.. کەواتە ئاگاداربە ناوی چەم و شیوەکە ڕات نەماڵێ! لەڕاستیدا خۆشییەکانی بەهارێکی سەرەتایی بەسەر گرد و تەپۆڵکەکانەوە گوڵ دەکەن، پاشان تاریکی هێرشدێنێ! ئیتر دڵگران مەبە بەو کارە خراپانەی ئەنجامیاندا! دڵنیابە وەرزی ئەویندااران دەگەڕێتەوە و ئیتر ناڕوات و لەناو ناچێت! و هەموو وەرزەکانی دنیا، بەرەو بەهارێکی هەمیشەیی کۆچ دەکەن! دەسا بە دەنگی بەرز سروودی هیوا و ئومێد بچڕە!.. با ڕاکە ڕاکە و هەڵپە و ڕابواردنی شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی لە وڵاتدا، نەتخەڵەتێنێ!

## بەسەرهاتێک: گریانی کۆتر و نەورەسەکان

پێی وتم:

گرتنە دەستی دەسەڵات لە لایەن پارتی گەلی دیموکراتییەوە، لە ساڵی ١٩٥٠ی زایینی نیشانەیەك بوو لەسەر کاتی پێگەیشتنی بەروبوومی نوور، هەرواش بوو.. چونکە نۆبەرەی ئەو سیاسەتەمان چنییەوە، کە سەرپەرشتی سیاسەتی دەکرد و بەڕێوەیدەبرد بێنەوەی خەریکی سیاسەت بێت و، خۆی پێوە سەرقاڵبکات! ئەوەبوو لێبوردنی گشتی بۆ هەموو بەندکراوانی سیاسی دەرکرا و، قەدەغەکردن لەسەر بانگدانی شەرعی هەڵگیرا.. پاش چارەکە سەدەیەك لە خنکان و خەفەبوون، لە هەوڵێکی تاڵدا بۆ کپکردنەوەی دەنگی ئاسمان، منارەی مزگەوتەکان لە خۆشیدا بە ئاشکرا دەستیان کرد بە گریان..! گومەز و منارەکانیش پڕبوون لە دەنگ و ئاوازی پەڕەسێلکەکان.. لەگەڵ کاروانی نەویندارانـدا بەرەو مەنزڵی خۆشەویستان کۆچیان دەکرد، دەسا ئەی باڵندەکان بخوێنن، و ئەی دارستانەکان با ئێوەش دەنگتان بێت، وە ئەی چیاکان ئێوەش لەگەڵیاندا بڵێنەوە و بۆیان بسێننەوە..!

- اللّٰه أكبر..! اللّٰه أكبر..!

بەڕاستی ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی مێژوویی و لەیادنەکراو و شایەتی لەسەردراو

بوو.. چارەکە سەدەیەك بوو، دڵان لەناو سنگەکاندا بەندکرابوون.. نەورەسەکانی ئەستەمبووڵیش جگە لە شین و گریان هیچ دەنگێکی تریان لێوە نەدەهات..!

چارەکە سەدەیەك بوو ڕێ نەدەدرا پەپوسلێمانەکان هەواڵی نوور بگەیەنن.. کۆترەکانیش نەیان دەتوانی قاچە لاوازەکانیان بخەنە سەر چارۆکەی ئەو کەشتیانەی بەبێ ئاراستە لەناو دەریاکاندا ڕێیان دەکرد!

پاشان دەنگی بانگ هەڵبڕا!

- اللّٰه أكبر..! اللّٰه أكبر..!

ئایا بەڕاستی گوێت لێیە کوڕی خۆم؟ ئەمانە منارەکانی "فاتیح"ن، سەرلەنوێ بە زمانی باڵندە قسەدەکەن! ئەمە گومەزەکانن دەنگ دەدەنەوە، ئەمە خەونە ڕاستەکەیە کە وەك شەبەقی بەیان دێتە دی! دەنگە دڵگیر و بۆنخۆشەکان بە بۆن و بەرامەی بەهەشت کۆت و زنجیرەکانیان دەشکێ و بە توندی دەردەچن و ئاسمان و زەوی بەیەکەوە گرێ دەدەن.. هەموو مزگەوتەکان ئێستا ئاهەنگ و زەماوەندی خۆیان بۆ جیهانیان ڕادەگەیەنن: مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد، مزگەوتی سولەیمانیە، مزگەوتی بایەزید، مزگەوتی فاتیح، مزگەوتی ئەبو ئەیوبی ئەنساری..! دەنگی مزگەوتی "ئولوجامع" لە "ئورفە"وە بۆ مزگەوتی "ئولوجامع" لە بۆرسا بڵاودەبێتەوە!

منارەکانی مزگەوتی سەلیمیە، لە "ئەدیرنە" بە دەنگ و ئاوازەکانیان هەواڵی دەربازبوونیان دەهاویشت بۆ باڵندە بەندکراوەکانی ناو قەفەزە تەنگ و تەسکەکانی دەوڵەتانی بەڵقان.. کۆترەکانیش لەسەر بورجی قەڵاکانەوە وەڵامی سڵاوەکەیان دەدایەوە..! نەورەسەکانیش لە شەپۆلەکانی دەریای ڕەشەوە خەمەکەیان دەچنیەوە و دەیانبرد لەگەڵ خۆیاندا و بە گریانەوە کۆچیان دەکرد

و ولاتیـان دەپێوا، لـە دەریـای "مەڕمـەڕە"وە دوای خۆرئاوابـوون هەتـا دەریاچـەی "وان" پێـش خۆرهەڵاتـن، سـروود و ئـاوازی سـەرکەوتنی خەفەتباریـان دەوت..!

- اللّٰه أكبر..! اللّٰه أكبر..!

شـەبەنگ و تارمایـی هاتوچۆکەرانـی نـاو کووچـە و کۆڵانـەکان خشـوع و ملکەچـی و سـام و هەیبەتێکـی ترسـناکی هەبـوو.. مـووی جەسـتە پـاك و بەدەسـتنوێژەکان ڕاسـت بـووەوە! قاچەکانیـش لـە جێگـەی خۆیانـدا وەکـو بزمـار داکوتـران! ئیتـر کـێ دەتوانـێ لـە شـوێنی خـۆی بجوولـێ لەکاتێکـدا کـە دڵان بەرەو بەرزایـی کێش دەکرێن؟ و سـواری وشـەکانی بانـگ دەبن و بـەرەو ئاسـمان لـە شـەقەی بـاڵ دەدەن؟ کـێ دەتوانـێ بەسـەر تـەزووی کاسـرەبادا زاڵ ببێـت؟ بەڕێزانم کـێ دەتوانـێ ڕێ لـە گریـان بگرێـت؟

حافـظ محەمـەد ئیمامـی مزگـەوتێکی بچـووك بـوو.. لە هەردوو سـەردەمەکاندا ژیابـوو: سـەردەمی عوسـمانی و، سـەردەمی تاریکییـەکان، پاشـان جارێکیتـر گوێـی لـە بانـگ بـوو.. شـەپۆلی وشـەکانی "اللّٰـه أكـبر" و "لا الـه الا اللّٰه" دەیاندا لـە لێواری دڵـی زامـداری، ئیتـر خـۆی پێنەگیـراو دایـە پرمـەی گریانێکـی قـووڵ! سـنگی لاوازیشـی وەکـو مەنجەڵ دەکولا، دەسـتە لەرزۆکەکانیشـی بە دەسـتەسڕێکی کۆن لافـاوی فرمێسـکەکانی دەسـڕی، هەتـا لەنـاو نوێژەکـەدا ون بـوو! حاڵـی لـێ هاتبـوو، بـەڵام چ حاڵێك! محەمـەد دەگریـا بـەڵام نەیدەزانـی گریانەکـەی لەبـەر چیـە؟ ئایـا لـە خەفەتـی ئەوەدایـە، کـە لەدەسـتچووە؟ یـان لـە خۆشـی ئـەوە دایـە کـە لەمـەودوا دێـت؟!

أَبَـكَـتْ تِـلْكُمُ الـحَمَامَةُ أمْ غَنَّـت — عَـلى فَـرْعِ غُصْنِها المَيّادِ..؟!

........................

جارێکیتر کفنەکەی لەسەر دەموچاوی لابرد، پاشان کەمێك سەری بەرزکردەوە وەك بڵێی سەربخاتە سەر شتێك، ئەوجا وتی:

- کوڕی خۆم، پاشان دۆسیەی کێشەی پەیامەکانی نوور داخرا و، بەر یاسای لێبوردنی گشتی کەوت، بەڵام هێشتا دەستەی دادگای ئافیۆن بە فەرمی بڕیاری بێتاوانی بۆ پەیامەکانی نوور دەرنەکردبوو، بەڵکو سووربوون لەسەر ئەو بڕیارەی کە پێشتر درابوو بۆ دەست بەسەرداگرتنیان ئەوەش هەوڵێکی نەزۆك بوو لە لایەن تارماییەکانی تاریکیەوە دەدرا. چونکە دادگای پێداچوونەوە بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە لە دوای ئەوە دادگای ئافیۆن ناچار بوو بڕیاری بێتاوانییان بۆ دەربکات و دەست بەسەرداگرتنیان لەسەر هەڵبگرێت. بەڵام دادگای پێداچوونەوە لەبەر کەموکورتییەك کە لە بنەما فەرمییەکاندا هەبوو جارێکیتر بڕیارەکەی دادگای ئافیۆنی هەڵوەشاندەوە و دەربارەی پەیامەکانی نوور داوای ڕاپۆرتێکی کرد لە سەرۆکایەتی کاروباری ئاینی، ڕاپۆرتەکە بە ئیجابی هاتەوە.. بڕیاردان لەسەر پەیامەکانی نوور لەنێوان نامە و نامەکارییە فەرمییەکاندا بە شپرزەیی و شلەژاوی مایەوە، هەتاساڵی ١٩٥٦ی زایینی، ئەوکاتەی کە دادگای ئافیۆن لەژێر چەندین فشاری جۆراوجۆردا لێرە و لەویێ، بە کۆی دەنگ بڕیاری بێتاوانی "پەیامەکانی نوور"ی دەرکرد. ئەو بڕیارە بووە بڕیاری کۆتایی و یەکلاکەرەوە.

لە کۆتاییدا قەدەغەکردن لەسەر "پەیامەکان" هەڵگیرا و ڕێگەی چاپکردن و بڵاوکردنەوەیان لە هەموو شوێنێك پێدرا!

## مەقامی داوەرییە سەربەستەکان

کەم کەم دەنگی دەنووسا، پاشان چاوم لێ بوو کفنەکەی دەدایەوە بەسەر دەموچاویدا و دەیوت: ماڵئاوا، خواتان لەگەڵ!

بە ترس و لەرزەوە بانگم لێکرد:

گەورەم! تکات لێدەکەم! هێشتا چیرۆکەکە تەواو نەبووە..!

لەژێر کفنەکەوە دەستی درێژکرد، وەکو بڵێی ئاماژە بۆ شوێنێك بکات، پاشان تەرمەکە چوو بە هەوادا و، لەناو درەختەکاندا دیار نەما!

پەیوەندیم بە "بەرپرسی" قوتابخانەی نوور لە ئەستەمبووڵ کرد، لێم پرسی:

- ئابی! چۆن ڕۆمانەکەم تەواوبکەم، خۆ من ساڵەکانی کۆتاییم لەدەستچوو..؟

پێی وتم:

- لەو جێیەی تەرمەکەی بەدیعوززەمان دیار نەما، ئا لەوێدا شریتی ساڵانی کۆتایی دەردەکەوێ!

وتم:

- ئەوە ئەو شتەیە کە ئێمە دەمانویست، فەرمانم کرد بە شۆفێرەکە

خێرا بوەستێت، پاشان بە نەزانی ڕێگام گرتەبەر و بە تەنیا بەنێو گژوگیا و بێشەڵانەکەدا ڕامکرد.. هەتا گەیشتمە ئەو شوێنەی خۆری لێ هەڵدێ، لەوێ پیاوێکی بەساڵاچووم بینی لەسەر حەسیرێکی کۆن دانیشتبوو، دانەی تەسبیحەکانی دەژمارد و بەدەنگی بەرز زیکری دەکرد. سڵاوم لێکرد و لێم پرسی:

- گەورەم، لەکوێ پاشماوەی چیرۆکەکەی نوورسیم دەستدەکەوێ؟

وتی هاوار بۆ تۆ! ئەوە تۆ خۆتی؟ ماوەیەکی زۆرە من لەم شوێنەدا چاوەڕێی تۆ دەکەم! من قوتابی بەدیعوززەمانم، کوڕی خۆم وەرە دابنیشە!

پێی وتم:

کوڕی خۆم، هەتا ئەوکاتە تەمەنی بەدیعوززەمان نەگەیشتە حەفتا و چوار ساڵ ڕۆژگاری نەفی کردن و بەندکردنیش کۆتایی نەهات، دوای ئەوە ئازادکراو بۆ خۆی بەسەربەستی دەگەڕا.. بەڵام لەژێر چاودێرییەکی بەردەوامدا، خۆ سەردەمی نوێش چەندین دەردەسەری و مەینەتی لە جۆرێکیتر لەگەڵ خۆیدا هێنا، لەگەڵ ئەوەشدا گومان لەوەدا نەبوو کە هەڵکشانی تاریکییەکان بە ڕێژەیەك پاشەکشێی کردبوو. لەبەرئەوە یەکەمین کارێك کە مامۆستا بیری لێکردەوە بریتی بوو لە بەسەرکردنەوەی قوتابییەکانی و ، بینینی دەغڵودانی ساڵانی نەفی کردن و بەندکردن تا بزانێ چی بەرهەم هێناوە.. مامۆستا وێڕای چوونە تەمەنیشەوە، کەچی لە یەکەم گەشتیدا بە ئازادی ڕۆیشت بۆ شاری "ئەسکی شەهر" ئەوەش لە سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٥١ی زایینیدا بوو. نزیکەی مانگ و نیوێك مایەوە، پاشان ڕووی کردە شاری "ئیسپارتە" و لەوێش زیاتر لە دوو مانگ مایەوە، قوتابییەکانی لە هەموو ئاست و تەمەنەکان بەسەرکردەوە و، وەڵامی پرسیارەکانیانی لەبارەی فیقهی ئاین و بانگەوازەوە دایەوە.

# فتوحاتی لاتینی

پیته تورکیه نوێکان بریتیبوون له پیتی لاتینی، که جێگەی پیته عەرەبییەکانیان گرتبووەوە، ئەوەش لەبەر حەز و ئارەزووی تارماییەکانی تاریکی بوو، بۆ دابڕینی ئوممەت له کەلتووره مەزنەکەی، بۆیه ئەوەندەی نەخایەند نەوەیەکی نوێ له تورکەکان پێگەیشت،که تەنها به پیته لاتینییەکان، دەیتوانی بنوسێت و بخوێنێتەوه، پیته عەرەبییەکانیش خرانه مۆزەخانەی ئەستەمبووڵەوه و، لەنێو دەستنووسه کەڵەکەبووەکاندا به ناوی "زمانی عوسمانی"یەوه پشتگوێ خران! لەبەرئەوه پەیامەکانی نوور بەردەوام بەدەوری نەوەیەکدا دەخولایەوه، که هەرچەی نەمان و لەناوچوونی لێدەکرا، تا ئەوکاتەی قوتابییەکی زیرەکی زانکۆی ئەستەمبووڵ دەستپێشخەری کرد و ڕێچکەی شکاند و دەرگای خسته سەرپشت بۆ لاوان و، پەیامی "ڕابەری لاوان"ی بەپیته لاتینییەکان بڵاوکردەوه، ئەمەش بۆ خۆی هەنگاوێکی بێوێنه بوو به مەبەستی ئاشناکردنی ڕاستییەکانی نوور لەنێوان ئەو نەوه نوێیەی که بێبەشکرابوو له فێربوون به پیتی عەرەبی. له دوای ئەوه قوتابیانی زانکۆ پۆل پۆل ڕوویان کرده بزوتنەوەی نوور... لەبەرئەوه ڕق و تووڕەیی دوژمنان جارێکی تر وروژا و، بەبیانووی سەرپێچیکردن له ماددەی (١٦٣) له دەستووری تورکی، داوایەکیان له دژی مامۆستا نوورسی بەرزکردەوه،

بەپێی ئەو ماددەیە هەموو جموجووڵ و چالاکییەك قەدەغەکرابوو کە ئامانج لێی دامەزراندنی دەوڵەت بێت لەسەر بنەمای ئاین.

مامۆستا بەدیعوززەمان بانگکرا بۆ ئەستەمبووڵ تا لەبەردەم دادگای تاوانە گەورەکاندا ئامادەبێت، ڕۆژی ٢٢ی کانونی دووەمی ١٩٥٢ی زاینی دیاریکرا، بۆ دانیشتنی دەستەی دادگا، مامۆستا بۆ خۆی چوو بۆ ئەستەمبووڵ، ئەوە یەکەمین سەردان بوو بۆ ئەو شارە خەمبارە دوای دابڕان و دوورکەوتنەوەیەك، کە بیست و حەوت ساڵ درێژەی کێشابوو!

ئاە، داخی بەجەرگم ئەستەمبووڵ.. ئەی شاری خەمەکان..! بیست و حەوت ساڵ دووری لە تۆ! -بەڕێزانم- ڕۆژگار لەسەر بەردی مێژوو دەنووسێ ئەگەرچی ڕێگا دوور و سەفەرەکەش درێژبێت، هەردەبێ بگەینەوە ئەستەمبووڵ!.. پاش ئەوەی تاریکی باڵی کێشا بەسەر وڵاتدا ئەستەمبووڵی بەجێهێشت و سەری خۆی هەڵگرت و لە دەروونی خۆیدا بەدوای "سەعیدی نوێ"دا دەگەڕا.. ئای کە شارێکی خەمبارە! ئاخۆ چەند جار بە سەرکەوتنەوە وەکو چوونی ڕزگارکاران و سەرکەوتووان چوویێتە ناوی! کەچی ئەوەتا ئەمڕۆ وەکو چوونی تۆمەتباران دەچێتە ناوی! بەڵام ئەگەرچی تاریکی ستەم و زۆرداری خۆی نواند بەڵام هەرگیز گەل پاڵەوانانی نوور لەیادناکات.. هەر کە ڕۆڵەکانی ئەو شارە هەواڵی هاتنی ئەویان بەرگوێ کەوت، دەستە دەستە داباریـن بەسەریدا، ئەو ڕێگایانەی دەگەیشتنەوە بە ئۆتێلە خاکی و بێ فیزەکەی جمەیان دەهات، بە دەگمەن جووڵەی قاچی هاتوچۆکەران کز دەبوو..

هەتا ڕۆژی دادگایی هاتە پێش، هۆڵی دادگا سەرڕێژ بوو لە قوتابییانی نوور و ئەوانەی تامەزرۆی بینینی ئەو زانا مەزنە بوون کە ئەو هەموو ساڵە

دونیای بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو! قەرەباڵغیەکە لە دادگاکەوە بۆ ...
گشتی کشابوو.

داواکاری گشتی دەستی کرد بە خوێندنەوەی ڕاپۆرتی ئەو شارەزایانەی کە وردبینی پەیامی "ڕابەری لاوان"یان پێ سپێررابوو. تۆمەتەکە بریتیبوو لە "دانەر لەم پەیامەیدا هەوڵدەدا بیری ئاینی بڵاوبکاتەوە و بەهۆی ئەم بیروبۆچوونانەوە نەخشەی ڕێگایەکی تایبەت دەکێشێ بۆ لاوان. هەروەها ئافرەتان بانگ دەکات بۆ شەرم و حەیا، داوا دەکات جوانیی خۆیان دەرنەخەن، چونکە ئەوە دژایەتی لەگەڵ فیترەتدا هەیە، پێچەوانەی ئەحکامەکانی ئیسلام و ئادابەکانی قورئانە. هەروەها بانگەشە بۆ خوێندنی ئاین دەکات، ئەو بەو کارانەی پشتیوانی لە دامەزراندنی دەوڵەت دەکات لەسەر بناغەی ئاینی..!"

بەڕێزان ئەوەبوو کێشەکە، پاشان دانیشتنی یەکەم هەڵگیرا.

دوای ئەوە دادگا دوو دانیشتنی تری گرێداو، دادوەر لەو دانیشتنانەدا گوێی لە خاوەنی ئەو چاپخانەیە گرت کە پەیامەکەی تێدا چاپکرابوو، هەروەها گوێی لە شایەتیی پۆلیس و ئەو قوتابییەی زانکۆش گرت، کە پەیامەکەی بڵاوکردبووەوە، مامۆستاش لەو دانیشتنانەدا ڕەخنەی لە ڕاپۆرتی شارەزایان گرت، قەرەباڵغی ئامادەبووانیش لە قوتابییان و خۆشەویستانی مامۆستا بە جۆرێك بوو بەرپرسانی ئاسایشی ناچارکرد کە ڕێوشوێنێکی ئەمنی توندوتۆڵ بگرنە بەر و سەدان کەس لە پیاوانی پۆلیس لە ناوەوە و دەرەوەی دادگادا بڵاوە پێبکەن.

هەر کە پارێزەرانی یاسایی لە بەرگرییەکانیان بوونەوە، سەرۆکی دادگا ڕووی کردە بەدیعوززەمان و لێی پرسی:

- زیاد لەوەی پێشتر وتت، شتێکیتر هەیە، بتەوێ بیلێیت؟

- بەڵێ، هیوادارم ڕێم بدەن یەك وشەیتر بخەمە سەر قسەکانم..

- فەرموون..!

- من شایانی هەموو ئەو ستایش و پیاهەڵدانانە نیم کە وەکیلە بەڕێزەکانم سەبارەت بەمن وتیان، من جگە لە خزمەتگوزارێکی دەستەوسانی قورئان هیچی تر نیم!

دادوەر بە شەرمەزاریەوە سەیری بابای ناو قەفەزی تۆمەتی دەکرد، وەك بڵێی هەستدەکات خۆی تۆمەتبارە نەك ئەو. کەمێك بێدەنگ بوو.. لە ساتەوەختی بێدەنگبوونەکەیدا چاوە وڕبووەکانی گوزارشتیان لە شتێك دەکرد، بەڵام -لەبەر کورتی ماوەی بێدەنگیەکەی- کەس ئاگای لێ نەبوو، وەکو بڵێی بەلای زۆربەی ئامادەبووانەوە ساتی سەرنجدانێکی کتوپڕ بوو. بەڵام بە لای ئەوەوە زەمەنێکی ڕەهای بێ پایان بوو. چونکە لە ژیانیدا بۆ یەکەمجار چاوی کرایەوە بەسەر دەریایەکدا ئەوپەڕی نەبێت و پیاوێکی بینی، بەڵام نەك وەك پیاوانیتر.. شەپۆلەکان بەخوڕ دەربەڕین و لە قەولایی دڵیەوە هاواری کرد: خوا ڕووی سپی بکات و پشت و پەنای بێت، چ عیملاقێکی مەزنە! تۆمەتبارێك نکوڵی لە بەرگری وەکیلەکەی دەکات و خۆی بە شایانی ستایش و پیاهەڵدانەکانی ئەو نازانێت؟ ئەمە چ بلیمەتیەکە لەناو ڕۆحی ئەودا نیشتەجێ بووە! ئەمە چ ئیخلاسێکە شێتیی پیاوچاکان دروستدەکات؟ دەك بەدبەخت و چارەڕەش بێت ئەو وڵاتەی دادگایی پیاوێکی وەك بەدیعوززەمان دەکات..!

.................

پاش چەند ساتێك لە ڕاوێژ و گفتوگۆ، دادگا بە کۆی دەن[illegible]
زمانی سەرۆکەکەی بڕیاری بەرائەت و بێتاوانی بەدیعوززەمانی ڕاگەیاندا

بەهۆی چەپڵەلێدانەوە هۆڵەکە هاتە لەرزە.. دەنگدانەوەکە لەوە بەهێزتر بوو گوێکان بەرگەی بگرن، ئەو جەماوەرەشی لە دەرەوە چاوەڕوانییان دەکرد کەوتنە جۆش و خرۆش. هەراوهوریایەکی وا دروست بوو هیچ وشەیەك نەبوو بە سەلامەتی بگاتە گوێچکەکان و خەڵك لێی تێبگات، جگە لە تەنها وشەیەك: بێتاوانی بەدیعوززەمان!

پاشان بڕیارەکە پلەی کۆتایی بەدەستهێنا و هەموو شتێکی بڕیەوە، چونکە داواکاری گشتی داوای پێداچوونەوەی پێشکەش نەکرد، ترسنۆك و لەرزۆکەکانیش داواکەیان دۆڕان...

پاشان پیرەمێردی لاو هاتە دەرەوە و، دەستی بەرزکردەوە و بە توندی جلەوی خۆری گرت، ئیتر ئەستەمبوولی بەجێهێشت و سەرلەنوێ بەنێو شار و لادێکاندا دەستی کردەوە بە گەشتە هەتا هەتاییەکەی..

# کۆتا دادگایی نائومێدیی تارماییەکانی تاریکی ڕاگەیاند..!

شەیتان لە داخاندا بە ڕق و تووڕەبوونەوە لە بەرەیەکی ترەوە کەوتە جموجووڵ.. لە ڕۆژنامەکاندا بەگوڕ و تینەوە هەڵمەتێك لە دژی بزوتنەوەی نوور دەستی پێکرد، ستەمکارانی ئاگاداردەکردەوە لە تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی ئەو بزوتنەوەیە لە وڵاتدا و، بەئاگای دەهێنانەوە لە مەترسییەکانی لەسەر داهاتووی عەلمانیەت. بە بیانووی بڵاوکردنەوەی گوتارێك لەژێر ناونیشانی "گەورەترین بەڵگە" لەگۆڤاری "جیهادی ئەکبر"دا ساڵی ١٩٥٣ی زایینی لەشاری "سامسۆن" دەرگای دەعوایەکی نوێ لە دژی بەدیعوززەمان خرایە سەرپشت، داواکاری گشتی داوای لە مامۆستا کرد لەبەردەم دادگای "سامسۆن"دا ئامادەبێت، بەڵام ئەو بەساڵاچوو و نەخۆش بوو، بە زەحمەت بەرەو تەمەنی حەفتا و شەش ساڵی هەنگاوی دەنا. هەرچەندە لە قەزای "ئەمیرداغ" و پارێزگای "ئەسکی شەهر"یش مۆڵەتی پزیشکی بەدەستهێنابوو، کەچی دادگای "سامسۆن" پێداگری دەکرد لەسەر ئامادەبوونی. پیری نەخۆش بەرەو ئەستەمبوڵ کەوتەڕێ و لەوێشەوە بۆ "سامسۆن".

بەڵام پاش گەیشتنی بە ئەستەمبوڵ، نەخۆشیەکەی زۆری بۆ هێنا، ئیتر لەوە زیاتر نەیتوانی درێژە بە سەفەرەکەی بدات، لەبەرئەوە داوای لە دەستەی تەندروستیی ئەستەمبوڵ کرد ڕاپۆرتێکی پزیشکی بۆ بنووسن، ئەوانیش

داواکاریەکەیان بەجێهێنا و ڕاپۆرتەکەیان نارد بۆ دادگای "سامسۆن"، دواجار دادگای "سامسۆن" بڕیاریدا دادگای ئەستەمبووڵ لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات.

شێرەکە جارێکیتر، لەڕووی دەستەی دادگای ئەستەمبووڵدا هاواری کرد و وتی:

"ڕووی گوفتارم دەکەمە تەواوی ئەو کەسانەی سەر بە فەرمانگەی دادن و پەروەشی دادگەرین: ئەو کەسانەی بە بیانوی پڕوپوچ و بێمانا چەندین ساڵە ئازای ویژدانم دەدەن ، با بزانن لە ڕۆژی دادگای حەشری هەرەمەزندا دەرچوونیان نابێت و تۆڵەی خۆیان وەردەگرن، ئەوانە بە شێوەیەکی ئاشکرا سەرپێچی لە یاسا دەکەن و بەناوی یاساوە یاسا پێشێل دەکەن، بەڵێ ئایا لە هەموو سەرزەویدا یاسایەکی وەها هەیە، لەبەرئەوەی شەبقەی بیانییەکان نەکاتە سەری، پیاوێك تۆمەتباربکات کە ٣٥ ساڵە گۆشەگیری هەڵبژاردبێت و لە شار و ئاوەدانی دوورکەوتبێتەوە؟.."

جارێکی تر دادگا بڕیاری بێتاوانی بۆ مامۆستا دەرکرد و، دوژمنانیش نائومێدبوون لەوەی سکاڵا لە پیاوێك بکەن کە لەوەبەدوا لە توانای کەسدا نەبێت بەندی بکات یاخود سزای بدات. کوڕی خۆم ئیتر بەم شێوەیە چیرۆکی دادگاییکردنەکان، لە ژیاننامەی نووردا کۆتایی هات.

..................

ئیتر مامۆستا نزیکەی سێ مانگی لە ئەستەمبووڵ بردە سەر و دوای ئەوە بڕیاریدا بەرەوە "بارلا" سەفەربکات.

## مەقامی شەوق و تاسەمەندی

## خۆشەویستی "بارلا" لە دڵدا ڕەگی داکوتیوە!

ئوتومبێلەکەی مامۆستا لەگەڵ قوتابییە تایبەتمەندەکانی بەرەو "بارلا" شاری یادەوەرییەکان کەوتە ڕێ. لێرەو لەوێ لەسەر ڕێی هەوارگەی خۆشەویستاندا چەند وێستگەیەکی جوانیان هەڵبژارد بۆ پشوودان، لە "ئەمیرداغ" وەستان، پاشان بەرەو "ئەسکی شەهر" کەوتنە ڕێ، لەوێوە بەرەو "ئیسپارتە" پاشان بەرەو بارلا ،گوندی خەمەکان.. ئەو گوندەی کە یەکەم شەبەقی بزوتنەوەی نووری بەخۆوە بینی.. ئەو گوندەی کە ٢٥ ساڵ لەوەوبەر بە دوورخراوی و دەستبەسەری هێنایان بۆ ناوی! هەربۆیە خوای باڵادەستیش فەڕ و بەرەکەتی خستە ناو ڕۆژەکانی ئەو گوندەوە و دەنگیاندایەوە. ئەوەتا ئێستا بە ئازادی و سەربەستی دەگەڕێتەوە ناوی و لە ڕۆژێکی بەهاریی جوان و ڕوون و سازگاردا، مژدە و بەروبوومی سەرکەوتنی بە دیاری بۆ بارلا و دانیشتوانەکەی هێنایەوە.

هەموو گوندەکە بە پیاو و ژن و منداڵەوە هاتنە دەرەوە بۆ پێشوازیکردنی..! هەر هەموویان هاواریان دەکرد، وەك بڵێیی بڕوا بە چاوەکانیان نەکەن: مامۆستا هات.. مامۆستا هات.. دەیان کوڕی گەنج بە پەرۆشەوە پاڵ پاڵێنیان دەکرد هەتا بگەنە لای.. ئەوان پێشتر چاویان پێ نەکەوتبوو، بەڵام مێشکیان پڕبوو لە بەسەرهاتە سەیر و سەرنجڕاکێشەکانی، ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی کە

لە شەوانی دوور و درێژی زستاندا دایك و باوكیان لەپاڵ ئاگرداندا بۆیان گێڕابوونەوە! بیست ساڵ لە بەندكردن و نەفی كردن لە دوای "بارلا" زامنی دەركەوتن و هاتنە دنیای نەوەیەكی نوێیە لە گەنجان، ئەوانەی پاش ڕۆیشتنی ئەو، یان كەمێك پێش ڕۆیشتنی لەدایكبوون! ئەوەتا ئەمڕۆ ئەو گوندە هەر هەمووی بە پیر و لاوەوە بووەتە قوتابخانەیەكی نووری مەزن و سەرلەنوێ پێشوازی لە مامۆستاكەی دەكاتەوە!

ئەوجا مامۆستا ڕووی كردە ئەو خانووەی كە هەشت ساڵی تەواو لەئامێزی گرتبوو. ئەو خانووە خنجیلانە هەژارانەیەی كە یەكەم قوتابخانەی نوور بوو. پێش ئەوەی بگاتە مەنزڵی ڕستنی خەونەكانی، بە بەردەم ماڵی قوتابی دێرینی، "مستەفا چاووش"دا تێپەڕبوو، ئەو دارتاشە دڵسۆزەی كە سەكۆی سەر درەختەكەی بۆ دروستكردبوو، قوفڵێكی گەورەی بەسەر دەرگای ماڵی قوتابیە بەوەفاكەیەوە بینی، مەگەر ساڵی ١٩٣٧ی زایینی، لەو كاتەدا كە مامۆستا لە مەنفای "قەستەمۆنی" بووە، چاوش كۆچی خانەی جاویدانیی كردووە. ئیتر بێنەوەی هەست بە خۆی بكات لە كەشێكی كشوماتدا بەخوڕ فرمێسك لە چاوانیەوە دەهاتە خوار!

ئاخ و داخ بۆ ئەو ڕۆژانە مستەفا چاووش..! بەجێت هێشتین و بۆمان نەكرا خواحافیزیت لێبكەین، نە بە نوێژێك لەسەر تەرمەكەت نە بە وتەیەك! دەسا ڕەحمەتی خوات لێبێت، دیسان ڕەحمەتی خوات لێبێت! ئەگەر ئومێدمان بەیەك گەیشتنەوەی هەتا هەتایی نەبوایە، ئەوەندە بۆت خەمبار دەبووین، هەتا دڵمان لەتوپەت دەبوو!

................

پاشان گەیشتە خانووە دێرینەکەی خۆی، بینی وەکو خۆی ماوەتەوە، چونکە خەڵکی "بارلا" وەکو وەفایەك بۆ مامۆستاکەیان سووربوون لەسەر ئەوەی چۆن بووە، وەها پارێزگاری لێبکەن، درەختە خۆشەویستەکەی بینی هێشتا وەکو جاران بەپێوەیە و بە خۆشحاڵییەوە لەبەردەمیدا ڕاوەستاوە و بەخێرهاتنەوەی دەکات، لقە گەورەکانیشی لەبەردەستیدا شۆڕبوونەتەوە، وەك بڵێی بۆ دەستلەملانێکی هەمیشەیی بانگی دەکەن!.. دەروونی بە هەست و سۆز و خەمەکان هاتە جۆش، داوای لە خەڵکەکە کرد بە تەنیا جێیبهێڵن.. سەرجەم خەڵکەکە بەبێ دەنگی و لەسەرخۆ گەڕانەوە دواوە، بەڵام ئەو چەند هەنگاوێك چووە پێشەوە.. سنگە لاوازەکەیدا بەسەر قەدی دارە مەزنەکەدا و بە هەردوو دەستی باوەشی پێداکرد، هاوشێوەی ناڵە و گریەی کۆترەدارەکە بۆ سەرداری مرۆڤایەتی. خەریك بوو هەنسکە پچڕپچڕەکانی هەناسەی گڕگرتووی بتاسێنن!

ئەدی باشە ئەم درەختە بەشێك نیە لە مێژووی ژیانی ئەو؟ ئایا خەڵکی دەریاننەکرد کەچی ئەم داڵدەیدا؟ هەموو شتێکیان لێ دانەڕنی و ئەم پۆشتەی کرد و بووە بەرگ بۆی؟ دواتر مەگەر ئەوان پشتیان تێنەکرد و ئەم دڵی دایەوە؟! کەواتە ئاساییە دۆستایەتییەکی دڵسۆزانە و برایەتییەکی بەوەفایانە و خۆشەویستییەکی بەتین لەنێوانیاندا دروست ببێ! ئایا هەر ئەو درەختە نەبوو چەندەها شەو و ڕۆژ بەشداری لە زیکرەکانیدا دەکرد؟ چەندە موناجاتەکانی ئەوی لە شەوانی تاریکدا دووبارەدەکردەوە و خەڵکیش لەگەرمەی خەودا بوون! چەند جار بەگەڵا سەوزەکانی فرمێسکەکانی دەسڕی! چەند جار بە شەونمەکەی ڕوومەتی تەڕدەکرد و فرمێسکەکانی لەگەڵ فرمێسکەکانی ئەودا تێکەڵ دەبوون؟! برایەتی خستە نێوان ئەو و باڵندەکانەوە، بە جۆرێك ئیتر لێی هەڵنەدەهاتن و لە ترسی ئەو نەدەفڕین! وەکو بڵێی یەکێکە لە جۆرەکانی ئەوان! لەو درەختەوە فێری

قسەی باڵندە و زمانەکانی با ببوو، لێیەوە وانەکانی ئارامگرتنی بە هەموو جۆرە دەروشانەوەکانیەوە لەنێوان زستان و هاویندا وەرگرت!

دوای ئەوە چووە ناو ماڵەکەیەوە و لەوێوە سەرکەوتە سەرەوە بۆ ناو سەکۆکەی، لەناو چلۆپۆپی چرپی کۆنە چناردا بیرەوەرییەکانی ئەو ڕۆژانەی دەهێنایەوە یادی خۆی کە لێرەدا بەسەری بردبوون، لەگەڵ هەڵدانەوەی هەر لاپەڕەیەکیش لە لاپەڕەکانی ڕۆژانی ڕابردوو، ئەشکی گەشی هەڵدەڕشت. لەولاشەوە خۆشەویستانی مامۆستا بۆ هەر فرمێسکێکی ئەوینداری ڕاستەقینە سەدان فرمێسکیان دەوەراند.

هەنسکەکانی مامۆستا ئاوێتەی دوو هەستی جیاواز بوون: لە لایەکەوە هەستی خەم و پەژارەی تێپەڕبوونی ڕۆژانی ڕابردوو، و ڕۆشتنی وانە نوورینەکانی شەوانەی ئەم ئاوادانییە دوور و دابڕاوە لە جیهان و، ئەو فەتح و سەرکەوتن و بەرەکەتەی کە پەروەردگار لە چیاکانیدا ڕشتی بەسەریدا و، ئەو نووسینانەی کە لەم کەشوهەوا پاك و سازگارەدا نووسینی و، هەموو ئەمانە لەگەڵ ماڵئاوایی زۆرێك لە هاوەڵ و قوتابییانی، لەوانەی پێشیکەوتن بۆ جیهانی دوارۆژ. لە لایەکی تریشەوە هەستی شادومانی و شوکرانەبژێری لەسەر بڵاوبوونەوەی بانگەوازی نوور لە هەموو شوێنێکداو ئەو سەرئەنجام و پاشەڕۆژەی کە بەهۆی -دوورخستنەوەی بۆ ئەم گوندە مویارەکە- ئەوەتا ئەمڕۆ ئەو دەگەڕێتەوە بۆ بارلا و پەیامەکانی نووریش سەربەست و ئازادن، نە ئەوەیە یاساغ بن، نە ئەوەشە دەستیان بەسەردا بگیرێت! لەکاتێکدا بیست ساڵ پێش ئێستا هەر لەم شوێنەدا بە شاراوەیی لە نێوان لقوپۆپی درەختەکاندا دەینووسینەوە! پاش نووسینەوەش ڕەشنووسەکانی دەنارد بۆ قوتابییەکانی -کە ژمارەیان زۆر کەم بوو لەو کاتەدا- تا لە هەناوی تاریکیدا لەسەری بگرنەوە و بە پەنهانی بیگەیەننە دەست شار و دێهاتەکانی دیکە!

ئەوجا دەریاچەی دڵڕفێنی "ئەگریدەر"ی بیرکەوتەوە، بە هێمنی بەرەو لای شۆڕبووەوە، دەتوت لەسەر ئاوازی پەژارە ڕێ دەکات.. هەتا گەیشتە ڕۆخە خەیاڵبەرەکەی. ئینجا بەرەو رووی هەنگاوی نا، بەجۆرێك، یەکێك بیبینیایە وایدەزانی دەیەوێت باوەش بکات بە ئاوەکەیدا!.. بۆ چەند ساتێك پێیەکانی لەناو شەپۆلە سازگارەکەیدا نقوم کرد.. ئەوجا بە خشوعەوە کەوتە هاتوچۆ بە ڕۆخەکەیدا. دوای ماوەیەکیش لە تێڕامان کە لە دەرەوەی چوارچێوەی کاتدا بەدەم پیاسەوە بەسەریبرد، ئاوڕی دایەوە بۆ لای هەردوو قوتابیی دڵسۆز و بەوەفای؛ زوبێر و مستەفا سنگور و، بە دەنگێك کە دیاربوو هەناسەیەکی قووڵ هەڵیگرتووە، وتی:

"لێرە، ئا لەم شوێنەدا، نزیکەی سی ساڵ لەمەوبەر، لە هەمان ئەم وەرزەدا و، لە دەمی پشکوتنی گوڵی چوالە و هەنار و درەختەکاندا، لەنێوان ئەو باخ و بێستانە دڵڕفێن و ئەم دەریاچە سازگار و شیرینەدا دەسووڕامەوە، دەمێك سەرنجی ئاوە شینەکەم دەدا و لێی ورددەبوومەوە، دەمێکیش سەرنجی ئەو قەدپاڵە سەوزانەم دەدا، ئیتر حەقیقەتی حەشر و زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەتم هاتەوە یاد، پاشان لێشاوی ڕاستییەکانی دواڕۆژ بە توندی لە دڵ و مێشکمدا خولانەوە!.. لەبەرئەوەی لەو ڕۆژەدا تەوژمە مولحیدەکان وایان دەبردە مێشکی قوتابییانی قوتابخانە و زانکۆکانەوە، گوایە حەشر و زیندووبوونەوە تەنها ئەفسانەی کۆنە و هیچ بەڵگەیەکی ژیری و کارەکی پشتی ناگرێت! دڵم هاتە کوڵ و تاوی سەند.. نەمزانی چۆن درەختی مەزنی ئەم ئایەتە قورئانییە لە دڵمدا قنج بووەوە کە دەفەرموێ:

﴿ فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ (الروم: ٥٠)

**واتــه: ئینجــا ســەیری ئاســەواری (پەیدابــوان بــە) بارانــی خــوا بكــە (وەك كشتوكاڵ و گژوگیا و درەخـت) چـۆن زەوی زینـدوو دەكاتـەوە دوای مـردن و وشـك بوونـی، بەڕاسـتی هـەر ئـەو خوایـە زیندووكـەرەوەی مردووانیشـە و هـەر ئەویـش بەدەسـەلاتە بەسـەر هەمـوو شـتێكدا.**

ئیتر بەرەو نووره پرشنگدارەكانی كێشكرام و، بەدەنگی بەرز دەستمكرد بە دووبارەكردنەوەی، لە جۆش و خرۆشێكی ڕۆحیی گەورەدا نزیكەی چل جار دووبارەمكردەوە..! لە مەستی و چێژێكی ڕۆحی قووڵدا، وەكو شێت ئەمسەر و ئەوسەرم دەكرد و ڕۆخی دەریاچەكەم بە هەنگاوەكانم دەپێوا، دڵم پڕبوو لە ڕاستییەكانی ئەم شایەتە مەزنە، بەجۆرێك پێشتر شتی وام بەبیردا نەهاتبوو! پاشان ختوورەكان یەك لە دوای یەك ڕژان بەسەر ڕۆحمدا، منیش بە پەلە دەمخوێندنەوە بەسەر قوتابیە بەوەفاكەی نوور "تۆفیق شامی"ی حافظ دا و ئەویش خێرا دەینووسیەوە، ئەوەش بووە "پەیامی حەشر".. یەكەمین پەیام لە "سەرجەم پەیامەكانی نوور"!

ئەوەی وت و، چاوەكانی پڕبوون لە فرمێسك..! پاشان دەستیكردەوە بە قسەكردن و وتی:

بەڵێ، دۆست و خۆشەویستەكانم..! لەڕاستیدا من لەم شوێنەدا لەدایكبووم، بۆیە لێمببورن، ئەگەر لەبەر خەم و پەژارە خۆم پێ نەگیرابێ دەروونم هاتبێتە كوڵ !..

پاشان بێدەنگ بوو، بە هێواشی هەنگاوی نا و بە ڕێگای نووردا ڕۆیشت..

## مەقامی وەسیەتنامەكان: هێماكانی كۆتایی ڕێگا

### هێمای یەكەم: ساڵی ١٩٥٦ی زایینی: جەژنی پەیامەكانی نوور

ماوەی نیو سەدەیە نوورسی جۆرەها ئازار و مەینەتی دەچێژێ، هەموو ئەوانەش لەپێناو تەنها یەك شتدا، ئەو شتەش بریتیبوو، لە ئازادی وشە! نیو سەدەیە جریوە و ئاوازەكانی لە درەختێكەوە بۆ درەختێكیتر و، لە تەپۆڵكە و بەرزاییەكەوە بۆ تەپۆڵكە و بەرزاییەكانی تر دەفڕێنی.. نیو سەدەیە ئەو لە بەرامبەر پیلانەكانی ستەم و زۆرداری و تارماییەكانی تاریكیەوە جیهاد دەكات. هەر لە سەردەمی یەكەم و، ڕۆژانی دەسەلاتی كارتۆنیی سوڵتانەكان و زاڵبوونی ئیتتیحادییەكان بەسەر بڕیارەكانی كۆشكدا، هەتا سەردەمی كۆماری و ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیاندا، بەڵام بە ناوی دەوڵەت و یاساوە! ئاشكرایە بەدیعوززەمان تەنها لەپێناو گەیاندنی بەلاغی قورئان و بڵاوكردنەوەی كەلیمەی نووردا هەوڵیدەدا.. ئای كە ناخۆشە قەلەڕەشەكان یەكبگرن لە دژی چۆلەكەیەكی بچووك تەنها لەبەرئەوەی بە ئارەزووی ئەوان ناخوێنێت.. پەنجا ساڵی ڕەبەقە بە شێوەیەكی ترسناك و دڕندانە دوایدەكەون و ڕاویدەنێن! چۆلەكەكەش لەو پێناوەدا جیهاد و تێكۆشانی كرد، هەتا خوا فەرمانی بە خۆر كرد سەرلەنوێ هەڵبێت، قەلەڕەشەكان ماندووبوون، بەڵام چۆلەكەكە ماندوو نەبوو.

"ئەمڕۆ جەژنی پەیامەکانی نووره..!" بەم شێوەیە بەدیعوززەمان هاتە قسە، لەدوای دەرچوونی بڕیاری دادگای ئافیۆن بە هەڵگرتنی سانسۆر لەسەر پەیامەکان و، ڕێدان بەچاپکردن و بڵاوکردنەوەیان، قوتابیانی نوور قۆڵیان لێ هەڵکرد و، چاپخانەکان لە هەریەکە لە ئەستەمبووڵ و ئەنقەرە و سامسۆن و ئەنتاڵیا چالاکانە کەوتنە جموجووڵێکی بێ وچان لە چاپکردنی پەیامەکان. ڕەشنووسەکان دەهێنران بۆ مامۆستا، تاکو هەڵەچنیان بکات، گیان و بوونی پڕدەبوو لە خۆشی و دەیوت: "ئەمە جەژنی پەیامەکانی نووره..! ماوەیەکی زۆره چاوەڕێی ئەم ڕۆژە مەزنە دەکەم! ئیتر ئەرکی سەرشانم تەواو بووە، کەواتە ڕۆڵەکانم، بەم نزیکانە کۆچ دەکەم..!" بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور، بووە هێمایەك لە هێماکانی سەر ڕێگەی نوور، بەهۆیەوە نەوەکان لە دوای بەدیعوززەمان ڕێگەیان پێ دەدۆزیەوە.

## هێمای دووەم: سیاسەتێک سیاسەت بەڕێوەدەبات و خۆی بە سیاسەتەوە خەریک ناکات!

"سیاسەت"..! ئەو وشە بریقەدار و، خاوەن چەندین ڕەنگ و ڕووناکیەی کە هەموو شتێك ڕادەکێشێت بە لای خۆیدا! پەپولە و کوللە و سیسیرك و تەنانەت جۆرەها دووپشکیش. چل ساڵە "سەعیدی نوێ" دژیایەتی ئەو وشەیە دەکات و دروشمە بەناوبانگەکەی ڕادەگەیەنێ: "أعوذ بالله من الشيطان و من السياسة!".. بەوەش گەورەترین قەڵای بەڕووی سیاسەتدا بنیات نا! ئەوەتا ئێستاکەش کۆتا هێمای بۆ دادەنێت: نوور ڕێگا بۆ سیاسەت ڕوون دەکاتەوە و شانەخرێی لەگەڵدا ناکات و تەنگی پێهەڵناچنێ، ئەوەش بە کردارە ئیجابی و

حەکیمانەکەی لە مومارەسەکردنی مافی خۆی لە دەنگداندا، ئەمە لەکاتێکدا خەڵکی وا گومانیان دەبرد کە دوورکەوتنەوەی بەدیعوززەمان لە سیاسەت، شێوەیەکە لە پەیوەندی پچڕاندن و مامەڵەنەکردنی ڕەها لەگەڵیدا. هەربۆیە لەپێناو ڕاستکردنەوەی ئەو گومانەدا بەدیعوززەمان لە کۆتایی تەمەنیدا کاتێك هەڵبژاردنی گشتی لە تورکیا ساڵی ١٩٥٧ی زایینی ئەنجامدرا، هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵك هەتا سروودی ئازادی بڵێتەوە. لەو سەردەمەدا دوو پارتی سەرەکی لە گۆڕەپانی سیاسەتدا لەسەر دەسەڵات پێشبڕکێیان دەکرد، پارتی دیموکراتی و پارتی گەلی کۆماری، لەگەڵ چەند پارتێکی بچووکدا، کە کاریگەرییەکی وایان لەسەر ڕەوتی هەڵبژاردنەکان نەبوو. هەرچەندە پارتی دیموکراتی پارتێکی ئیسلامی نەبوو، بەڵام ئەو کەشە ئازادییەی کە لە دوای هاتنە سەر دەسەڵاتی ئەو پارتە باڵی کێشابوو بەسەر تورکیادا و پاشەکشێکردنی شەپۆلی دژایەتیکردنی بەرامبەر ئیسلام، وای لە مامۆستا سەعیدی نوورسی کرد -کە پەیوەندی بە ژیانی سیاسی و حزبیەوە پچڕاندبوو- دەنگی خۆی بدات بە پارتی دیموکراتی، هەتا ڕێ بگرێت لەوەی پارتی گەل بێتە سەر دەسەڵات.

ئەوە هێما و نیشانەیەك بوو، لە هێماکانی بزوتنەوەی نوور: هێمنانە دروستکردنی ڕای گشتی ئیسلامی بە شێوەیەکی هێمنانە، لەڕێی پەروەردەی ئیمانیەوە، هەتا ئەگەر بەروبوومەکە پێگەیشت پێویستە تای تەرازووی خێر قورس بکرێت، یان پاڵ بە شەڕ و خراپەوە بنرێت، بە شەڕ و خراپەیەکی لەو کەمتر.

## هێمای سێیەم: ڕوانینی حەرام بەرەکەت ناهێڵێت!

بەڵێ، براکانم وەك چۆن ئاگرێکی بچووك، ئەگەرچی دەنکە شقارتەیەکیش بێ، دارستانێکی مەزن و چڕوپڕ دەسوتێنێ و دەیکات بە خۆڵەمێش، ئاواش ڕوانینی حەرام بەرەکەتی ئیماندار ناهێڵێت و کەم کەم پاداشتی کارەکانی ڕۆژانەی لەناودەبات و هیچ نوور و ڕووناکییەکی بۆ ناهێڵێتەوە!.. دەترسم لەوەی سەرەنجامەکەی بە خراپە بگەڕێ!

## هێمای چوارەم: ئەوەی ڕوون و بێگەردە وەریبگرە و ئەوەیش لێڵ و لێخنە وازی لێ بێنە..!

دەنکە تۆوێك لەڕاستی خەرمانێك درۆ لەناو دەبات، یەك حەقیقەت قەڵایەك لە وەهم و خەیاڵ دەڕوخێنێ..! چونکە ڕاستگۆیی و ڕاستی بناغەیەکی مەزن و ناوەڕۆکێکی ڕوون و ئاشکرایە. ڕەنگە ڕاستی لەبەر بێدەنگبوونی شوێنی خۆی چۆڵ بکات، چونکە مافی ئەوەت نیە هەرچی ڕاستە بیڵێی، لە حاڵێکدا ئەگەر درکاندنی زیانی لێدەکەوتەوە. بەڵام بە هیچ جۆرێك ڕێگە بە درۆ نادرێت، ئەگەرچی وا گومانیش ببرێ کە سوودی تێدایە! لەبەرئەوە ئەو بناغەیە بکە بە یاسا بۆ خۆت، کە دەڵێت: "ئەوەی ڕوون و بێگەردە وەری بگرە و ئەوەیش کە لێڵ و لێخنە وازی لێبێنە!" بە جوانی سەیربکە بیرت جوان دەبێت، گومانی چاك ببە دەبینی ژیان بەتام و جوانە، لەڕاستیدا ئەو ئومێدەی کە لەناو گومانی باشدایە ژیان دەکات بەبەر ژیاندا! بێگومان من ئەگەر چووبێتمە ناو باخێکەوە تەنها میوە و بەری چاك و جوانم لێکردووەتەوە، وە ئەگەر چاوم بە میوەیەکی ڕزیو کەوتبێ وازم لێهێناوە و، دەستم بە بنەمای

”ئەوەی ڕوون و بێگەردە وەریبگرە، ئەوەشی لێڵ و لێخنە وازی لێبێنە“وە گرتووە.. من بەم جۆرەم، ئومێددەکەم خوێنەرەکانیشم بەمجۆرەبن..!

دەسا ئەی کوڕی خۆم..! ئەمە ژیانە و لەبەردەمتدایە.. ئەمانەش پەیامەکانی نوورن و لەبەر دەستتدان.. کەواتە ئەوەی ڕوون و بێگەردە وەری بگرە و ئەوەیش لێڵ و لێخنە وازی لێ بێنە..!

## هێمای پێنجەم: سەردانەکانی خۆشەویستی

ئەو درەختەی کە لە ژینگەیەکی وشك و بێ باراندا دەنێژرێت و ئاو نادرێت، دەمرێت. هەرچەندە ئێستا پەیامەکانی نوور لە هەموو شوێنێکدا هەن، کەچی بەدیعوززەمان هێمای "سەردانەکان"ی دەکردە یاسا و ڕێباز بۆ قوتابییەکانی. بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی قوتابخانەکانی نوور و تۆوی شەتڵەکانیان -ناوبەناو- بەرەوە ئەملا و ئەولا دەچوو. چونکە پەیام دەبێت پەیامبەری هەبێت و بۆ خۆی پرشنگی پەیامەکە لەناو خەڵکیدا هەڵبگرێت و، لە حاڵ و درەوشانەوەکانی ئەودا حەقیقەتی پەیامەکە ببینن، ئەگینا پەڕە کاغەزەکان بە کەڵەکەکراوی لەسەر ڕەفەکاندا دەمێننەوە، بەڵکو ژیانی وشەکان بەستراوە بە ژیانی مەعنەویی خاوەنەکانیانەوە، بۆیە نوورسی لە کۆتا ساڵەکانی تەمەنیدا دەستیکرد بە گەشتێکی بەسەرکردنەوە بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵات، هەتا سپاردەکە ڕادەستی نەوەی نوێ بکات و، ئەوەش ڕوونبکاتەوە، کە نابێ نەمامەکان پشتگوێ بخرێن. ئەگەرچی قیامەتیشیان بەسەردا هەڵسێت.

ئەو کاتەی کەوتە ڕێ بۆ دواین گەشتی بەسەرکردنەوە تەمەنی لە هەشتا

ساڵ ترازابوو، لەو ساتەدا ماڵئاوایی لە کۆتا ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٥٩ی زایینی دەکردو، پێشوازی لە سەرەتای ساڵی١٩٦٠ی زایینی، واتە کۆتا ساڵی تەمەنی خۆی دەکرد، وەکو بڵێی لە چەند گەشتێکی خێرا و یەك لە دوای یەکدا بیەوێ ماڵئاوایی لە قوتابییان و خۆشەویستانی بکات. پۆلیسیش لەولاوە شێتانە دوای کەوتبوو لە نێوان "ئەنقەرە" و "ئەمیرداغ"، پاشان "قۆنیا" و "ئەستەمبووڵ"دا بەوردی چاودێرییان دەکرد، دوو ڕۆژ لە ئەستەمبووڵ مایەوە، پاشان جارێکی تر گەڕایەوە بۆ "ئەنقەرە"، لەوێ "دوایین وانە"ی بە قوتابییەکانی وتەوە، پاشان پەیامنێری ڕۆژنامەی "تایمز"ی لەندەنی چاوپێکەوتن و لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆژنامەوانی دوور و درێژی لەگەڵ ئەنجامدا. ئەوجا گەڕایەوە بۆ "قۆنیا" و هەر ئەو ڕۆژەش ڕووی کردە "ئیسپارتە". ئەم سەردانە ناحەزانی سەغڵەت کرد و جارێکیتر شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی ترسیان لێ نیشتەوە، بۆیە خێرا هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی توندیان لە دژی دەستپێکرد. بۆیە هەر لەگەڵ گەڕانەوەیدا بۆ "ئەنقەرە" بەرپرسان پێیان ڕاگەیاند باشتر وایە لە "ئەمیرداغ" بمێنێتەوە. مامۆستاش گەڕایەوە بۆ ئەمیرداغ، بەڵام داوای لە کاربەدەستان کرد ڕێگەی بدەن مانگێك لە ئەمیرداغ و مانگێکیش لە ئیسپارتە بمێنێتەوە. هەر لەو ماوەیەدا دەرفەتێك هاتە پێش و توانی سەردانی شاری ئافیۆن بکات.

## ئامازەکانی وانەی کۆتایی

ئەمـرۆ "ئەنقـەرە" بازنـەی خـۆر کۆتایـی پێدەهێنێت و، وێنـەی دوایـن تیشـك دەکێشێ.. شاگردانی لـە دەوری تیـرە پرشنگدارەکەیدا ئەڵقەیان بەستووە، دڵۆپ دڵۆپ ئـارەق لـە نێوچەوانـی دەتکـێ.. ئەمـە کۆتـا بریسـکانەوەیە، ئـەو ئێستا بـە دوو لێـوی لەرزۆکـەوە بازنەکـە دەنەخشـێنێ بۆئـەوەی ببێتـە دوایـن کاشـیی ڕەنگاوڕەنـگ بـۆ پەیامەکانـی نـوور و، چەنـد چرایـەك تاوەکـو ئەوپـەڕی ڕێـگا ڕوونـاك بکەنـەوە. بـەو ئومێـدەی پرشـنگەکانی لـە چـاوی بەرەکانـی ئاینـدەدا بدرەوشـێتەوە و لـە گلێنـەی چاویانـدا بیپارێزرێـن، سـا بەڵکـو ببێتـە بەربەسـتێك بە ڕووی پەلکێشـکاریە فریودەرەکانـی سـەردەم. وشـەکان وەکـو بارگـەی کارەبایـی دەباریـن بەسـەر ئامادەبووانـی کۆڕەکـەدا کـە بـە ئەوپـەڕی ئـەدەب و ملکەچییـەوە ئامـادەی وەرگرتـن بـوون:

برا بەڕێزەکانم..!

ئەرکی سەرشانی ئێمە کاری ئەرێنی بنیاتنەرە، نەك کاری نەرێنی ڕووخێنەر.. ئێمـە لـە بەرامبـەر هـەر جۆرە تەنگانـە و ناڕەحەتییـەك، کـە ڕووبەڕوومـان دەبێتـەوە ئەرکـی خۆڕاگـری و شـوکرانەبژێریمان خراوەتـە ئەسـتۆ، ئـەوەش بـە ئەنجامدانـی ئـەو خزمەتگوزاریـە ئیمانیـەی کـە ئاسـایش و ئارامـی لـە ناوخـۆی وڵاتـدا بەرهەمدێنـێ.

بەڵێ، ڕێبازی ئێمە هێزی تێدایە، بەڵام تەنها بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایش، ناوخۆ، یان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشە دەرەکییەکان ئەو هێزەمان بەکارهێناوە. گەورەترین مەرجەکانی جیهادی مەعنەوی بریتییە لە خۆهەڵنەقورتاندن لە کار و فرمانی خواییدا، واتە لەو کارانەدا، کە هی خوای گەورە خۆیەتی و بە ئێمەی نەسپاردوون.

براکانم! نەخۆشیەکەم زۆری بۆهێناوم.. ڕەنگە بەم نزیکانە بمرم، یان بەیەکجاری نەتوانم قسەبکەم. هێرش مەکەنە سەر ئەو زانایانەی کە هەندێ لەو شتانەی کە کاری ناچارین لەم سەردەمەدا ئەوان بە "زەروورەت"یان دەزانن و، لایەنی بیدعەتیان گرتووە. ئێوە بەرەنگاری ئەو هەژارانە مەبنەوە..! چونکە ئێمە هێزی خۆمان لەناوخۆدا بەکارناهێنین...

ئێمە ئاوڕ لە دنیا نادەینەوە، خۆ ئەگەر سەیری دنیاشمان کرد، ئەوا تەنها لەپێناو یارمەتیدانی خەڵکەکەیەتی، لەبەرئەوە ئێمە چاوپۆشییان لێدەکەین ئەگەرچی ستەمیشمان لێبکەن. ئاشکرایە، کە دیموکراتەکان دژایەتی ئاین ناکەن، بۆیە پێویستە لەسەر برایانی دواڕۆژم چاوپۆشی بکەن لە هەڵەکانیان و هێرش نەکەنە سەریان و، لەپێڕی "أهون الشرين" دا واتە: (سووکەڵەترین زیان) دا دایانبنێن و، هەمیشە بە کاری ئەرێنی هەڵبستن، چونکە کاری نەرێنی ئەرکی سەرشانی ئێمە نیە. ئینجا لەبەرئەوەی بەشێك لە سیاسەتمەداران زیان بە پەیامەکانی نوور ناگەیەنن، بەڵکو کەمێکیش چاوپۆشی دەکەن، ئەوا بەچاوی "أهون الشرين" سەیریان بکەن و، لەپێناو خۆڕزگارکردن لە زیانە گەورەکەیان، ئێوە هەرگیز زیان بەوان مەگەیەنن، بەڵکو هەوڵبدەن سوودیان پێ بگەیەنن.

براکانم! ڕەنگە بەم نزیکانە بمرم.. دەبێ ئێوە وریای خۆتان بن! بێگومان

ئەم سەردەم و ڕۆژگارە پەتایەکی هێرشبەری تایبەت بە خۆی هەیە، ئەویش خۆویستیە! یەکەمین وانەی نوور، کە لە قورئانی پیرۆزەوە وەرمگرتووە، بریتییە لە دەستبەرداربوون لە خۆویستی، چونکە بە ئیخلاسێکی ڕاستەقینە نەبێت ئیمان ڕزگار ناکرێت.. مادەم ڕێبازی ئێمە لەسەر بناغەی ئیخلاسی تەواوەتی دامەزراوە، ئەوا پێویستە نەك تەنها قوربانی بە منێتی و دەماری خۆپەرستی بدرێت، بەڵکو تەنانەت ئەگەر هەموو سەروەت و سامان و دەسەڵاتی دنیاشتان بدرێتێ، دەبێ ئێوە فەزڵی تەنها یەك حەقیقەتی ئیمان بدەن بەسەر ئەو دەسەڵاتەدا!

چاوەکان بە نوور داگیرسان، هاتنە دەرەوە و بەنێو کوچە و کۆڵانەکاندا مژدەی سەرکەوتنێکی مەزنیان دەدا.. "ئەنقەرە" بەبۆنەی دواهەمین وانەوە ئاهەنگ دەگێڕێ، ئەوە سەرکەوتنێکی ئاشکرا بوو بۆ پایتەختی تارماییەکان "ئەنقەرە"، ئەو شارەی کە نزیکەی نیو سەدە دژایەتی نوورسی کرد! "ئەنقەرە" ئەم شارە سەرسەختە، ئەمڕۆ لەگەڵ "بارلا"دا لە کۆڕی دانیشتنی نوورسیدا پەیمانی برایەتی دەبەستێ. لەگەڵ "بارلا"دا، ئەو گوندە دوورە دەستەی کە یەکەمین لەدایکبوونی خۆری بەخۆوە بینی. ئەوەتا کۆمەکی و سەرکەوتن لەلایەن خواوە هات و دەرگای ئازادی خرایە سەرپشت، دەسا ئەی بەدیعوززەمان پەروەردگارت بە پاك و بەرز و پیرۆز ڕابگرە و سوپاس و ستایشی بکە و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، خۆت بۆ کۆچی یەکجاری ئامادەبکە..!

# مەقامی کۆچکردن

وەرزی بەهار بوو.. مانگی ئازاری ساڵی ١٩٦٠، لە شاری ئەمیرداغ، بە شێوەیەکی سەیر تەقە لە دەرگاکەی درا، ئەوە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، قوتابییانی نوور هەستێکی ئاوێتەیان لە ترس و ئومێد بۆ پەیدابوو، بای بەهاریی بە نێو درزی دەرگاکەدا دەنگێکی خەمناکی دەنارد، زیاتر لە دەنگی گریان دەچوو.. گەرچی مامۆستا هەستی بە نەرمە تایەك دەکرد کە کەم کەم بەناو جەستەیدا هاتوچۆی دەکرد، بەڵام هەروەك جاران گوێی پێ نەدەدا و، لەسەر ئامۆژگاریکردنی قوتابیە بەوەفاکانی بەردەوام بوو..

پاش چەند ڕۆژێك لە زۆران لەگەڵ "تا"کەیدا، نەخۆشیەکەی زیاتر زۆری بۆ هێنا، تەنانەت چەند جارێك لەهۆش خۆی چوو. شەو نیوەی ڕۆیشتبوو، قوتابییەکان بەنۆرە لە خزمەتیدا بوون و بە وردی چاودێری باری تەندروستی مامۆستاکەیان دەکرد، لە سەرەتای بەشی کۆتایی شەودا گڕی "تا"کە کزبوو، مامۆستا چووە ناو خەوێکی ئارامەوە، پاشان پێش نوێژی بەیانی لە خەو هەڵسا و دەستنوێژی هەڵگرت و جلەکانی خۆی گۆڕی، قوتابییەکان وایانزانی بە تەواوەتی لە نەخۆشیەکەی چاك بووەتەوە. بەڵام لە دوای ئەوەی لە نوێژەکە بووەوە هەموویانی بانگکرد، یەکەیەکە

خواحافیزی لێکردن و فرمێسکیش لە چاوانیەوە ڕێچکەی بەستبوو، پێی وتن:

- براکانم، بەخواتان دەسپێرم.. بەدڵنیاییەوە، من دەڕۆم!

من چ شتێکم لەم دونیایەدا ماوە، ئەوەتا هەشتا و سێ ساڵ تەمەنم لەبەرخۆم داماڵیوە!؟ کاتی ئەوە هاتووە دەست لە ئەرکی سەرشانم هەڵبگرم، ئیتر دەبێ کۆچ بکەم و بڕۆم.. ئەوە پەیامەکانی نوورە بێ کەموکورتی لەبەردەستاندان، کەوابێ چ پێویست بە من دەکات؟ ئەوە ئەو شتەیە کە ئەم هەموو ساڵە دڵم بۆی لێی دەدا، دەی وا ئێستا دەیخەمە بەردەستی ئێوە، دەسا وازم لێبهێنن با لە ناو گۆڕەکەمدا و لە جیهانی بەرزەخی جوان و ڕازاوەدا بۆ خۆم بحەسێمەوە!

بەلام ڕۆڵەکانم، وەسیەتی من بۆ ئێوە ئەوەیە، زۆریش جەختی لەسەر دەکەمەوە -کاتێك بەخاکتان سپاردم- جگە لە یەك دووانێکتان با کەسیتر شوێنی گۆڕەکەم نەزانێت..! سەرسوڕمان باڵی کێشا بەسەر ڕوخساری قوتابییەکاندا، خێرا یەکێکیان هاتە گۆ و دەنگیشی لە دەریای گریاندا هەڵدەگۆزی:

- مامۆستا، حیکمەت لەوەدا چیە؟ ئەدی بۆچی خەڵك سوودمەند نەبن لە سەردانی گۆڕەکەتان؟

مامۆستا بە زمانێکی پاراو لە بەیانکردنی حیکمەتی نوور بەردەوام بوو:

- "ئەو غەفلەت و بێئاگاییەی کە لەم سەردەمە دژوارەدا لە خۆپەرستی و خۆشویستنی زاتەوە سەری هەڵداوە، پاڵ بە خەڵکیەوە دەنێت بۆئەوەی بایەخ بە پلەوپایە و ناوبانگی دونیایی مردووەکە بدەن، هەروەك چۆن لە ڕابردوودا

فیرعەونەکان مردووەکانیان مۆمیا دەکرد و پەیکەریان بۆ دادەنان، حەزیان دەکرد سەرنجی خەڵکی بەرەو لای مردووەکانیان ڕابکێشن، لەبری سەردانی شەرعی و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا و بەدەستهێنانی پاداشتی دوارۆژ، سەرنجی خەڵکی بەرەو لای خودی کەسەکە دەچێت، وەك چۆن لە ڕابردوودا وابوو. لەبەرئەوە من وەسیەت دەکەم با کەس شوێنی گۆڕەکەم نەزانێت، بۆ ئەوەی نهێنیی ئەو ئیخلاسەی کە لە پەیامەکانی نووردایە، پارێزراو بێت.“

بەدرێژایی ژیانم پێداگریم دەکرد لەسەر ڕوونی ئیخلاس لە پەیامەکاندا، جا بۆیە نابێ لەدوای مردنم ئەو ئیخلاسە لێڵ بکەم!

مامۆستا دیسانەوە لە شوێنی خۆی ڕاچڵەکی، لوتکەی بڵندی چیاکانی ئەنادۆڵیش درەوشانەوە، یەك لە دوای یەك سێبەرەکانیان لە ئاسۆوە دەستیان کرد بەدەرکەوتن، وەکو چەند وێنەیەکی زیندوو دەهاتنە بەرچاوی بینەر. پاشان جارێکیتر چەخماخەیدا و، لە بەرزاییەکانی دەوروبەردا دەنگیدایەوە:

”ئەی سەعید... "صەعید" بە: واتە خاك بە، بۆ ئەوەی ڕوونی پەیامەکانی نوور لێڵ نەکەیت..!“

ئەوجا ئاوڕیدایەوە بە لای قوتابییەکانیدا و وتی:

دەسا لەسەر دەرد و بەڵا و کارەساتەکانی ڕۆژگار ئارام و خۆڕاگربن..! ڕەنگە چەند ڕۆژێك هەورەکان ڕووی ئاسمان بگرن، بەڵام لەمڕۆ بەدواوە تاریکی دەسەڵاتی نامێنێ.. کەمێك چاوەڕێ بکەن، چونکە میراتگری نهێنیەکە لەناوتاندا سەرهەڵدەدات و دەردەکەوێ، بێگومان من لە مێژە لەڕێی پەیامەکانی نوورەوە لەگەڵی دەدوێم.. من لە ڕابردوودا بووم.. ئەو لە داهاتوودایە، بەڵام

هەردووکمـان یـەک ڕۆحیـن، بەدڵنیاییـەوە مـن ئـەو دەبینـم، لەوێـوە دێـت، پاشـان دەستی درێژکرد و ئاماژەی بۆ ئاسۆی دوور کرد..!

سێبەرەکان بەرەو لای ئاماژەکە ئاوڕیان دایەوە و شتێکی سەیریان بینی! ئەسپەکان بـەرەو خۆرئـاوای وڵات بـە حیلـە حیـل غاریـان دەدا، لەنێـوان شـاری "ئەدیرنـە" و "ئیزمیـر"دا سمەکانیان چەخماخەیان لێدەدا و، فاتیح بووە سـەر دەسـتەی پێشـەنگی نـوور.. لاوێك بوو لـە سـەرەتاکانی تەمەنیدا، هەرچەنـدە هێشـتا ڕوخسـاری ئاشکرا نەبـوو، بـەڵام وێنەکـە بـەرەو ڕوویـان دەهـات، هەرکـە ملیـان درێژکـرد، بۆئـەوەی ڕوخسـاری ببینـن، بەدیعوززەمـان لـە شوێنی خۆی هەڵسـا و خۆی ئامادەکرد بـۆ ڕۆیشـتن، وێنەکـەش لـە ئاسـۆدا دیـار نەمـا و لەبەرچـاو ونبـوو، قوتابییەکانیـش هەموویـان لەگەڵیـدا هەڵسـان و بەسەرسـامیەوە لێیـان پرسـی:

بۆ کوێ؟

پەنجەی دەستی ڕاکێشا: بۆ ئیسپارتە!

دەسـتبەجێ ئوتومبێلەکـە بـەرەو ئیسـپارتە کەوتـەڕێ هەتـا گەیشـتە شـوێنی مەبەسـت. چەنـد ڕۆژێکـی تـری ڕەمەزانـی لـەوێ بردەسـەر، لـە نوێـژی عیشـادا پێشـنوێژیی بۆ قوتابییەکانـی دەکرد، پاشـان "طاهـری مۆتلۆی حافظ"ی قوتابـی هەڵدەسـتا و دەبووە پێشـنوێژ و بـە کۆمـەڵ نوێـژی تەراویحیـان دەکـرد. بەمجۆرە هەتـا دەی ڕەمـەزان، ئیتـر جارێکـی تـر "تا"کـەی سـەری هەڵدایـەوە و، جەسـتەی نەخۆشـی کەوتـەوە ناوجێگا و چەندیـن شـەو لەنێوان ئاگایـی و لەهـۆش خۆچووندا دەتلایـەوە.

ڕۆژێکیـان چاوەکانـی -کـە پیـری و نەخۆشـیان لەکـۆڵ نابـوو- کـردەوە، پاشـان بـە قوتابییەکانـی وت: دەڕۆیـن!!

یەکێکیان بە سەرسامیەکەوە، لێی پرسی:

- بۆ کوێ، ئەی مامۆستای ئێمە؟

لەکاتێکدا کە لەگەڵ "تا"کەیدا زۆرانی دەگرت، وتی:

- خێرا ئامادەبن بۆ ڕۆیشتن بەرەو"ئورفە"..!!

قوتابییەکانی لە ترسا شڵەژان..! ئورفە؟ ئاخر تەندروستی مامۆستا کەی بەرگەی سەفەرێکی وەها دەگرێ کە لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵاتی وڵات درێژدەبێتەوە! چۆن دەتوانێ بەرگەی ژاوەژاوی ئۆتۆمبێل و ناڕەحەتییەکانی ڕێگایەك بگرێت کە بیست و چوار کاتژمێر دەخایەنێت؟

هەندێکیان گومانی ئەوەیان برد کە ڕەنگە مامۆستا بەهۆی "تا"کەیەوە بزرکابێ چونکە ڕێی تێناچێت بەو حاڵە ناجێگیرەوە سەفەر بکات!.. ئوتومبێلەکە لەکارکەوتبوو، بۆیە بەجۆرێك ئەوەیان بۆ باسکرد سا بەڵکو بتوانن لە بڕیارەکەی پاشگەزی بکەنەوە. بەڵام ئەو یەکسەر وەڵامی دانەوە:

- ئوتومبێلێکیتر ئامادە بکەن! ناتوانین دوو سەد لیرە بدەین؟! ئەگەر پێویست بکات ئامادەم جبەکەم بفرۆشم! قوتابییەکان بۆیان دەرکەوت، مامۆستا بە تەواوەتی هۆشی لە جێگەی خۆی دایە، ئیتر جگە لە گوێڕایەڵی و بەجێهێنان چارێکی تریان نەما! یەکێك لەو قوتابییانەی لە خزمەتیدا بوو بە پەلە چوو ئۆتۆمبیلێك بەکرێ بگرێت، قوتابییەکان چوونە ژێر باڵی و هێنایانە خوارەوە.. دواجار ئۆتۆمبێل و سەرنشینەکانی: مامۆستا و سێ لە تایبەتمەندترین قوتابیە بەوەفاکانی "بایرام و حوسنی و زوبێر" بەرەو شاری پێغەمبەران، ئورفە، کەوتنە ڕێ.

* * *

خۆرهـەڵات..! ڕێـگای مـن بـەرەو ئاسـمان لەوێوەیـە، لەوێـوە هاتـووم و بـۆ ئەوێـش دەگەڕێمـەوە.. وادەی مـن لەگـەڵ فریشـتەی مەرگـی جوانـدا لەوێیـە، ئـای کـە ئـارەزووی نیشـتمانی پێغەمبـەران دەکـەم! خۆرهەڵاتـی ئەنادۆڵ -بەڕێزان- مەنزڵـگای ڕۆحەکانـە.. ئـەوێ شـوێنی جـودی نـووح و، گەورەبوونـی ئیلیـاس و، چاکبوونـەوەی ئەیوبـە (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) بـەڵام "ئورفـە" کـە لەسـەر سـنووری شـام چۆکـی داداوە، شـوێنی ڕەوانەکردنـی ئیبراهیمـی خەلیلـە (عَلَيۡهِ السَّلَامُ)، تیایـدا فێـری یەکەمیـن ئەمـر و نەهییـەکان بـوو، بـە ڕێکوپێکـی ئەنجامیـدان، بـە پلـەی ئەستێرە و هەسارەکاندا سەرکەوت، هەتا گەیشتە ناسینی پەروەردگاری! تیایدا مشتومڕی ژیرانـەی لەگـەڵ بێباوەڕاندا کرد و سـەرکەوتنی بەدەستهێنا، "فبهـت الـذی کفـر!" پاشـان "بت"ەکانی عەقڵ و "بت"ە بەردینەکانی شـکاند، پاشـان خرایـە نـاو ئاگـرەوە و ئەویـش بـە فەرمانـی کـردگار سـارد و سـەلامەت بـوو لەسـەری! ئەمـر و نەهـی خـوا هـات بـۆ گەورەمـان خەلیـل و بـووە ئیمـام و پێشـەوای ئورفـە، پاشـان نێـررا بـۆ میسـر و حیجـاز تـا لـەوێ ئەمـر و نەهییـەکان ئەنجـام بـدات و ببێتـە ئیمـام و پێشـەوای خەڵکـی بەگشـتی!

دەسـا ڕۆڵەکانـم، بەڕێکـەون، بەڕێکـەون! شـەبەنگەکانی نـوور بەڕێـوەن و لـە ئاسـمانەوە بـەرەو ئێـرە دێـن، فریشـتەکان لـەوێ کەرنەڤاڵێکیـان بـۆ پێشـوازیکردن لـە مـن ڕێکخسـتووە، خێـرا بـەرەو "ئورفـە" بەڕێبکـەون، ئەوانـە لـەوێ چاوەڕێـی مـن دەکـەن، ئیتـر نابـێ لـە وادەی بەفـەڕ و پیـرۆز دوابکـەوم!

# ڕاوەدوونانی مەحاڵ..!

ئەگەرچی ئەو تیمە سیخوڕەی کە چاودێریکردنی مامۆستای خرابووە ئەستۆ، هەموو شتێکی دەبینی و چاودێری ورد و درشتی بزاوت و جووڵەکانی دەکرد، کەچی نەیتوانی بزانێ مامۆستا و قوتابییەکانی بۆ کوێ ڕۆشتوون، لەبەر ئەوە بەرپرسانی ئاسایش ڕق و تووڕەییان هەڵسا و، یەکێك لە قوتابییەکانیان بانگ کرد بۆ بنکە و، دایانە بەر لێزمەی پرسیار:

لەبەرچی مامۆستاکەتان ڕۆیشت و ئێرەی بەجێهێشت؟ بۆکوێ ڕۆیشت؟ بۆچی ئێمەتان لەوە ئاگادارنەکردەوە؟

قوتابیەکە دانی نەنا بەوەدا بزانێ مامۆستاکەی بەرەو کوێ ڕۆیشتووە. وتی: ڕەنگە بەرەو "ئەگریدەر" چووبێت!

بروسکە و تەلەفۆن و هەموو جۆرەکانی پەیوەندی لەنێوان سەرجەم بنکەکانی ئاسایش لە تەواوی شارەکانی تورکیادا گرپیان گرت و ژمارە و ناونیشانی سەیارەکە درا بە هەموو بنکەکانی پۆلیس و خاڵەکانی پشکنین. سەرەڕای هەموو ئەم هەوڵانە هیچ شوێنەوار و جێپێیەکیان نەدۆزیەوە.. سەیرە! لەکوێ خۆی شاردەوە؟ دڵەڕاوکێ و نیگەرانیی بەرپرسانی ئەمنی باڵا تاوی سەند، وەزیری ناوخۆ بۆ خۆی دابەزی و هاتە سەرخەت، تاکو خۆی سەرپەرشتی

درندەترین شوێنکەوتن و بەدواداچوون بکات، بۆ پیرە پیاوێك، کە لە ژاوەژاوی خۆرئاوا دوور کەوتووەتەوە، بەڵکو بۆ خۆی بە تەنیا و بێ کەس بمرێت..! گەمژەیی و نەفامیی شێت بە هەموو لایەکدا پەلەقاژێی دەکرد و وەدووی مەحاڵ کەوتبوو، لە چەند هەوڵێکی نەزۆك و هیوابڕاودا دەیویست پیاوێك دەستگیربکات، کە بە شوێن مەرگی نارام و بێدەنگدا دەگەڕا! دەك دەستەکانت بشکێن ئەی تاریکی! ئەدی تارماییەکان چۆن دەتوانن ڕۆحەکان دەستگیربکەن!؟

ئوتومبێلەکە لە جیهانێکی تردا ڕێی دەکرد، تەپوتۆزی خاکی نبووەتی لە شەوی هیجرەتدا دەکرد بەسەر دەموچاوی بتپەرستاندا و، تۆز و غوبارە ناسکەکەی بووە:

﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴾

(یس: ٩)

**واتە: هەروەها بەربەستمان لەبەردەم و پشتیانەوە داناوە پەردەشمان داوە بەسەر چاویان دا بۆیە ئەوان (ڕاستی) نابینن.**

پێی وتم: کەشوهەواکەی بارانـاوی بوو، قوتابییەکان پاش ئەوەی چەند کیلۆمەترێك لە شارەکە دوورکەوتنەوە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی قوڕیان لە ژمارەی سەیارەکەدا!.. هەتا بە سەلامەتی گەیشتە شوێنی مەبەست. بەڵام هەر کە لە یەکێك لە ئۆتێلە بچووکەکانی شارەکەدا دابەزی، خێرا پۆلیس ئابڵوقەی شوێنەکەیان دا، بەرپرسەکان چوونە ژوورەوە و بۆ لای مامۆستا -ئەگەرچی لەناو جێگەدا کەوتبوو- یەکێکیان لێی نزیك بووەوە و بەزمانێکی زبر پێی وت:

- پێویستە لەسەرتان، هەر ئێستا ئەم شارە بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ ئیسپارتە، ئەمە فەرمانی خودی وەزیری ناوخۆیە!

بەدیعوززەمانیش خێرا وتی:

کاری ئێوە زۆر سەیرە..! من نەهاتووم بۆ ئورفە تا جێیبهێڵم. من هاتووم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی لێرە بمرم..! سەیری حاڵم ناکەن؟..

ئاوڕی دایەوە، بەلای قوتابییەکانیدا وتی:

- ئێوە حاڵی منیان بۆ ڕوونبکەنەوە..!

پیاوانی ئاسایش بۆیان دەرکەوت، قایلکردنی ئەم زانا نەخۆشە کارێکی مەحاڵە، بۆیە هەرسێ قوتابییەکەیان برد بۆ بنکەی پۆلیس هەتا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەنجامبدەن، لەوێ ئەم مشتومڕە نەزۆکە لەنێوانیاندا ڕوویدا:

- ئێوە بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟

- بۆ بەجێهێنانی فەرمانی مامۆستاکەمان!

- کێ ڕێگەی ئەوەی پێداون؟

- مامۆستاکەمان!

- هاوار بۆ ئێوە! مەبەستم ئەوەیە چ لایەنێکی فەرمی ڕێگەی پێداون؟

- ئێمە شوێنکەوتەی مامۆستاکەمانین، بێ چەند و چوون هەرچی بفەرموێ ئەنجامی دەدەین!

- بڵێن بە مامۆستاکەتان ئەمە فەرمانێکی توندە و لە کاربەدەستانی بالآوە هاتووە، پێویستە هەر ئێستا ئورفە بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ ئیسپارتە! ئەگەر بە ئوتومبێلەکەی خۆتان نەگەڕێنەوە، ئەوا ئێمە ناچار دەبین بە ئوتومبێلی فریاکەوتن بەڕێتان بکەین!

- وەك دەبینن مامۆستامان زۆر نەخۆشە و، دیسانەوە بەرگەی ناڕەحەتی سەفەرێك ناگرێت، کە بیست و چوار سەعات دەخایەنێت!

- دەبێ بگەڕێنەوە..! ئەمە فەرمانی جەنابی وەزیرە!

- ئێمە ناتوانین دەست لە کاری مامۆستاکەمان وەربدەین..! ئێوە خۆتان فەرمانەکەی بخەنە بەردەم، ئەگەر ئەو فەرمانی کرد بە گەڕانەوە، ئەوا دەگەڕێینەوە!

بەڕێوبەری ئاسایش بەتوندی هەڵچوو:

- ئێوە شێتن! مەبەستان چیە؟ ئایا ناتوانن هیچ فەرمانێکی پێ ڕابگەیەنن؟

- بەڵێ، ناتوانین..!

بەڕێوەبەری ئاسایش لە داخاندا هاوار دەکات:

- ئەگەر ئێوە پابەندی فەرمانی مامۆستاکەتانن، منیش وەك ئێوە، پابەندی فەرمانی لێپرسراوانی سەرو خۆمم! من تەنها دوو کاتژمێر مۆڵەتتان پێ دەدەم بۆ چوونە دەرەوەتان لە شارەکە!

زۆری پێنەچوو هەواڵی هەڵوێستی بەرپرسان سەبارەت بە دەرکردنی بەدیعوززەمان نوورسی لە ئورفە بە هەموو لایەکی شاردا دەنگی دایەوە. خەڵکەکەش بەگشتی خرۆشان و، هەزاران کەس لەدەوری ئۆتێلەکە کۆبوونەوە، تا دەهات بارودۆخەکە ڕووی لە ئاڵۆزی دەنا. دەسەڵاتی خۆجێیی شارەکە، تووشی شڵەژان هات..! هەواڵەکە گەیشتە سەرۆکی لقی پارتی دیموکرات لە ئورفە، ئەویش بە پەلە هات بۆ لای بەڕێوەبەری ئاسایش و بە سەرزەنشتەوە پێی وت:

- ئەگەر ئێوە بەدیعوززەمان لێرە دەربکەن، ئەوا من خۆم فڕێ دەدەمە

بەردەم ئوتومبێلەکەی!.. ئێوە هەرگیز ناتوانن دەستی بۆ بەرن، تەنانەت بۆ تاڵە موویەکیشی! مافی ئەوەتان نییە یەك هەنگاو لە ژوورەکەی خۆی بیگوازنەوە.. ئەو میوانی ئێمەیە..!

- گەورەم، فەرمانەکە لەسەرەوە دەرچووە، لە خودی وەزارەتەوە هاتووە، بۆیە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووە.

- چۆن بگەڕێتەوە؟ ئایا ئێوە نابینن لە سەختترین حاڵەتی نەخۆشیدایە؟

پاشان ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی شارەکە و، هەروەها کۆمەڵە و ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکان دەستپێشخەرییان کرد و لێشاوێك بروسکەیان بەسەر ئەنقەرەدا باراند و، نارەزایی خۆیان لە بەرامبەر کارە خراپەکانی دەسەڵاتدا دەربڕی، کە هەموو جۆرە بەها مرۆییەکانی پێشێل دەکرد.

هەرچەندە پزیشکی دەوڵەت -لەدوای ئەنجامدانی پشکنین بۆ مامۆستا- ڕاپۆرتێکی پزیشکی نووسی و تیایدا هاتبوو کە مامۆستا پێویستی بە حەوانەوە هەیە و سەفەرکردنی بۆ هەر شوێنێك مەترسیدارە. کەچی بەڕێوەبەری ئاسایش لە سەر هەڵوێستی خۆی سووربوو. بڕیاری دا بۆ خۆی بێت بۆ ئۆتێلەکە و چاوی بە مامۆستا بکەوێت. مامۆستا ڕێگەی هاتنە ژوورەوەیدا بە بەڕێوەبەری ئاسایش. ئەویش پێی ڕاگەیاند کە فەرمانەکە بڕاوەتەوە و، دەبێ شارەکە بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ ئیسپارتە! بەدیعوززەمانیش وەڵامی دایەوە و وتی:

- "من ئێستا لە کۆتا خولەکەکانی ژیانمدام..! ناتوانم بگەڕێمەوە.. من لێرە دەمرم..! ئەرکی سەرشانی تۆش ئێستا ئەوەیە کفنەکەم بهێنیت و ئاو ئامادەبکەی بۆ شۆردنم..!"

بێدەنگییەکی ترسناك باڵی کێشا بەسەر ژوورەکەدا..! ئیتر بەڕێوەبەری ئاسایش قسەی نەما و نەیتوانی وەڵامبداتەوە، ئەدی ئیتر بە کام زمان بدوێ لەکاتێکدا بەچاوی خۆی پیرێکی بەساڵاچوو دەبینێ کە چاوەڕێی مەرگە و لەبارەی بەزەیی و شەفەقەتەوە وانەیەکی پاراوی فێردەکات! پیاوەکە هەستی بە شەرمەزاریی کرد و، لە دەریاچەی سارد و سڕی دەروونی خۆیدا نوقم بوو..!

ماسییە بچووکەکان لەبەر تەوژمی ئاوە ساردەکە بە پەلە هەڵدەهاتن و لە قووڵاییەکاندا بە دوای هێلانەی مەرجانەکان، یان بە دوای ئەشکەوتە ئارامەکاندا دەگەڕان، بەڵکو لە گەردەلوولە هێرشبەرەکەی سەهۆڵی سەرئاوەکە ڕزگاریان ببێت.. کەچی بینییان بەفرەکە پێش ئەوان کەوتووە و بنی دەریاکەی بەستووە، لەپڕ لەگەڵ مەرگی سارد و سڕدا بەریەکدەکەوتن و بەخنکاوی دەکەوتنە سەر ئاوەکە..! ئیدی ئەمە چ ستەم و ناحەقییەکە زۆرداری یەك چاو لەم زەمانەدا ئەنجامیدەدات!؟

بەڕێوەبەری ئاسایش لەگەڵ پۆلیسەکانیدا، سەریانداخست و لە ژوورەکە چوونە دەرەوە..!

پاشان پۆل پۆل خەڵکەکە داباریین بەسەر ئوتێلەکەدا و هەموویان دەیانویست بەرەکەتی دوعاکانی مامۆستایان دەستبکەوێت، ئەگەرچی ئەو پێشتر لەکاتی نەخۆشییەکەیدا ئەم جۆرە سەردانانەی ڕەتدەکردەوە، کەچی ئەوەتا ئێستا دەستنانێت بە ڕووی هیچ کەسێکەوە، بەڵکو پێشوازی لە سەدان کەس کرد و، یەك بە یەك دوعای خێری بۆ دەکردن..! ئەمە ڕۆحی ئەوە هەناسە لە دوای هەناسە هەڵدەوەرێ، دەبا هەتا کۆتا لێدانی دڵی لە خزمەتی خەڵکیدا بێت! ئەو لە دنیادا چی ماوە، هەتا تەندروستی خۆی بۆ پاشەکەوت بکات؟

## گۆڕی بزر..!

ئێـوارە پلـەی گـەرمـای لەشـی زیاتـر و زیاتـر بەرزبـووەوە، توانـای قسـەکردنی نەمـا، تەنیـا لێوەکانـی دەجوولانـد وەك ئـەوەی دوعـا بـکات.. کاتژمێـر دوو نیـوی شـەو یەکێـك لـە قوتابییەکانی لێـی نزیـك بـووەوە تـا بزانـێ پلـەی گـەرمـای لـەشـی چـی لـێ هاتـووە، بینـی کەمێك "تا"کـەی دابەزیـوە، پاشـان بـە لێفەکـەی داپـۆشـی، دوای ئـەوە زۆڕپـای ژوورەکـەی داگیرسـاند، وای دەزانـی ئـەوە نیشـانەی باشـبوونی تەندروستییەتی..! کاتژمێر دەی شـەوی کۆتایـی ڕەمـەزان، بـە بەرەکـەت و پیـرۆزی شـەوی قـەدری جـوان، تەختـی خەوتنەکەیـان مونـەووەر کردبـوو، فریشـتـەکانیش ئاهەنگێکـی مەزنیـان دەگێـڕا..!

پاشـان شـەبەقیدا بـەڵام مامۆسـتا هەڵنەسـتا بـۆ نوێـژ..! یەکێکیـان لێفەکـەی لەسـەر دەموچـاوی لادا، تاکـو حەقیقەتەکە بزانێت، بینـی بەڕاسـتی مامۆسـتای ئازیـزی چـاوی لێکنـاوە و گەڕاوەتـەوە بـۆ لای پـەروەردگاری!

ئـەو ڕۆژە چوارشـەممە بـوو، بیسـت و پێنجی مانگی ڕەمەزانـی ساڵی١٣٧٩ی کۆچـی، هـاوکات لەگـەڵ ٢٣ی مارسـی سـاڵی ١٩٦٠ی زایینیـدا، هەواڵەکـە دەگاتـە بەڕێوەبـەری ئۆتێلەکـە و، ئەویـش بـە پەلـە دەچێتـە سـەرەوە بـۆ ژوورەکـەی مامۆسـتا، کتوپـڕ لـە دەرگای ئوتێلەکـەدا دەگات بـە بەڕێوەبـەری ئاسـایش و، بـە شڵەژانەوە بەڕێوەبـەری ئاسـایش پرسـیاری لێدەکات و دەڵـێ:

- دەنگوباس چیە؟

- کۆچی دوایی کرد!

- چی، چی؟ ئایا بەڕاستی کۆچی دوایی کرد؟

- بەڵێ!

جموجوولێکی هەواڵگری و هەواڵنێری لە هەموو شوێنێك دەستیپێکرد.. پزیشکی دەوڵەت هات و پشکنینی بۆ مامۆستا ئەنجامدا، جەختی لەسەر مردنی مامۆستا کردەوە و لەو بارەوە ڕاپۆرتێکی نووسی. پاشان دادوەری میرات هات، بۆئەوەی ئەوشتانەی بەدیعوززەمان لەدوای خۆی بەجێیهێشوون سەرژمێریان بکات، لەدوای گەڕان و لێکۆڵینەوە تۆمارێکی فەرمی کردەوە و تیایدا نووسی:

"کاتژمێرێك و، بەرماڵێك و، مێزەرێك و، جبەیەك..!" ئەو شتانەی دایەدەست عەبدولمەجیدی برای مامۆستا و پاشان ڕۆیشت.

هەواڵەکە خێرا بە ناو هەموو شاری "ئورفە"دا بڵاوبووەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو هەزاران کەس لە دانیشتوانی شارەکە لەدەوری ئوتێلەکە کۆبوونەوە، دوای ئەوە هەواڵەکە بە هەموو شارەکانی تری تورکیادا بڵاوەی کرد، خەڵکیش پۆل پۆل ڕوویان دەکردە ئورفە..

ڕێوڕەسمی بەڕێکردنی جەنازەکە، زۆر بەهەیبەت و شکۆداربوو..! تەرمەکەی بەدیعوززەمان لەسەرشانی سەدان لە قوتابی و خۆشەویستانی ئارامی گرتبوو، دەیان هەزار کەسیش بۆ ئەسپەردەکردنی یاوەرییان دەکرد، لەو کاتەدا کە نمە نمە باران لە ئاسمانەوە دەباری، قوتابیانی نوور مامۆستا مەزنەکەیان لە گۆڕستانی "ئولوجامع" بەخاك سپارد.

"بایرام یوکسل" یەکێکە لەو سێ قوتابییەی لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا لە ئیسپارتەوە هاتن بۆ ئورفە، ئەو شارەی کە ڕۆحی مامۆستا نوورسی لێیەوە بەرزبووەوە بۆ ئاسمان، بەسەر گۆڕی مامۆستاکەیەوە دەستەکانی هەڵبڕی، پاشان سەیری ئەو خۆڵەی کرد کە پێیانەوە نووسابوو نەی دەتوانی خۆڵەکە بتەکێنێ.. جگە لەم خاکە چی بۆ ماوەتەوە لە مامۆستاکەیەوە؟ چاوەکانی هەڵبڕی و سەیری دەوروبەری خۆی کرد، پاشان ڕوانی بۆ ئاسۆی دوور.. جیهان لەبەرچاویدا وەکو شوشە دەشکا، چەند هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، خەریك بوو جەرگی بێتە سەرەوە بۆ ناو سنگی! پاشان هەناسەکانی گەڕانەوە بۆ ناو قوڵایی گۆزەکەی و، هاتەگۆ: ئایا بەڕاستی بەدیعوززەمانمان ئەسپەردەی خاك کرا؟ ئیتر لە دوای ئەو کێ ببێت بە مۆم و چرا، خانووە بچووکەکان ئاوەدان بکاتەوە و، ببێتە هاودەمیان و تەنیاییان نەهێڵێ؟ کێ ببێت بە زیکر و ویرد و، شەیتانی ناو بەندینخانە تاریکەکان ڕاوەدوو بنێت؟ کێ ببێت بە ئاواز و تەپۆڵکە و بەرزایی مەنفا دوورەکان بڕازێنێتەوە؟ ئاخر ئێمە لە دوای تۆ چۆن بژین. جودایی و لێکدابڕانی تۆ چەندە جەرگبڕ و سووتێنەرە ئەی مامۆستای ئازیز..!

کتوپڕ "زوبێر"ی برای کەوتە بەرچاوی، بۆ چەند سات‌ێك بێدەنگی بووە زمانی تێکگەیشتن لەنێوانیاندا، لەپڕ ڕوخساری زوبێر -بەو جۆرەی لەو ساتەدا بایرام ئەیبینی- بووە بەهارێکی سەوز و گوڵەکان دەمیان کردەوە و هەموو شوێنێك پڕبوو لە دار و درەخت.. باڵندەکانیش یەك لە دوای یەك بەسەر لق و چڵی بێستانەکانەوە نیشتنەوە..! چۆلەکەیەکی بچکۆلە لەسەر چڵێکی نزیك لە ڕوخساری"بایرام" نیشتەوە، هەر کە تینی هەناسەی لاوەکە بەر پەڕەکانی کەوت، وەك کەسێك کە جەزبەی لێ بێت بەسەر چڵە بچووکەکەیەوە ڕاچڵەکی

و خۆی ڕاوەشاند و، گەرووی پڕبوو لە هەوای سەوز، پاشان دەستیکرد بە خوێندن و پارچە پەخشانی هیوای لە وتەکانی بەدیعوززەمان نوورسی دەوتەوە:

"بێگومان پەیامەکانی نوور ڕاستییەکانی قورئان بە هەموو لایەکی جیهاندا بڵاودەکەنەوە..

خۆری پەیامەکان لە هەموو شوێنێکدا هەڵدێت..

پەیامەکانی نوور ئەو کوفر و زەندەقەیە پووچەڵ دەکەنەوە کە لەم ڕۆژگارەدا سەری هەڵداوە...

دەبنە چرای سەررێگای ئەو کەسانەی، کە ڕێگای خوا دەگرنە بەر!.."

"بایرام" لە خەوەکەی بەئاگاهاتەوە و، گوێی لێ بوو "زوبێر" بەسۆز و میهرەبانییەوە قسەی لەگەڵدا دەکات:

برای خۆشەویستم.. خزمەتکردنی پەیامەکانی نوور، چاوەڕێمان دەکات ئیتر کاتی چاوەڕێکردن نیە!.. ئیتر لەو کاتەدا "بایرام" خۆڵەکەی لە دەستەکانی تەکاند و، خۆی هەڵدا و بەگەرمییەوە، دەستی کردە ملی هاوڕێکەی و..! بەناو قەرەباڵغی خەڵکەکەدا، ڕێگەیان شەقکردوو دەرچوون..

* * *

ئوتومبێلی سێ قوتابییەکە بەرەو خۆرئاوای ئەنادۆل ڕێگەی گرتەبەر و بە شوێنی خۆیدا گەڕایەوە! بەڵام ئەم جارەیان بەبێ بەدیعوززەمان! ئاهو ناڵە و هەناسەی سارد لەسەر ئازاری جودایی و لێکدابڕان..! کەس نەیدەتوانی پەردەی ئەو بێدەنگیە بدڕێنێ کە بەسەر هەمووانیدا درابوو، دیمەنی جەنازەکە هێشتا لەناو هەست و نەستیاندا دانیشتبوو، ناوبەناو فرمێسکیان هەڵدەڕشت..

هەرکات ئەو قەرەباڵغیە زۆرە و ئەو دەیان هەزار کەسەی کە لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپادنەکەدا بەشدارییان کردبوو، لەسەر ئاوێنەی بیر و هۆشیان دەردەکەوت، پرسیارێکی قووڵ لە دڵی هەمووانـدا سەری هەڵدەدا: چۆن وەسیەتنامەکەی مامۆستا لەبارەی ئاشکرانەکردنی شوێنی گۆڕەکەی جێبەجێبکەین؟ چۆن وای لێ بکەین کەس پێی نەزانێ، خۆ ئەوەتا ئێستا هەزاران کەس دەزانن لەکوێیە! سەرسام مابوون، هەموویان دەستیان گرتبوو بەسەر هەستە خەمبارەکانیاندا، بەڵام کەسیان نەیاندەوێرا سەرسامی و واق وڕمانی خۆیان بۆ ئەوانیتریان ئاشرا بکەن، ئوتومبێلەکەش بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن و لەگەڵ ڕەشەبای خەم و پەژارەدا زۆرانی دەگرت..!

.............

پاشان قوتابیانی نوور چوونە ناو تاقیکردنەوەیەکی گەورەوە! چونکە لە ٢٧ی مایۆی ١٩٦٠ی زایینیدا، واتە دوو مانگ لە دوای کۆچی دوایی بەدیعوززەمان، کودەتایەکی سەربازی لە تورکیا ڕوویدا! پارتی دیموکرات لەسەر کار لادرا و، ئەندامانی حکومەتەکەش بەرەو "دادگای دەستووری" ڕاپێچکران! بە جێبەجێکردنی بڕیاری لەسێدارەدان بەسەر سەرۆك وەزیران، "عدنان مەندەریس"و دووان لە وەزیرەکانی، مەرگەساتەکە کۆتاییپێهات. هەرچی وەزیر و کاربەدەستانی تری کابینەکەیە هەریەکە و بە چەند ماوەیەکی جیاجیا حوکمیان بەسەردا درا، ئەمەش بۆ خۆی ئەڵقەیەکی تر بوو لە زنجیرەی دژایەتی کودەتاچییەکان بەرامبەر ئاین و ئایندارارن!

شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی، جارێکیتر دەربەڕین و بە سمە چەپەڵەکانیان هەموو واتاکانی جوانییان پێشێل کرد..! گورگە بۆرەکە زیاتر هاربوو، کەوتە

شار و لادێکان و ژن و منداڵانی دەترساند، لێرە و لەوێ کەڵبەکانی جیڕدەکردەوە و لە ڕێگادا بە هەر شتێك دەگەیشت کەڵبەکانی تێ دەچەقاند، ڕایدەگەیاند کە جگە لە دەستە و تاقمەکەی خۆی هیچ کەس، بێوەی نابێت!

"عەدنان مەندەریس" ئەو سەرۆکە مەدەنیەی کە لە سەرەتای پەنجاکان لە تورکیا لەڕێی هەڵبژاردنەوە هاتبووە سەر دەسەڵات و، بۆ ماوەی دە ساڵ وڵاتی بنیات نایەوە، وا ئێستا جەستەی بە پەتی سێدارەوە شۆڕبووەتەوە! بەڵام هێشتا هەنگاوە مەزنەکانی بە جێبەجێکردنی بڕیاری گێڕانەوەی بانگی شەرعی و، مۆڵەتدان بە بولبولەکان بۆئەوەی جارێکیتر بگەڕێنەوە بۆ منارەکانیان، بەردێك بوو لە گەرووی قەلەڕەشەکاندا گیرابوو و پێیان قووت نەدەدرا، چونکە لەدوای ئەو چاکسازیانەی پێی هەستا، نە لوورەی گورگەکان، نە قیرە قیرِی قەلەڕەشەکان هیچیان نەمان، تەنها خوێندنی دەنگ و ئاوازە خۆشەکان دەهاتنە بەرگوێ! ڕەحمەتی لەپێناو دەستەبەرکردنی کەشوهەوای ئازادی سەری خۆی دانا!

جۆگەلەی خوێن جارێکیتر، لە شەقامەکاندا سەری هەڵکرد و هەموو شتێکی ڕادەماڵی! ئاگری بەردایە باخچەی ئاشتی ناو دڵان! تارماییەکانی تاریکی کەوتنە گەڕان بە شوێن بەدیعوززەماندا هەتا جارێکی تر بیکوژن، یان نەفی بکەن.. پاشان گورگە داخ لەدڵ و کینەبازەکە بیریکەوتەوە کە بەدیعوززەمان مردووە، بۆیە بڕیاریدا لە گۆڕەکەشیدا بەرۆکی بەرنەدات و نەهێڵێت بحەوێتەوە، فەرمانیدا گۆڕەکەی هەڵبدەنەوە و تەرمەکەی لە خۆرهەڵاتی وڵاتەوە بگوازنەوە بۆ شوێنێکی نادیار لە ناوەڕاستی ئەنادۆڵ.!

عەبدولمەجیدی برای مامۆستا بەدیعوززەمان، لە ئێوارەیەکی خەمناکدا،

هاودەم لەگەڵ ڕێژنەی فرمێسکە بێ دەنگەکانیدا دەستیکرد بە گێڕانەوەی یادەوەریە پڕ ناسۆرەکانی:

پاش تێپەڕبوونی پێنج مانگ بەسەر کۆچی دوایی براکەمدا، ئەوەبوو لە لایەن دیوانی پارێزگا لە شاری قۆنیا بانگکرام. وەختێ گەیشتم دەبینم پارێزگار سێ ئەفسەری پلەبەرزی سوپای لەگەڵدایە. هەر ئەوەندەی دانیشتم یەکسەر یەکێك لە ئەفسەرەکان کەوتە قسە:

- بەلاتانەوە شتێکی شاراوە نیە کە وڵات بە چ بارودۆخێکی دژواردا تێدەپەڕێ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە هەموو پارێزگاکانەوە زیارەتکاران بۆ سەردانی گۆڕی براکەتان زۆرتر دەبێ، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی مەترسی بۆ سەر ئاسایشی گشتی، لەبەر ئەوە بڕیارێك دەرچووە دەبێ -هەڵبەتە بە هاوکاری ئێوە- تەرمی براکەتان بگوازرێتەوە بۆ ناوەڕاستی ئەنادۆڵ، تکاتان لێ دەکەین ئەم دواکارییە واژوو بکەن!..

دەستی درێژکرد و نووسراوێکی خستە بەردەستم، داواکارییەکی بە ناوی منەوە لەسەر بوو..! وشە بە وشە هەموویم خوێندەوە، ترسێکی زۆرم لا دروستبوو، بۆیە وتم:

بەڵام من داواکارییەکی لەو جۆرەم پێشکەش نەکردووە.. تکاتان لێ دەکەم! وازی لێ بهێنن، هیچ نەبێت با لە گۆڕەکەیدا بحەسێتەوە..!

لەتاو سامناکیی بارودۆخەکەش گەرووم وشك ببوو و دەنگم دەلەرزی، بەڵام ئەفسەرەکە پێمدا هەڵشاخا و وتی:

- بیبڕەوە..! ئەمە بڕیاری دەوڵەتە! بواری کات بەفیڕۆدان نییە..!

وام هەست دەکرد لەناو بڵێسەی گڕکانێکدا نوقم دەبم! هەستێکی بێوێنە لە ناخمدا هاواری کرد: اللّــه اللّــه، بەڕێزانم ڕزگارم بکەن! مـن دەسووتێم.. دەسووتێم! دەسو..!

سواری فڕۆکەیەکی سەربازییان کردین و بەرەو "ئورفە"..کەوتینە ڕێ.

کاتژمێرەکە ئاماژەی بۆ سێی دوای نیوەشەو دەکرد، ئورفە لە کووچە و کۆڵانەکانیدا ڕای کردبوو..! جگە لە سەرباز و چەند کەسێك هیچ کەس لە شەقامەکاندا گوزەری نەدەکرد..! هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو لەپێش ئێوارەوە هاتوچۆ قەدەغە کرابوو!

ڕۆیشتین بۆ گۆڕستانەکە، لە هەیوانی مزگەوتی گۆڕستانەکەدا دوو تابوت کە سێ سەرباز بەدەوریەوە بوون، بەرچاودەکەوت. پیاوێك لێم نزیك بووەوە، زانیم پزیشکی سەربازییە، بەسۆز و بەزەیییەوە دەستی خستە سەرشانم و وتی:

- بەڕێز، نیگەران مەبە، مامۆستا دەگوازینەوە بۆ ناوەڕاستی ئەنادۆڵ...

نازانم چۆن قسەکانی ئەو پزیشکە هێنامیانە جۆش، خۆم پێنەگیراو دامە پرمەی گریان..! بێ دەنگییەکی خەمناك باڵی کێشا بەسەر شوێنەکەدا.. پزیشکەکە هەستی بە شڵۆقی هەڵوێستەکە کرد، بۆیە فەرمانی بە سەربازەکان کرد گۆڕەکە تێکبدەن، بەڵام سەربازەکان دوودڵ بوون، وەکو بڵێی هەست بکەن بەوەی تاوانێك ئەنجام دەدەن..! ئەمجارە پزیشکەکە کە شڵەژان لە ڕوخساری دەخوێندرایەوە، وتی: ئەوە چیتان لێ قەوماوە..؟ هاوار بۆ ئێوە، ئێمە فەرمانمان پێ کراوە! جگە لەجێبەجێکردن، هیچ ڕێگایەکی ترمان لەبەردەمدا نیە! ئیدی هێدی هێدی دەستیان دایە ڕووخاندنی گۆڕەکە، هەتا تەرمەکەیان دەرهێنا،

ئەوجا فەرمانی پێ کردن کە بیکەنەوە! منیش لە دڵی خۆمدا وتم: دەبێ ئێستا ئیسکەکانی براکەم بووبنەوە بە خۆڵ..! بەڵام بەرپێزانم، هەر کە دەستمدا لە کفەنەکەی وامزانی هەر دوێنێ مردووە، کفەنەکەی هیچی لێ نەهاتبوو، جگە لەوەی لە لای سەریەوە کەمێك زەرد ببوو، پەڵەیەکی بچووك لەسەر شێوەی دڵۆپە ئاوێکی پێوەبوو.. پاشان پزیشکەکە کفەنەکەی لەسەر دەموچاوی لادا، سەیرم کرد هەروەکو خۆی وابوو، شێوەی زەردەخەنەیەك بەسەر لێوەکانیەوە دیاربوو..!

اللّه أكبر..! پێنج مانگی بەسەردا چووە،کەچی لاشەی بەدیعوززەمان هەروەکو خۆی وایە! گەش و جوانە وەك بڵێی دوێنێ مردبێ، یان چاکتر وایە بڵێین: دەڵێی نەمردووە! سەیرە! ئایا لەڕاستیدا مردووە؟.. نازانم..!

لەسەرخۆ تەرمەکەمان بەرزکردەوە چونکە ترسی ئەوەمان هەبوو لەپڕ بکەوێتە قسە یان بەڕوومانیدا هاوار بکات! و خستمانە ناو تابوتێکی ترەوە، پاشان ئوتومبێلەکە بردینی بۆ فڕۆکەخانە. لەپاڵ تابوتەکەدا دانیشتبووم و خەم و ماتەمیش لەولاوە خەریك بوو دڵمی دەپچڕی. بەدرێژایی گەشتە نادیارەکەشمان چاوەکانم هەر فرمێسکیان لێ دەباری.. ئەوەش بۆ خۆی تاکە دڵدەرەوە و مایەی سەبووریم بوو، بە تایبەت لە سەردەمێکدا کە قسە قسەی ئاگر و ئاسن بوو..! فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی ئافیۆن نیشتەوە، لەوێشەوە تابوتەکە گوازرایەوە بۆ مەنفاکەی لە ئیسپارتە و لە جێیەکی نادیاردا ئەسپەردەی خاك کرا..! پاشان..

زۆری نەبرد عەبدولمەجیدی برای مامۆستا نوورسیش ماڵئاوایی لە دونیا کرد! لەولاشەوە حیکمەتی قەدەر یەخەی ئەو کەسانەی بەر نەدەدا

کە لەو شەوە سامناکەدا تابوتەکەیان رفاندبوو! ئەوەبوو بابای پزیشك و هەر سێ سەربازەکەش مردن! بەم شێوەیەش ئارامگەی نوورسی بووە ڕازێکی هەتا هەتایی و، مەتەڵێکی هەمیشەیی و نهێنییەکی پەنهان..! بە پشتیوانی پەروەردگاریش وەسیەتەکەی بەدیعوززەمان بۆ قوتابییەکانی هاتەجێ! دڵە وابەستەکانی میعراجە رۆحییەکەشی لەوێ.. لە ئورفە، بوون بە ڕێڕەوێکی نوورانی بەرەو ئاسمان! پاشان قوتابخانەکان جارێکیتر دەستیان کردەوە بە خوێندن و پەیامەکانی نوور بەناو ئوممەتدا بڵاودەکەنەوە، پەیامەکان چەند وتەیەکن لەگۆڕ نانرێن، خاکیش نایانفەوتێنی و لەناویان نابات.

# مەقامی کۆتایی

قوتابییانی نوور، لەو کات و شوێنەدا کە دیارییان کردبوو، سەرلەنوێ گەیشتنەوە یەك، ڕوخساریان بزە و شادی لێ دەتکا، چاوەکانیان تیشکی ئومێدیان لێ دەبریسکایەوە.. هەر کە کۆڕی کۆترەکان تەواو بوو، هەموو گەرووەکان بە یەك جار هاتنە لەرینەوە و، بە دەنگ و ئاوازێکی شکۆدار، منارە و گومەزەکانیان ڕاوەشاند:

"ئەی سەعید..! ئەی سەعید..! "صەعید" بە، واتە خاك بە، وەکو خاك خۆنەویست بە، هەتا ڕوونی پەیامەکانی نوور لێڵ نەکەیت..!"

لە ئاسۆی بەرزەوە چەخماخەیەکی گەورە لێیدا، نێوان گوندی "کورچك" لە "ئەرزڕۆم" و شاری "ئەدیرنە"ی لە باکوری خۆرئاوای وڵات ڕووناککردەوە، پاشان لە "ئیزمیر" لە باشوری خۆرئاوای ئەنادۆڵەوە هەتا شاری ئەستەمبووڵ لە باکوور درێژبووەوە..! و لە چاوتروکانێك کەمتردا، بووە پەلکە زێڕینەیەك و ئاسمانی هەموو جیهانی لەئامێزگرت، بەهەر حەوت ڕەنگەکەی چاوی منداڵانی داپۆشی! هەورە سەوزەکانم بینی، بە هەنجیر و زەیتون بارکرابوون..! پاشان گوێم لە حیلەی ئەسپی ڕزگارکاران بوو، لەگەڵ ڕەشەبادا پێشبڕکێیان دەکرد.. هەتا هێزم تیابوو بانگم کرد:

- ئەی "نعم الأمير أميرها..!" بەجێم مەهێڵە و بمبە لەگەڵ خۆت.!

بارانیش بەخوڕ داباری..!

............

## کۆتایی

فريد الأنصاري/ ئەستەمبووڵ

١٨ی ڕەجەب ١٤٢٧ی کۆچی - ١٢/ ٨/ ٢٠٠٦ زایینی.

# ناوەڕۆك



## بەشی یەكەم

## تارماییكان هێرش دەكەنە سەر شار...!



## بەشی دووەم

## ڕەنج و مەینەتییەكانی "سەعیدی كۆن"

## بەشی سێیەم

## ئەستەمبووڵ لەنێوان پیاوچاکان و خراپەکاراندا!



## بەشی چوارەم

## درەوشانەوەکانی مەرگ..!

## بەشی پێنجەم

## ڕەنج و مەینەتییەکانی "سەعیدی نوێ"...!

## بەشی شەشەم

## مەنفای"بارلا" شوێنی لەدایکبوونی نوور جوانی...!

## بەشی حەوتەم

## درەوشانەوەکانی خەمێکی جوان

# دواین شاسوار

دڵم پێی دەوتم ئەو هێشتا لەوێیە... هەرچەندە پێیان وتم ئەو لەساڵی ١٩٦٠ی زایینییەوە کۆچی دوایی کردووە.. چۆن؟ چۆن دەبێ کۆچی دوایی کردبێ -ئەی بەڕێزان- من خەریکە بۆنی ئەو دەکەم ئەگەر بەدرۆم نەخەنەوە..! بەڵێ، هەموو کتێبەکان یەکڕان لەسەر مێژووی کۆچکردنەکەی. بڕوام پێ بکەن، ڕاستتان پێ دەڵێم: لەگەڵ هیچ کەسێکدا ئەوەندە ڕاستم نەوتووە..! لەبەر ئەوە بڕیارمدا چاوم پێی بکەوێت؟ بۆیە نییەتی ڕۆیشتنم هێنا، جانتا بچکۆلەکەم هەڵگرت و، بەرەو شای شاران و کۆتا پایتەختی ئیسلام (ئەستەمبووڵ)! کەوتمە ڕێ. بەڵام پێیان وتم: دەبێ ڕابەر و چاوساغێکت لەگەڵدا بێت، ڕابەری ئەستەمبووڵ وەک هیچ ڕابەرێکی تر نیە! دەبێ هیممەت بەرز و بیرتیژ و بەرچاو ڕوون بێت.

9 649750 000598

IRFAN PUBLISHING

نرخی ٤٥٠٠ دینارە